

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی (٢٥)

# كۆنگرەی بەرگریی لە قورئان

## توێژینەوەکان ـــ بەرگی دووەم

❖ د. تەها جابر عەلوانی
❖ د. موحەممەد شاکر چارپوتی
❖ د. ئیسماعیل بەرزنجی
❖ د. دیاری ئەحمەد ئیسماعیل
❖ فازڵ قەرەداغی

كۆنگرەی بەرگریی لە قورئان ـــ توێژینەوەکان ـــ بەرگی دووەم

خوێنەری بەڕێز؛ ئەم کتێبەی بەردەستت، بەرگی دووەمی ئەو زنجیرە سێ بەرگییەیە، کە سەرجەمی توێژینەوەکانی (کۆنگرەی بەرگریی لە قورئانی پیرۆز) لەخۆ دەگرن، کە سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری، بە هاوکاریی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی، وەکو یەکەمین کۆنگرەی زانستیی خۆی، لە ڕۆژانی 22-2011/12/23ی زایینی، لە شاری سلێمانی سازی کرد.

وەکو توێژینەوەکانی بەشدار لە هەر کۆنگرەیەکی تر، بڕیار بوو سەرجەم توێژینەوەکانی ئەم کۆنگرەیەش لە دووتوێی یەك بەرگ و لە ماوەیەکی دیاریکراودا چاپ و بڵاوبکرێنەوە، بەڵام لە لایەك بە هۆی زۆریی توێژینەوەکان، لە لایەکی تریش بەهۆی بەکوردیکردنی ژمارەیەکیان، کە بە زمانی عەرەبی پێشکەشکرابوون، ناچار هەم وادەی بەچاپگەیاندنیان دواکەوت، هەمیش نەتوانرا سەرجەمیان لە دووتوێی یەك بەرگدا چاپ و بڵاوبکرێنەوە.

پشت بە خوای گەورە لە ماوەیەکی نزیکدا بەرگی سێیەم و کۆتایی ئەم زنجیرەیەش بەچاپ دەگات. خوای گەورەش ئەم زنجیرە کتێبە بکاتە مایەی ڕەزامەندیی خۆی.




كۆنگرەی بەرگریی لە قورئان
توێژینەوەکان ـــ بەرگی دووەم

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی (٢٥)

# کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان

## توێژینەوەکان- بەرگی دووەم

ئامادەکردنی:

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

لیژنەی چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپی یەکەم

١٤٣٤ ک      ٢٠١٣ ز





ناوی کتێب: کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان، توێژینەوەکان.

بەرگی: دووەم.

ئامادەکردنی: بەشی چاپ و بڵاوکردنەوە– سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی.. ژمارە (٢٥).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٩١٥)ی ساڵی (٢٠١٣)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٣.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (٥٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# ناوەرۆك

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز" ئەم کتێبەی بەردەستت، بەرگی دووەمی ئەو زنجیرە سێ بەرگییەیە، کە سەرجەمی توێژینەوەکانی (کۆنگرەی بەرگریی لە قورئانی پیرۆز) لەخۆ دەگرن، کە سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری، بە هاوکاریی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی، وەکو یەکەمین کۆنگرەی زانستیی خۆی، لە ڕۆژانی (٢٦-٢٧/موحەڕڕەم/١٤٣٣ی کۆچی) بەرامبەر بە (٢٢-٢٣/١٢/٢٠١١ی زاینی)، لە شاری سلێمانی سازی کرد.

وەکو توێژینەوەکانی بەشدار لە هەر کۆنگرەیەکی تر، بڕیار بوو سەرجەم توێژینەوەکانی ئەم کۆنگرەیەش لە دووتوێی یەك بەرگ و لە ماوەیەکی دیاریکراودا چاپ و بڵاوبکرێنەوە، بەڵام لە لایەك بەهۆی زۆریی توێژینەوەکان، لە لایەکی تریش بەهۆی بەکوردیکردنی ژمارەیەکیان، کە بە زمانی عەرەبی پێشکەشکرابوون، ناچار هەم وادەی بەچاپگەیاندنیان دواکەوت، هەمیش نەتوانرا سەرجەمیان لە دووتوێی یەك بەرگدا چاپ و بڵاوبکرێنەوە.

پشت بە خوای گەورە لە ماوەیەکی نزیکدا بەرگی سێیەم و کۆتایی ئەم زنجیرەیەش بەچاپ دەگات. خوای گەورەش ئەم زنجیرە کتێبە بکاتە مایەی ڕەزامەندیی خۆی.

**هاوژین عومەر**
**ل. لیژنەی چاپ و بڵاوکردنەوە**
**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**
**٢٠١٣/٩/١٤ی زاینیی**



# قورئانی پیرۆز کتێبی گەورەی خوایە

د. تەها جابر ئەلعەلوانی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، نستغفره ونستعينه ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا. من يهدي الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له. ونصلي ونسلم على سيدنا رسول الله وعلى آله وصحبه ومن تبعه واهتدى بهديه الى يوم اللقاء.. ثم أما بعد: السلام عليكم ورحمة الله تعالى وبركاته.

زۆر سووربووم لەسەر ئەوەی کە لە نێوانتاندا بم لە شاری سلێمانی، ئەو شارەی شانازیی پێوە دەکەین، شانازی دەکەین بە مێژووی و خوێنی دانیشتووانەکەیەوە و ڕێز و موسڵمانێتییان و تێکۆشانیان لە ساڵانێکی دوور و درێژ، بەڵام بۆ دروستی - وەك دەوترێ - چەند بڕیارێك هەن: کاتێ کە مامۆستای برام مامۆستا و جێگر (صەباح بەرزنجی) داوەتێکی ئاڕاستە کردم بۆ بەشداری کردنم لەم کۆنگرەتاندا، ئەوپەڕی دڵخۆش بووم، ئاواتەخواز بووم سوێند بە خوا، ئەگەر بمتواناییایە، بفڕم بۆ لاتان و لەگەڵتاندا بم و چاوەکانم بڕێژم بە سورمەی بینینتان و بینینی سلێمانیی شکۆدار.

بەڵام - وەکو شەرعزانەکان دەڵێن - ئاسان بە هۆی قورسەوە لە کۆڵ ناکەوێت. لەبەرئەوەی نەمتوانی سەفەر بکەم بەهۆی چەند هۆکارێکی تەندروستییەوە، بە باشم زانی بێبەش نەبم لە گفتوگۆ لەگەڵ کردنتان و وتنی شتێك لە کۆنگرەکەتاندا، وەك بەشداری کردنم لەگەڵتان لەم چاوپێکەوتنە باش و پیرۆزەدا. شکۆدار دەبم بە بەشداری کردنم لە کۆنگرەکەتاندا کە گرێتان داوە بۆ قسەکردن لەبارەی قورئانەوە، دەربارەی قسەی خوا و نیگای خوا بۆ پێغەمبەرە شکۆدارەکەی ﷺ، بۆ ئەوەی ئاگاداری بدەم سەبارەت بە گرنگی و ترسناکیی ئەم چاوپێکەوتنە و هەر چاوپێکەوتنێکی تر کە لەم بوارەدا گرێ دەدرێ. پێم خۆشە کە بڵێم دوو شتی گرنگ و گەورە هەن دووچاری دەستێوەردان و هەوڵدانێکی زۆر بوونەتەوە بۆ لەکەدارکردنیان، بەڵام خوای گەورە لە سەرەتاوە

بڕیاری پاراستنی هەردووكیانی داوە، كە ئەو دوانەش قورئانی پیرۆز و پێغەمبەری خوایە ﷺ. كە قورئان لەلایەن خوای كاربەجێ و زۆر زاناوە بۆی هاتووە. پەرتووكی خوا هەر لە یەكەم ڕۆژەوە زۆرێك لە هەژموونی دانەدواوە و زاڵبوونی نەزانیی عەرەبی خستووەتە ڕوو كە هیچ پاساوێكی نەبووە، تەنها نەزانییەكی كوێرانە و هەوڵدانی بەربەست دروستكردن نەبێ لەبەردەم هەوڵەكانی ڕزگاركردنی دروستكراوەكانی خودا و دەرهێنانیان لە تاریكییەكان بۆ ڕۆشناییەكان.

لەبەرئەوەی ئەم پەرتووكە تەنها هاتووەتە خوارەوە بۆ دەرهێنانی خەڵك لە تاریكییەكانەوە بۆ ڕووناكی، هەركەسێك لە ڕێگەیدا بوەستێت یان هەوڵی وەستاندنی ڕووناكییەكان بدات، نەهێڵێت بگاتە كەسانی شایستە بەم ڕووناكییە، بەم كارەی خەڵكی لە ڕێگەی خودا دووردەخاتەوە، نكوڵی لە پەیامی پێغەمبەری خودا دەكات و پێ دەخاتە مافی ئەم مرۆڤە لە ڕێنموونیكردنی و ئازادكردنی و سەربەستی و ڕزگاركردنیدا، دادگەری و یەكسانی لەگەڵ كەسانی تردا. ئەوەش لەبەرئەوەی ئەم پەرتووكە بۆیە هاتووەتە خوارەوە تا دەروازەیەك بێت بۆ دەرچوون لە ئاژاوە و ئاڵۆزییەكان، لە عەلیی كوڕی ئەبی تالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە كە فەرمووی لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: لەمەولا ئاڵۆزی و پشێوی ڕوو دەدات. وتم: ئەی ڕێگای ڕزگاربوون كامەیە؟ فەرمووی: پەرتووكی خودا. پاشان فەرمووی: هەواڵی نەتەوەكانی پێش ئێوەی تێدایە. هەروەكو بیەوێت ئەم فەرموودەیە چۆنیەتی دەرچوون لەم ئاڵۆزییانە بەهۆی قورئانەوە بخاتە ڕوو: "فيه نبأ من قبلكم، وخبر من بعدكم، وحكم ما بينكم، هو الفصل ليس بالهزل، من تركه جبار قصمه الله، ومن ابتغى الهدى في غيره أضله الله، وهو حبل الله المتين، والنور المبين، والصراط المستقيم، من قال به صدق، ومن حكم به عدل، ومن هدي به فلن يضل، ومن ضل عنه فلن يهتدى بشيءٍ آخر أبداً".

ئەم پەرتووکە پیرۆزە لە لایەن نەزانانەوە هێرشی زۆری کراوەتە سەر لە رابوردوودا، دەیانوت: (وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً) (الفرقان: ٥). خوای گەورە بە درۆیان دەخاتەوە، دەیسەلمێنێ قورئان بەو شێوەیە نییە کە ئەوان باسی دەکەن. ئەوانیش نکوڵییان لە دەست دەهات بەرامبەر قورئان، بە زمان شتێك بوترێت لە دڵدا بڕوای لەگەڵدا نەبێت، ئەمە شتێکە بۆ خۆی و نکوڵی کردن شتێکی ترە. خوای گەورە دەفەرموێت: (وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ) (الأنعام: ٢٦). کەسانی تر بەرگری دەکەن لە کەسانی تر کە شوێنی بکەون خۆیشیان لە بیستنی و پەیڕەوی کردنی دووردەکەونەوە، وتیان: (لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ) (فصلت: ٢٦) گوێی بۆ مەگرن، لە کاتی خوێندنەوەیدا قاڵە قاڵ بکەن. دەڵێی دەیانەوێت سەر لە هەڵگرانی قورئانی شکۆدار تێك بدەن، بەهۆی قسەی نابەجێ و ژاوەژاوەو و هاوارکردنیانەوە دەیانەوێت پەردە دروست بکەن لە نێوان دەنگی قورئان و گەیشتنی بە گوێی تینووەکان، بۆ رێنموونیی ئەم پەرتووکە کە رزگارکەری مرۆڤە لە تاریکاییەکانەوە بۆ رووناکایی، بەڵکو لەمەش دوورتر هەنگاویان هەڵگرتووە و گوتوویانە: (إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ) (النحل: ١٠٣) ئاماژەیان بە کەسێکی وا کردووە و قورئان بەرپەرچی داونەتەوە (وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَـذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ) (النحل: ١٠٣) ئەم پەرتووکە پیرۆزە لە رابوردوودا تووشی چەندان هێرشی ناڕەوا بووە و لە ئێستەشدا بە هەمان شێوە کەوتووەتە بەر شاڵاو لەلایەن کەسانێکەوە کە بە ناو و شێوە موسڵمانن و لەڕاستیدا دەکەونە ناو بازنەی نەتەوەکانی ترەوە، ئەمانیش وەك نەتەوە پێشووەکان وتیان: ئەمە پەرتووکێکی بە مێژوو کراوە، واتە لکێنراوە بە مێژووەوە، بۆ قۆناغێك هاتووە کە ئەم قۆناغەی ژیانی ئێمە نییە... هاتووە بۆ قۆناغی پێش زانیاری و پێش ئەوەی مرۆڤ بگاتە ئەم ئاستە لە زانستدا و ناگونجێ ببێتە دوانێك بۆ مرۆڤی هاوچەرخ و ناتوانێ یاسایەکی دادگەر بنیات بنێت، یان

ژیانێك پێكبهێنێ بۆ نەتەوەیەكی یەكگرتوو، یان سەربەستی و ئازادی و دادگەری بەدی بهێنێ! دیارە بەم قسەیان درۆیان كردووە و قسەیان هەڵبەستووە.

كەسێك مێژووی عەرەب و نەتەوە نەخوێندەوارەكان بخوێنێتەوە كە قورئانی تێدا هاتووەتە خوارەوە، هەست بەو جیاوازییە زۆرانە دەكات لە نێوان ئەو گەلانەدا پێش هاتنەخوارەوەی قورئان بۆیان لەگەڵ پاش هاتنە خوارەوەی قورئان بۆیان و وەرگرتنی لەلایەن ئەوانەوە.

لێرەدا پێمخۆشە كەمێك هەڵوێستە بكەم لەسەر بیرۆكەی (الأمية) واتە نەخوێندەواری، ئایا (الأمي) كەسێكە كە نازانێ بخوێنێتەوە و بنووسێ؟ یان ئەم وشەیە واتای تری هەیە؟

لەڕاستیدا وشەی (الأمي) وەك قورئان ئاماژەی پێكردووە، بە كەسێك دەڵێن توانای خوێندنەوە و نووسینی نەبێ و واتای تری گرنگی هەیە، ئەو واتایەش دەبرێت بەسەر نەتەوەیەكدا كە پێغەمبەری بۆ رەوانە كرابێت یان پەرتووكی تێدا دابەزیبێت. لەبەر ئەمە لە سورەتی یاسیندا هاتووە: (لِتُنذِرَ قَوْماً مَّا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ) (يس: ٦) كەواتە وشەی (الأمي) دوو واتای هەیە: واتایەك بە مێشكەكاندا و هەموو كەس دەیناسێ، ئەویش ئەوەیە كە كەسێك نەزانێ بخوێنێتەوە و بنووسێ، ئەم واتا ڕواڵەتییە سادەیە دێ بە زەینەكاندا..

بەڵام واتای وردی ئەم وشە قورئانییە، مەبەست پێی ئەوانەیە كە پێش پێغەمبەری خودا موحەممەد ﷺ پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە، كە ئەمەش كورد و عەرەب و فارس و هیند دەگرێتەوە، ئەو نەتەوانەش كە پێغەمبەریان بۆ رەوانە نەكراوە لەگەڵ پەرتووكی ئاسمانیدا.

لەبەرئەوە خەڵك، وەك پێشەوامان شافیعی ئاماژەی پێكردووە لە سەرەتای پەرتووكە ئوصولییەكەیدا، لە كاتی هاتنی گەورەمان پێغەمبەری خوادا ﷺ، دوو گرووپ بوون: گرووپێك خاوەنی پەرتووك بوون، زۆرێك لە كتێبەكانیان تووشی گۆڕین و دەستكاری كردن هاتبوون، لەبەر هەندێ مەبەست كە لە دڵی مالوم و

قەشەکاندا بوون کە لای نەتەوەکانی تر بە پیاوانی ئایینی دەناسران و دەیانویست ئاینەکەیان لای نەتەوەکانی تر وەربگیرێت. ئەمانە یاساغیان حەڵاڵ دەکرد، هەندێ جاریش حەڵاڵیان یاساغ دەکرد.

هەروەها ئەمانە لەمەودوا ناسرابوون بە ئەهلی کیتاب، وەك جوو و دیانەکان. زاناشمان هەیە مەجووسەکان دەخاتە نێو ئەم گرووپەوە...

چەندان نەتەوەی نەخوێندەوار دەبینرێ کە پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە، یان ئەگەر چەند پێغەمبەرێکیان بۆ نێردرابێت، ئەوا لە چەند کاتێکی دوور لە یەکدا بووە، بە جۆرێك لە نێوان ئەو پێغەمبەرانە و نەتەوەکانیاندا دوورکەوتنەوە و نامۆییەك دروست بووە. وەکو ئێستەی نەتەوەی عەرەب، کە لەوەو پێش (صالح) پێغەمبەریان تێدا نێردرابوو، پاشان (شوعەیب) پێغەمبەر، ئەمانە نێردرابوون لە شوێنێکدا کە بە نیمچەدوورگەی عەرەب دەناسرێت، بەڵام ئەوەش لە چەند سەدەیەکی دووردرێژەوە بووە و هیچ ئاسەوارێکی ئاینەکانیان نەماوەتەوە، لەکاتێکدا کە خەڵك بانگکراوە بۆ لای ئەم ئاینانە، باوەڕیان پێ نەهێناوە، چونکە لەبەر زۆریی مەودای نێوان هاتنی پێغەمبەرەکان، هەر وەکو ئەوە وایە نەبووبن. لەبەرئەوە کە بێگومان موحەممەد ﷺ هاتووە بۆ لای گەلێك کە باووباپیرانیان پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە و بێ ئاگان. بارودۆخەکەش هەروایە بە گوێرەی میللەتەکانی تر کە بە گەلانی نەخوێندەوار ناسرابوون، وەك کوردەکان و هیندییەکان و فارسەکان و بەربەرەکان. هەموو ئەم نەتەوە و گەلانە نەخوێندەوار بوون کە لەمەوپێش پێغەمبەریان بۆ هاتووە کە خاوەنی پەرتووکی ئاسمانی بوون، ئەمانەش هەر بە (الأمي) دەزانرێن.

خوای پەروەردگارمان دەفەرموێت: (هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ) (الجمعة: ٢) ئەم پێغەمبەرە لە (ئومییەکان) واتە: کۆتا پێغەمبەرێکە بۆ هەموو ئەم گەلانەی کە وتمان.

پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ ئەگەرچی لە بناغەدا قوڕەیشییە و لە نەتەوەی عەرەبە، بەڵام لە رووی راگەیاندنی پەیامەوە دەدرێتە پاڵ هەموو گەلە ئومییەکان. ئەو لە ریشەدا لە نەتەوەی عەرەبە، بەڵام لە رۆشنبیری و گەیاندنی پەیامدا نەهاتنی پێغەمبەرێك پێش ئەو، بە کورد و بەربەر و فارس و هیند سەیری دەکرێت. کەواتە ئەوە پەرتووکێکە و خوای گەورە ناردویەتییە خوارەوە تا خەڵکی بهێنێتە دەرەوە لە تاریکییەکانەوە بۆ رووناکی، پەرتووکێکە رێنوونی دەکات بۆ لای راستترین شت: پەرتووکێکە هیچ گومان و ئاڵۆزییەکی تێدا نییە، پەرتووکێکە (لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ) (البقرة: ٢) . (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجَا) (الكهف: ١). بەڵکو گێڕاویەتی: (قَيِّماً لِّيُنذِرَ بَأْساً شَدِيداً مِن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً حَسَناً * مَاكِثِينَ فِيهِ أَبَداً) (الكهف: ٢ـ ٣). پەرتوکێکە: (يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ) (الإسراء: ٩).

پەرتووکێکە خەڵکی هەر نموونەیەك بهێنێت ئەو باشترین راڤەی دەکات و نموونەی لەسەر دەهێنێتەوە. پەرتووکێکە خەڵکی هەر بڕیار و یاسایەك بهێنن، راستر و دادگەرانەتر بەرنامە دێنێت لە بەرامبەریەوە کە باشترە و گونجاوترە بۆ ژیانی دونیا و دواڕۆژیان. پەرتووکێکە (لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ) (فصلت: ٤٢ ) نە لە رووی وشە و واتاوە: (تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ) (فصلت: ٤٢)، پەرتووکی رێنموونی و رووناکییە: (قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ * يَهْدِي بِهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ) (المائدة: ١٥ـ ١٦). پەرتووکێك وێنەی ئەم پەرتووکە هەڵگری ئەم هەموو تایبەتمەندی و خاڵە باشانە بێت، بێگومان لەلایەن شەیتان و یارمەتیدەرانیەوە دژایەتی دەکرێت، لەلایەن ئەوانەشەوە کە شەیتان سەرنجی راکێشاون بۆ لای خۆی و کردوونییەتە سەرباز و خستونییەتە ناو ریزەکانی خۆیەوە. پەرتووکێك لەم شێوەیە بێت کە وتمان، بێگومان دژایەتی دەکرێت لە سەرەتای دابەزینیەوە لە ماوەی هاتنیدا، ئەم هێرشانەش بەردەوام دەبن لە دژی بۆ لەکەدارکردنی و دوورخستنەوەی خەڵك لە رێگەی گوێنەگرتن

بۆی، تا ئەمڕۆمان. ئەم شاڵاوانە لە لایەن کەسانێکەوە بوو کە پێش ماوەیەك بە ڕۆژهەڵاتناسان ناسرابوون. پاشان بیری ئەمانە کاری کردە کەسانێك لە ڕۆڵەی موسڵمانان، تا وای لێکردن کە دەربارەی قورئان بڵێن: پەرتووکی قۆناغێکی مێژوویيە، پەیوەندیی بەو کاتە مێژووییەی خۆیەوە هەیە، بۆ قۆناغەکانی تر ناگونجێت. پەرتووکی چیرۆك و پەند ناگونجێت بۆ بونیادنانی نەتەوە، یان ڕێنموونی کردنی کاروانی مرۆڤایەتی، ڕێنموونی کردنی بۆ ڕێگای ڕاست. ئەمە هەندێك بوو لە تایبەتمەندیی ئەو پەرتووکە کە خوای گەورە جەختی لەسەر کردووەتەوە.

بێگومان ڕۆژهەڵاتناسان و بێباوەڕان نەخوێنەواریی زۆربەی موسڵمانان دەکەنە پەنجەرەیەك تا لێیەوە هێرش بکەنە سەر قورئان. دیارە دوورکەوتنەوەی موسڵمانان لە بیرکردنەوە لە قورئان و باش خوێندنەوەی و پەیوەندی بوون لەگەڵیدا و تێگەیشتنی واتاکانی، بووەتە هۆی ڕەخساندنی هەل بۆ ئەوەی دوژمنانی قورئان هێرش بکەنە سەری، کە بە هۆی ئەمەوە توانییان نەتەوەی ئیسلامی لە سەرچاوەکانی ڕۆشنبیری و ڕێنموونییان دووربخەنەوە، تا لە ئەنجامدا ئەم نەتەوەیان گەڕاندەوە ناو بازنەی (نەزانی و نەخوێندەواری) و تووشی بێ ئاگاییان کرد و ئەو بۆشاییە هزری و کەلتووری و ڕۆشنبیرییەی کە دروستیان کردبوو، کردە زەمینەیەکی بەپیت بۆ سەوزبوون و گەشەسەندنی هزری و بیرۆکەکانیان. نەتەوەی کورد بۆشایی ڕۆشنبیریی نەبووە لە بواری پەیوەندی لەگەڵ قورئاندا. بێگومان لە نهێنییەکانی نییە کە بزانین زمانی عەرەبی و یاساکانی و ڕێساکانی زمانی عەرەبی بە هەردوو لقە سەرەکییەکەیەوە (نحو، صرف) و ڕەوانبێژییەکەی، قەرزاری زۆرێك لە زانایانی کوردە، کە هەریەکە لەوانە (٢٠) ساڵ یان (٣٠) ساڵ لە ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ وتنەوەی ئەم زمانە و وردەکارییەکانی، لەبەرئەوەی ویستوویەتی لە واتاکانی قورئان بگات و ئەو واتا قووڵانە بخاتە ڕوو کە خودا لە دووتوێی پەرتووکەکەی خۆیدا دایناون. زانایانی

کورد زۆر سووربوون لەسەر فێربوونی زمانی عەرەبی و بابەت خستنە سەر خەرمانی ئەم زمانە و پارێزگاری کردنی دوو لقە سەرەکییەکەی (نحو وصرف) و بنیاتنانی کۆشکەکانی رەوانبێژییەکەی. هەموو ئەمانە پاڵنەر و هۆکارەکەیان ئەو ئامانجە مەزن و شکۆدارانە بوو کە زۆر لە زانایانمان لە کوردستانی عێراق و ئێران و سوریە و جگە لەمانەیش، هەڵگری بوون، ئەگەر بۆتان ژمارە بکەم. هیوام وایە کە هەر لێکۆڵەرێك لە لێکۆڵەرە دڵسۆزەکانتان، زانایانی کورد کە ناویان لە پەرتووکی چینە جۆربەجۆرەکانی زانایاندا هاتووە، کۆبکەنەوە، تەنها بۆ ئەوەی کەسانی تر بزانن کە چەندە زانایانی کورد دڵسۆزانە ئەرکی پیرۆزی خزمەتی قورئانیان لە ئەستۆ گرتووە و ماندووبوون لە رێگەی بڵاوکردنەوەی زانستە ئامرازییەکان و ئەو زانیارییانەی تریشدا کە پەیوەندییان بە قورئانەوە هەیە؟ کە ئێمە هیچ گومانێکمان لەوەدا نییە کە ئەمانە دەبنە بناغەیەك بۆ پێکەوەبەستنی گەلی کورد و زانایانی کورد بە جەستەی نەتەوەی موسڵمانەوە ـ ئەو جەستە گەورەیە ـ رێگە نادات بە جیاکردنەوەی ئەندامی نایاب و پیرۆزی کوردی لە جەستەی ئەم نەتەوەیە بە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی جیاکردنەوە، نە بە جیاکردنەوەی رۆشنبیری، نە دینی، نە ئاینزایی، نە ڕامیاری، نە کۆمەڵایەتی. لەمەولاش گەلی کورد وەك دوڕڕێك دەمێنێتەوە بە ناوچاوی ئەم نەتەوە موسڵمانەوە، بەهۆی زاناکانیەوە، بە هەوڵدانیانەوە، بە خۆشەویستییانەوە بۆ پەرتووکی خوا، بە تێگەیشتنیانەوە لە ئایەتەکانی خوا، بە هەستکردن و زانینیان بەو پیلانانەی کە دادەڕێژرێن یان داڕێژراون لەمەوپێش، دژی ئەم پەرتووکە پیرۆزە کە رزگارکەری مرۆڤەکانە لە تاریکاییەکان بۆ رووناکی. ئەو پەرتووکە کە ناتوانرێت ژیانێکی ئازادانە و شکۆدارانە بنیات بنرێت بە ئاراستەکردنی ئەم نەبێت و ئەمی تێدا نەکرێتە دەسگیر و چاوساغ. ئەوە ئەو پەرتووکە پیرۆزەیە کە دەروازەی رزگاربوونە لە ئاڵۆزی و بێسەروبەرییەکان و دەرکەری مرۆڤەکانە لە تاریکییەکان و رێنموونیکەری بۆ ناو رووناکییە. ئەمە ئەو کتێبە پیرۆزەیە و

ئەوانەش چەند گۆشە و تابلۆیەکن لەو کێشە و هێرشانەی کە ڕووبەڕووی قورئان کراونەتەوە و دەکرێنەوە. گرنگترین شت کە پێویستە بیزانین، نەتەوەی موسڵمانی ئێمە بە هەموو گەل و گرووپەکانیەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان کەمتەرخەمییان نەکردووە و دوانەکەوتوون و تاکڕەوان نەیانتوانیوە بەکاریان بهێنن و بیانکەنە لانە و بواری تروکاندنی گەرای ویستەکانیان، تا ئەو کاتەی لە قورئان دوورکەوتنەوە و پەیوەندی پچڕا لە نێوان ئەو و نەتەوەی ئیسلامدا و بێ ئاگابوون لە واتاکانی قورئان و مەبەستەکانی و وەك بەنی ئیسرائیلیان لێهات، کە خوای گەورە باسیان دەکات کە هەڵگری تەوراتن بە ڕێگەیەکی کەرانە، نەك بە ڕێگەیەکی مرۆڤانە (مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَاراً) (الجمعة: ٥). گوێدرێژ هەروەك ئاشکرایە ـ دەزانین ـ ناخوێنێتەوە و نانووسێت، ئەوەندە هەست بە پەرتووك دەکات کاتێك لەسەر پشتی دادەنرێت، دەتوانێت هەست بکات بەوەی کە بارەکەی سووکە یان قوورسە. نەتەوەکەمان ـ لەگەڵ ئەفسوسێکی زۆر ـ خوای گەورە هۆشداریی پێداوە و ئاگاداری کردووەتەوە لەوەی کە وەك نەتەوە پێشووەکان نەکەوێتە ناو هەمان گێژاوی ئەوانەوە و قورئان هەڵگرێت و هەڵنەگرێت ـ لەگەڵ ئەفسوسێکی زۆردا ـ بە هەمان ڕێگەی گەلانی بەنی ئیسرائیل قورئانیان هەڵگرت، هەمدیس هەڵگرتنێکی گوێدرێژانە نەك مرۆڤانە، لە ئایەتەکان دوورکەوتنەوە، وازیان لە ئامانجەکانی هێنا، مەبەستەکانی پشتگوێ خرا، گوێیان نەدایە ئەو ئاکارانەی هێنابوونی و پارچە پارچە بوون و کەوتنە گیانی یەکتری و هێرشکردنە سەر یەکتر و دەستدرێژی کردنە سەر یەکتری و هەموو هۆکار و ڕێگاکانی یەکبوون و برایەتییان ژێرپێ نا. ئەم پەرتووکە گرنگترین گۆڕانکاریی لە ژیانی ئەم نەتەوەیەدا کرد، ئەوەیش پاش ڕێنموونی کردنی، دڵی تاکەکانی کردە یەك. خوای گەورە منەت دەکات بەسەر نێردراوە بەخشندەکەی خۆیدا کە دەفەرموێت (هُوَ الَّذِيَ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ * وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً مَّا أَلَّفَتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ) (الأنفال: ٦٢ـ ٦٣)، بەم

پەرتووکە دڵەکانی کردنە یەك، یەکدەنگی کردن لەسەر یەك بیروباوەڕ و یەك یاساو یەك دیدگا و یەك وێناکردنی هاوبەش. باشترین نەتەوەی لێ پێکهێنان لەناو خەڵکاندا. خوای گەورە دەربارەی گەلێك لە گەلانی پێش ئێمە دەفەرموێت کە پەیمانیان شکاندووە و بانگەواز و داوای پێغەمبەرانیان پشتگوێ خستووە (فَنَسُواْ حَظّاً مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) (المائدة: ١٤)، موسڵمانان ئەمڕۆ شوێنیان کەوتوون بە هەمان شێواز، ئەگینا چۆن دەگونجێت بۆ موسڵمانێك خوێنی موسڵمانێکی دیکە بڕێژێت بە ناڕەوا؟ چۆن دەگونجێت باوەڕدارێك باوەڕدارێکی تر بکوژێت، مەگەر بە هەڵە؟ خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلاَّ خَطَئاً) (النساء: ٩٢)، کەفارەتی بۆ کوشتنی بە هەڵە داناوە. بەڵام موسڵمانان بەتایبەتی لەم کاتانەی دواییدا و لەم ڕۆژانەی دواییماندا، ترسیان نەماوە لەسەر کوشتن و خوێنڕشتن و وایان لێهاتووە لەسەر گومان و بۆچوون و ناو و چییەتی (الانتماء) دەکوژن و خوێنی بەرامبەرەکەیان دەڕێژن.

ئێوە ئەی برایانی باکووری عێراق، زەحمەتی زۆرتان کێشاوە. لەبیرم دێ کاتێك من کرام بە سەرباز بۆ ئەنجامدانی راژەی ئیحتیات لە سوپای عێراقدا و فەرمانم پێکرا کە پەیوەندی بکەم بە یەکێك لە یەکە سەربازییە جەنگاوەرەکان لە باکوور، فەرمانەکەم دایە دواوە و بەهانەنامەیەکم نووسی ـ ئەمە لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا بوو ـ وتم: من رێگە بە خۆم نادەم لەگەڵ برا ئایینی و باوەڕییەکانمدا بجەنگم. ئەو نووسراوەم نارد کە فەرماندەی یەکەکەم نە خۆی وەری گرت و نە ناردیشی بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکانی سەرەوەی خۆی. وتی: لەبەرئەوەی بڕیار وایە هەر کەسێك قسەی وا بکات دەبێت لەسێدارە بدرێت. بەڵام من وتم: بێگومان خوای گەورە سپاردەیەکی خستووەتە گەردنی ئێمە و تۆزێ زانیاریی پێداوین لەبارەی قورئانەوە، ناتوانین خۆمانی لێ بێئاگا بکەین. ئەگەرچی ئێوە منتان وەك ئەفسەرێك هێناوەتە ئێرە، بەڵام ناتوانن باوەڕ و ویستم لێ

دابڕنن. من پێتان دەڵێم: هەرگیز لە دژی براکانم ناجەنگم.... فەرموون بەهانە و پاساوم بدەنێ بۆ ئەم کارەم. لە ئەنجامدا (عەبدولکەریم قاسم) بانگی کردم، لەکاتێکدا من تەنها ئەفسەرێکی ئیحتیاتی تازەپێگەیشتوو بووم کە چەند هەفتەیەك لەوەو پێش دەرچووبووم. پێی وتم: هەواڵم پێگەیشتووە کە تۆ ڕەوانەی چەند یەکەیەکی سەربازی کراوی و ناتوانیت و ناگونجێ کاری تێدا بکەیت. تۆ پیاوێکی خاوەن قەڵەمی و جەنگاوەر نیت و بۆ جەنگ ناشێیت، بەڵام بۆچی لە نامەکەتدا وتووتە کە تۆ ناتەوێت لەگەڵ براکانتدا بجەنگیت؟ ئەوان خزمەتی داگیرکەریان کردووە. پێموت: ئەی بەڕێز، سەرکردە: ئەمە شتێکە و خۆت دەیلێیت لە کاتێکدا لە لوتکە و هەرەمی دەسەڵاتدایت، ئەوانیش دەڵێن لەبارەی تۆوە کە تۆ خزمەتی داگیرکەر دەکەی بەشێوازی فەرمانڕەواییت، ئێمەش دادوەر و قازیمان نەبینی کە دانیشن و گوێ شل بکەن بۆ وتەی هەردوولا تاکو بزانین کێ ڕاستە و کێ هەڵەیە. هەروەها پەروەردگارمان فەرموویەتی: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (الحجرات : ٩ ). ئێمە نە دەستمان کرد بە ئاشتی و داواشمان نەکرد، لە کێشەی برا کوردەکانمان نەکۆڵییەوە لەپێناو چارەسەرکردنی بە ڕێگەیەکی باش، بەڵکو یەکسەر دەستان دایە جەنگ وەك هەموو دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی تری عێراق، کە ئەوەش لەو شتانە نییە کە لە نێوان موسڵماناندا پەسەند بکرێت و وەربگیرێت. کێشە و کاری موسڵمانان پێویستە بە گفتوگۆ و مشتومڕ چارەسەر بکرێت، نەك بە شتێکی تر جگە لەمە. وتی: ئایا دەزانیت بڕیاری یاسای سەربازی چییە دەربارەی کەسێك کە ئەو هەڵوێستەی تۆی هەبێت؟ وتم پێی: بەڵێ ئەوە دەزانم، بەڵام بڕیاری خوا بەرزتر و ڕاست ترە و گەورەترە لە هەر یاسایەکی سەربازی و شارستانی و هەر یاسایەکی تر. یاسای خوا دەفەرموێت (فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي)، بەڵام ئێمە

لێکۆڵینەوەمان نەکردووە و ئاشتەوایشمان ئەنجام نەداوە و هەنگاوەکانی یەکەممان نەناوە لەم بوارەدا، یەکسەر ڕاتان کرد و پەلاماری گەلی کوردتان دا بە هەموو توندی و دڵڕەقییەکەوە. ئەوە بەشێك بوو لە مێژوویەك کە لەگەڵیدا ژیایین و هەندێکتان تێیدا ژیان، نامانەوێ بە هیچ شێوەیەك بگەڕێینەوە بۆی.

ئەگەر هەندێ هۆشدار و ئاماژە هەیە لەبارەی عێراقەوە، ئەو وڵاتەی کە سەربەوین هەموومان، بە باکوور و باشوور و ناوەڕاست و رۆژهەڵات و رۆژئاوایەوە، تەنها ئەوەمان لەسەرە کە دەست بگرین بەم پەرتووکە پیرۆزەوە، تا لە تاریکاییەکانەوە دەرمان بکات بۆ ناو رووناکیی یەکبوون و لە ستەمەکانی تاکڕەوییەوە بۆ رووناکیی دادگەری و سەربەستی و راوێژ. لە تاریکاییەکانی قۆرخکردنی سامانەوە بۆ رووناکیی دادگەریی کۆمەڵایەتی. پێدانی هەموو مافێك بە خاوەن مافی خۆی و ستەمنەکردنی کەس لە کەس. بێگومان ژیان لەناو کاردانەوەی کارەکاندا، بە جۆرێکە رۆژێك کورد دەچەوسێنرێتەوە، پاشان چەوساندنەوەیان لەسەر لادەچێت تا (سوننە) یان (شیعە) یان جگە لەمانە بچەوسێندرێتەوە، هەرگیز ئەم ئامانجی نابێت جگە لەوە نەبێت، کە کاردانەوە روو دەدات بە شێوەی هەمان کاری ئەنجامدراو و وادەکات دژایەتیی یەکتری و کوشتن و دووبەرەکی و وێرانکاری بەردەوام بێت، تەنها پەرتووکی خوا (قورئان) دەتوانێت دادوەری لەنێوان خەڵکدا بکات، دەتوانێت رێگەی راست نیشانی خەڵك بدات (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ) (الحجرات: ١٠).

ئیمانداران چی؟ تەنها باوەڕداران بران، نەیفەرموو هاوڕێن، نەیفەرموو تەنها دراوسێن، نەیوت: لە ئاستێکی ئابووریی دیاریکراودان... بەڵام بران، کەواتە ئاشتی لە نێوان براکانتاندا فەراهەم بکەن. واتە بۆی هەیە لەنێوان کۆمەڵێك برادا کێشە و دووبەرەکی روو بدات، بەڵام لەسەر کەسانی تر پێویستە ئاشتەوایی بخەنە نێوانیانەوە و ئاشتیان بکەنەوە و کەشێك بڕەخسێنن بۆ گفتوگۆ کردن کە ببێتە هۆی گێڕانەوەی هەموو شتەکان بۆ جێگەی شیاوی خۆیان و بە ستەمکار بوترێت

تۆ ستەمکاریت، بە دەستدرێژکار بوترێت تۆ دەستدرێژکاریت، بە ستەملێکراو بوترێت تۆ ستەملێکراویت و ئێمە لەگەڵتاین و مافت بۆ وەردەگرین، چونکە بێگومان خوای گەورە ئاسمانەکان و زەویی بە راستی دروستکردووە و لەسەر دادگەری وەستاندونی. کەوابوو پەرتووکی پیرۆز بەشی کەسێکە شوێنی دەکەوێت، رزگارییە بۆ کەسێك دەستی پێوەدەگرێت. گەلمان لە عێراقدا بە کورد و عەرەب و شیعە و سونی و تورکمان و بەڵکو کەمایەتییە ئاینییەکانی ترەوە، ناتوانرێت دەربهێنرێت لەناو گێژاوی ئەو کێشانەدا کە ڕووبەڕوویان بووەتەوە، تەنها بە هۆی رووناکیی قورئانەوە نەبێت، متمانە و برایەتی ناگەڕێتەوە ناومان و تەومژی لە یەکتر نامۆبوون نارەوێتەوە، خۆشەویستی نایەتەوە ناو دڵی عێراقییەکان.

ئێوە ئەی برایانێ کە لەم جێگە پیرۆزەدا کۆدەبنەوە بۆ لێکۆڵینەوەی قورئانی پیرۆز، ئێوە بە ویستی خوا شایەنن بۆ هەڵگرتنی ئەم ئالایە، ئالای قورئان، کە بتوانن یەکگرتوویی و تەبایی بگەڕێننەوە بۆ ناو عێراقییەکان بەو پێیەی کە ئەوان بەشێکن لە نەتەوەی گەورەی موسڵمانان. کە زۆر پێویستیان بە دووبارە بنیاتنانەوەی یەکێتییان هەیە و پێویستە دڵەکانیان لێك نزیك بکرێنەوە بەم قورئانە کە هەر لە سەرەتاوە دڵەکانی پێکەوە گرێدا. شتی دووەمیش کە پێم خۆشە وەبیری خۆم و ئێوەشی بهێنمەوە، بێگومان ئەم پەڕتووکە نیگای خوایە و زیرەکی و و هەڵکەوتوویی مرۆڤ نەیهێناوە و زمانەکەی زمانی قسەپێکردنی ئاسایی نەتەوەی عەرەب نییە، بەڵکو تەنها زمانی قورئانە و زمانێکی ئاشکرایە. زمانی عەرەبی ئاسایی هەندێکجار روون و ئاشکرایە، هەندێ جاریش بە پێچەوانەوە، بەڵام زمانی قورئان هەمیشە ئایەتەکانی روون و ئاشکران. هەمیشە ئایەتەکانی بەڵگەی بێ پێچ و پەنان و پڕن لە رێنموونی، لەبەر ئەوە من سوورم لەسەر ناونانی بە زمانی قورئان، قورئان زمانی تایبەتی خۆی هەیە کە زمانی عەرەبی دەگرێتەوە و لێشی تێپەڕ دەبێت، ئەو زمانێکی نەتەوەیی نییە، بەڵام زمانی رێنموونییە،

زمانی ئاینێکی خواییە. جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان زمانێکدا کاتێك مرۆڤ بەکاری دێنێت، لە لەگەڵ زمانێکدا کە خوا قسەی پێدەکات، زمانی قورئان زمانی خوا و زمانێکی خواییە، زمانێکی نەتەوەیی نییە تەنها تایبەت بێت بە عەرەبەوە، لەبەرئەوە باپیرانتان لەم راستییە تێگەیشتوون، هەربۆیە ژیانیان و گیانیان لە رێی تێگەیشتنی قورئاندا بەخشیوە، هەروەها لە پێناوی راژەی زانستە عەرەبییەکاندا.

هیوامان گەورەیە کە باکووری عێراق و ناوچەی کوردستان شانازی و شکۆی بۆ بگەڕێتەوە لە سایەی خزمەتی ئەم پەرتووکە پیرۆزەوە و زانستە هۆکار و ئامێرە تایبەتییە پەیوەندیدارەکان بەم زانستانەوە. بێگومان ئەم پەرتووکە نیگا و سرووشێکی خواییە، هیچ وشەیەکی گەورەم - پێغەمبەری خودا- ی تێدا نییە، هەمووی سرووشە لەلایەن خواوە، هیچ سوودێکی نییە کە مرۆڤ دەربارەی بڵێت پەرتووکێکی باشە! بەڕاستی پەرتووکێکی زۆر هەڵکەوتووە! یان پەرتووکێکە شتی زۆر گەورەی تێدایە! پێویستە مرۆڤ باوەڕی وابێت کە ئەم پەرتووکە لەلایەن خواوە وەك سرووشێك هاتووە، نیگا و سرووش (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْياً أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ) (الشورى: ٥١). جیاوازیی خستە نێوان سرووش و هەر شتێکی تر جگە لەم. کەواتە لەسەرمانە باوەڕ بەم راستییە بهێنین و وەك خۆی لێی تێبگەین، نەکەوینە ژێر هەژموون و کاریگەریی ئەوانەی قورئان یەکسان دەکەن لەگەڵ هەر دەقێکی زمانەوانی یان ڕەوانبێژیی تر. خاڵی سێیەم: ئەوەی قورئانی وەرگرتووە، کە ئەویش دیارە پێغەمبەری خوایە ﷺ، کەواتە پەرتووکی تەواومان لایە و مرۆڤی تەواومان لایە، پەرتووکە تەواوەکە قورئانە، مرۆڤە تەواوەکەش پێغەمبەری خوایە. مرۆڤی تەواویش ﷺ بە ڕاستییە موحەممەدییەکەی، مرۆڤێکە خودا کردوویەتییە کۆتا پێغەمبەر، بەرپرسیاریی هەڵگرتنی بەرنامە و بانگەوازی پێغەمبەرانی پێ سپێردراوە (إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً) (الأنبياء: ٩٢) ئەی پێغەمبەران (وأنا ربكم فاعبدون).

کۆتایی پێغەمبەران، هەروەك ئیبراهیمی باوکی وای کرد ـ باوکی پێغەمبەران ـ هەموو پایەکانی هەڵگرت. هەموو ئەوەی کە پێغەمبەران هێنایان گەیشت بەم و بووە سپاردەیەك لەسەری و ئەم پەرتووکە (قورئان) لە خۆیدا کۆیکردەوە، تایبەتمەندیی باوەڕپێکردن و زاڵبوونی وەرگرت (مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ) (المائدة: ٤٨). داننەرە بە پەرتووکەکانی پێش خۆیدا، تەنانەت ئەو پەرتووکانەش کە دەستیان تێوە درابوو و گۆڕابوون. پەرتووکەکانی پێش خۆی هێنایەوە سەر ڕێڕەوە ڕاستەکانیان، واتە وەك ئەو کاتەی، ئەو بارودۆخەی کە تێیدا هاتبوونە خوارەوە، پاش ئەوە خستنیە ژێر چاودێریی خۆیەوە، بەمەش پارێزران و مانەوە.

بێگومان پێغەمبەری خوا، ئەو پێغەمبەرە مرۆڤە نێردراوەیە فەرمانی شوێنکەوتنی ئەم پەرتووکەی پێدراوە، فەرمانی هەڵگرتن و بەرجەستەکردنی ئەم پەرتووکەی پێدراوە لەسەر زەویدا. ئەو ڕەوشتی قورئان بوو، شێوازی مامەڵەی ژیانی ڕۆژانەی قورئان بوو، ڕێنموونی و ناوەڕۆکی ژیان و هەڵسوکەوت و ڕێڕەوی ژیانی ئەم قورئانە پیرۆزە بوو. لەم قورئانەدا پێغەمبەری خوا: پێغەمبەرە، نێردراوە، موژدەدەرە، ترسێنەرە، ڕێنموونیکەرە بە ویستی خوا و چرایەکی ڕووناکیدەرە.

ئەم قورئانە نەتەوەی بنیاتنا و پێکیهێنا و ڕایکێشا بۆ لای چاکەیەك و نەتەوەیەکی لێ دروست کرد کە سەرتەڵ و سەرتۆپی نەتەوەکانە، گەواهە بەسەریانەوە تا لە ژیاندا بن. کاتێك ئەرکەکەی کۆتایی هات ـ ﷺ ـ خەڵك پۆل پۆل هاتنە ناو ئاینی خواوە، ئەوانی بەجێهێڵا لە ڕۆژانی ڕووناکدا، کە شەوەکانیشی وەك ڕۆژ وایە و ڕۆشنە، وەك فەرموویەتی: (لقد تركتكم على المحجة البيضاء ليلها كنهارها لا يزيغ عنها إلا هالك: كتاب الله .....)، واتە: دەست بگرن بەم پەرتووکە پیرۆزەوە، پابەند بن پێوەی و لێی بێئاگا مەبن، بێباوەڕ و باوەڕ لاوازان لەرزۆك و لاوازتان نەکەن و خەڵکانی تر لاتان نەدەن و هەڵتان نەخلیسکێنن بە

هەر شێوەیەك لە شێوەكان. مۆری پەرتووكی ڕێنموونییە و پەرتووكی ڕووناكییە، نێردراوی خوا ﷺ موحەممەد، پەیامبەر و نێردراو و مرۆڤ بوو لەهەمانكاتدا، پێغەمبەریەتی و سرووش (الوحي) دوو كاری خوایی نادیارن. سرووش شتێكە و ڕێگەیەكە كە خوا بە هۆیەوە پەیامی خۆی دەگەیەنێتە نێردراوانی خۆی، فەرمانیان پێدەكات كە ڕایگەیەنن بە مرۆڤەكان، نەتەوەكانیان و شوێنكەوتووانیان بانگ بكەن بۆ باوەڕ بە پەیامەكانیان. هەموو پێغەمبەران هەریەك هاتوون بۆ لای چەند نەتەوەیەكی تایبەت یان چەند ناوچە و گوندێكی دیاری كراو، تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ كە بۆ هەموو مرۆڤەكان نێردراوە (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً) (سبأ: ٢٨).

پێغەمبەری خوا ﷺ، باوەڕی هیچ كام لە ئێمە تەواو نابێت هەتا باوەڕی بەوە نەبێت كە ئەو نێردراوێكی مرۆڤە و سرووشی لە خواوە بۆ دێت و خوا بە سرووش ئەم قورئانەی بۆ ناردووە. هەندێك كەس دەڵێن كە ئەو (پێغەمبەر) كەسێكی بلیمەتە (عبقري). هەندێكی تریش دەڵێن: ئەو سەركردەیەكی ئیلهام بۆ كراوە. شتی تریش زۆر دەوترێت، هەموو ئەمانەمان لا گرنگ نییە، ئەوەی بەردەوام لامان گرنگە كە بڵێت، هەركەس دەڵێت (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله).

پێویستە باوەڕ بەوە بهێنرێت كە ئەو (پێغەمبەر) نێردراوی خوایە و رابگەیەنرێت بە ئاشكرا، دەبێ باوەڕ بەوە بهێنرێت كە ئەو هەڵبژێردراوی یەزدانە و ئەركی سەرشانی موسڵمانە كە باوەڕی تەواوی هەبێت كە ئەو سرووشی بۆ هاتووە لەلایەن خوای گەورەوە و كردوویەتییە مرۆڤێكی تەواو (عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (التوبة: ١٢٨).

پێغەمبەری خوا رازی نییە بەم پارچە پارچە بوون و دووبەرەكی و خراپەكاری و لەگەڵ یەكدا جەنگانەی ئەمڕۆی نەتەوەكەی ..... هتد.

ئەو ئێمەی لەکاتێکدا بەجێهێشت کە شەوەکانیشی وەك ڕۆژەکانی ڕووناك بوون و پێویستە لەسەر ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە بەردەوام بین و دامەزراو و نەگۆڕ بین (فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ) (هود: ١١٢). (وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاء غَدَقاً) (الجن: ١٦).

ئەگەر عێراقییەکان لەسەر ڕێبازی ڕاستی بمێننەوە و قسەیان بکەنە یەك لەسەر پەرتووکی خوا و پێغەمبەری خوا بناسن بەو ناسینەی کە شایستەی ئەوە، ژیان و ئاکاری ئەو لە ژیانیاندا ڕەنگ بداتەوە و شوێن پێی هەڵگرن، ئەوا هەرگیز دووچاری پارچە پارچە بوون نابن و واز لە جەنگان دێنن لەگەڵ یەکتردا.

سوپاستان دەکەم، گەرمترین سوپاس بۆ ڕێکخستنی ئەم کۆنفرانسە، هیوام گەورەیە کە بەردەوام بن لەم ئەرکە گەورەیەتان و پیرۆزەتاندا، لەپێناو ناساندنی قورئان بە خەڵکی و دەرخستنی شکۆی پێغەمبەری خوا بۆیان، هەروەها پێناسەکردنی سرووشی خوا بۆ مرۆڤەکان.

پێویستە لامان ڕوون بێت کە ئەم ئاڵۆزی و پشێوییانەی ئێمە تێیکەوتووین، ناتوانین لێیان دەرچین (ڕزگار بین) هەتا نەبینە شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا کە ڕاڤەی قورئانە و بەرجەستەکردنی گیانێتی لە ژیانی ڕۆژانەیدا.

سوپاس بۆ ئێوە و خوا پاداشتی بەخێرتان بداتەوە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکاتی خواتان لەسەر بێت. بەئومێدی چاوپێکەوتنی تر لە داهاتوودا، کە ئومێدم وایە خوای گەورە بۆمی بڕەخسێنێت لە باکووری خۆشەویستماندا، لە شوێنانی تردا بە ویستی خوا.

**سڵاوی خواتان لێ بێت، بە خواتان دەسپێرم.**

# ئیسرائیلیات لە ڕاڤەی قورئاندا
# بڕیار لەبارەیەوە، کاریگەرییەکانی، هەڵوێستی ڕاڤەکارانی قورئان دەربارەی

د. موحەممەد شاکر موحەممەد ساڵح چارپوتی
دکتۆرا لە فیقهی بەراوردکاری لەگەڵ یاسادا
سەرۆکی بەشی لێکۆڵینەوە ئیسلامییەکان، کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان، زانکۆی سەلاحەددین

# پێشەکی

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنموونیی کردین بۆ ئاینی ئیسلام. ئێمە هەرگیز نەماندەتوانی ڕێگەی ڕاست بگرین ئەگەر خودا ڕێنموونیی نەکردینایە. درووود و سڵاو لەسەر کەسێك کە نێردراوە بە ڕەحمەت بۆ جیهانیان، گەورەی ئێمە (موحەممەد) (درووودی خوای لێ بێت) و لەسەر خزمە نزیکە باوەڕدار و یارە دڵسۆزەکانی و هەرکەس شوێن پێهەڵگری ئەوانە بە چاکە، هەتا ڕۆژی دوایی.

پاش، سوپاس و ستایش و ناردنی درووود، خوای گەورە (موحەممەد)ی وەك کۆتا پێغەمبەر نارد، لەگەڵیدا قورئانی پیرۆزی ڕەوانە کرد کە خۆی بڕیاری داوە بیپارێزێ لە دەستتێوەردان و گۆڕین. هەڵوەشێنەرەوە و سڕەرەوەی پەرتووکە ئاسمانییەکانی ترە. سەرەڕای ئەمە، قورئان لەگەڵ تەوراتدا لە هەندێ بابەتدا هاودەنگ و ڕایە، وەك چیرۆکی پێغەمبەران و نەتەوە و ڕابوردووەکان، هەندێ بابەتیش دەگرێتە خۆی کە لە ئینجیلدا باسکراوە وەك چیرۆکی عیسا پێغەمبەر و موعجیزەکانی (کش هێنەرەکان)[1]، بەڵام قورئان تەنها لەو چیرۆکانەدا خاڵی پەند و ئامۆژگاری لەبەرچاو دەگرێت نەك باسی هەموو لایەنەکانیان، وەك لە تەورات و ئینجیلدا هاتووە.

پاشان نەتەوەی عەرەب خاوەن پەرتووك و زانیاری نەبوون، بەڵکو ژیانی دەشتەکییانە و نەخوێندەواری زاڵبوو بەسەریاندا و هەرکاتێك حەزیان لە زانینی شتێك بکردایە لەبارەی سەرەتا و دەستپێکردنی دروستبوونی بوونەوەر و نهێنییەکانی بوون و ڕووداوە گەورەکانەوە، پرسیاریان لە ئەهلی کیتاب (جوولەکە و مەسیح) دەکرد، چونکە دەروونی مرۆڤ حەزی لە زیادە زانینە. لەبەر ئەم هۆکارە و چەند هۆکارێکی تر ـ کە لەناو لێکۆڵینەوەکەدا لە دەرگام داون ـ

[1] کش هێنەرەکان.

ئیسرائیلیات هاته نێو راڤەی قورئانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە هاوەڵان لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا گەڕاونەتەوە بۆ لای ئەهلی کیتاب، کە تەنها بۆ روونکردنەوەی چیرۆکێك بووە و بەس. هەروەکو هاوەڵان لەبارەی شتانێکەوە پرسیاریان لە ئەهلی کیتاب نەکردووە کە پەیوەندیی بە بیروباوەڕ یان بڕیارەکانەوە هەبوو بێت، مەگەر وەك بەڵگەخوازییەك یان پشتقایمکردن و بەهێزکردنی ئەو شتانەی کە قورئان هێنابوونی.

هەروەك هەرگیز لایان نەدەدا لەو شتانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێیان گەیشتبوو بۆ شتانی تر، بەڵکو لە سەردەمی شوێنکەوتووانی هاوەڵان (تابعین) دا زۆرێك لە گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان هاتنە ناو راڤەی قورئانەوە، چونکە شوێنکەوتووان ئاسانکارییان کرد و نەرمییان نواند لە وەرگرتنی ئیسرائیلیاتدا. زۆرێك لە ئیسرائیلیاتیان ئاخنییە ناو راڤەی قورئانەوە بێ پشکنین و لە بێژنگ دانی. ئەمجا پاش شوێنکەوتووانی هاوەڵان، کەسانێك هاتن کە زۆر دڵدادە و شەیدای ئیسرائیلیات بوون، بەشێوەیەك لە ڕادەبەدەر، هیچ قسەیەکیان نەدەدا دواوە و سڵیان نەدەکرد لەوە و دوودڵیی نەیدەگرتن کە لە راڤەی قورئاندا هەموو قسەیەکی ئیسرائیلی بهێنن با ئەقڵیش وێنای نەکات. ئەم گێڕانەوە ئیسرائیلیاتانە کاریگەریی لەسەر نەتەوەی ئیسلامی هەبووە و ئەم قسەیەش وەنەبێ بە رەهایی بێ، بەڵکو بێ گومان هەندێك لەم گێڕانەوانە راست و وەرگیراون و هەشیانە درۆ و دەستهەڵبەستن، کە ئەمەش دەدرێتە دواوە و هەندێکی تریان هەڵوێستەی لەسەر کراوە. بێ گومان لە نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەدا پشتم بەستووە بە کتێبەکانی راڤەی قورئان و فەرموودە و پەرتووکە مێژووییەکان و پەرتووکەکانی زانستی کەلام، سەرەڕای ئەو کتێبانەی کە لەبارەی بابەتی ئیسرائیلیاتەوە دەدوێن و تیشکیان خستووەتە سەری، جگە لەمانەش هەندێ نووسراوی تر.

لێکۆڵینەوەکە لە سێ جێگەباس (مبحث) پێکهاتووە، کە بەم شێوەیەیە:

جێگەباسی یەکەم: دوو باسی لەخۆ گرتووە، کە لە باسی یەکەمدا: روونکردنەوەی مەبەست لە زاراوەی ئیسرائیلیاتە و لە باسی دووەمدا: هەڵوێستی شەریعەتم خستووەتە ڕوو لەبارەی ئیسرائیلیاتەوە. جێگەباسی دووەمیش دوو بابەتی لەخۆ گرتووە: لە بابەتی یەکەمدا باسی گرنگترین ئەو هۆکارانەم کردووە کە بووەتە هۆی هاتنە ناوەوەی ئەم گێڕانەوە ئیسرائیلییانە بۆ ناو راڤەی قورئان. لە بابەتی دووەمدا لایەنەکانی کاریگەریی خراپی ئەم گێڕانەوانە لەسەر نەتەوەی ئیسلام. هەروەها جێگەباسی سێیەم دوو بابەت دەگرێتە خۆی: لە یەکەمدا تیشکم خستووەتە سەر جەمسەرەکانی گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان و دیدگای زانایان دەربارەیان. لە بابەتی دووەمدا هەڵوێستی راڤەکارانی قورئانم دەربارەی ئەم گێڕانەوانە خستووەتە ڕوو. باسی چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەم گێڕانەوانەدا.

بەمەش وا دەزانم مافم دابێتە بابەتەکە، لەبەرئەوەی ئەم باسە بە وێناکردنی من تنوێتیی تینووان و شەیدایانی ناسینی راستیینەی ئەم گێڕانەوانە دەشکێنێ. هەروەها بڕیاری شەریعەتم لەبارەی ئەم گێڕانەوانەوە خستووەتە ڕوو. پەردەم لەسەر هەڵداونەتەوە. هەرچییەك راستم وتبێت ئەوە لە خواوەیە و هەرچییەکیش هەڵەم تێدا کردبێت ئەوە لە خۆمەوەیە و لە شەیتانەوەیە، خواش خاوەنی بۆ رێکەوتن و یارمەتیدەرە.

# جیباسی یەكەم:
# ڕوونكردنەوەی مەبەست لە ئیسرائیلیات، هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلام دەربارەیان

## باسی یەكەم:
## ڕوونكردنەوەی واتای زاراوەی ئیسرائیلیات:

وشەی ئیسرائیلیات كۆیە (جمع) و تاكەكەی (مفرد)ەكەی ئیسرائیلیە. دراوەتە پاڵ كوڕانی بەنی ئیسرائیل كە كوڕەكانی یەعقوب (علیە السلام) و نەوەكانیانن، كە ئەمەش بریتییە لە چیرۆكێك یان ڕووداوێك كە لە سەرچاوەیەكی ئیسرائیلییەوە دەگێڕدرێتەوە[2] (ئەوەی راستی بێ) بێگومان ئیسرائیلیات تەنها سەرچاوەكەی لە یەهودەوە نەبووە، بەڵكو دیانەكانیش بە سەرچاوەیەك دەدرێتە قەڵەم بۆ ئەم ئیسرائیلییانە.[3] هەروەك بێ گومان واتای ئیسرائیلیات پەلی هاویشتووە و هەموو ئەو چیرۆك و ئەفسانانەی گرتووەتەوە كە خۆیان ئاخنیوەتە

---

[2] ینظر: البغوي ومنهجه في التفسیر، ص١٠٧ والاتجاهات الفكریة في التفسیر، ص٢٣٩.

[3] تەماشای كتێبی (مناهج المفسرین) دەكرێت لا٨٠. پێویستە بزانین كە سەرچاوەی زانیاریی بەنی ئیسرائیل و رۆشنبیرییان لە تەورات و تەلمود و مێژوو و چیرۆك و ئامۆژگاری و ئەفسانە و پڕوپووچەكانەوە وەرگیراوە، بەلاّم دیانەكان (نەصارا) رۆشنبیرییان پشتی دەبەست بە ئینجیل، بەلاّم ئەمان ئینجیلیان گۆڕی هەروەك كە جووەكان هەستان بە گۆڕینی تەورات. ئینجیلە باوەڕپێكراوەكان لای دیانەكان و ئەو نامانەش كە نووسراوی نێرراوەكانی پێی دەوترێت سەردەمی نوێ. پەرتووكی پیرۆز لای دیانەكان بریتییە لە تەورات و ئینجیلەكان كە ناوی سەردەمی كۆن و تازەی بەسەردا دەبڕێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئینجیلانە واتا و راڤەی جیاوازیان لێكراوە كە لەمەودوا بوونەتە سەرچاوەی رۆشنبیریی دیانەكان. هەروەكو لەگەڵ ئەمەشدا دیانەكان هەندێك چیرۆك و هەواڵ و كۆمەڵێك رێنموونی كە بە خەیاڵی خۆیان لە حەزرەتی عیساوە (سەلامی خوای لێ بێت) وەریان گرتووە، هەمدیس رۆشنبیری دیانەكان كەوتووەتە ژێر هەژمموونی زانیارییە یۆنانییەكانەوە.

ناو فەرموودە و راڤەی قورئانەوە کە نـامۆن پێیـان، بـا سەرچاوەشـیان جـوویی و دیانی نەبێ.

پێشەوا زەهەبی پێناسەی ئیسرائیلیاتی کردووە لە کتێبەکەیدا: (بریتییـە لـە هەموو ئەو شـتانەی هاتوونەتـە نـاو راڤـە و فـەرموودەوە، لـەو ئەفسـانە کۆنانـەی دراونەتە پاڵ سەرچاوەیەکی یەهودی یان جگە لەمانە.[٤]

هەروەها چەمکی فراوانـی ئیسـرائیلیات وەردەگـرین بـەجۆرێك هـەموو شـتێك بگرێتــەوە، کــە هاتووەتــە نــاو تەفســیرەوە، ئەگەرچــی لــە سەرچــاوەیەکی نائیســرائیلییەوە وەرگێڕدرابێتــەوە یــان پەیوەنــدیی بــە کۆمەڵــە چــیرۆکی نائیسرائیلییەوە هەبێت.

لەبەرئەوەی هەموو ئەمانە وشەی ئیسرائیلیاتی بەسەردا بڕدراوە، کە ئەمەش لە بەشی زاڵکردنە (التغلیـب) لەبەرئـەوەی لایـەنی جـوویی زیـاتر ناوبـانگی هەیـە، کەواتـە گێڕانـەوە لـەوەوە زۆر بـووە، ئـەوەش لەبـەر زۆر تێکەڵبوونیانـە لەگـەڵ موسڵمانان لە سەرەتای ئاشـکرابوونی ئیسـلامەوە تـا ئـەو کاتـەی پـەرەی سـەند، خەڵکیش پۆل پۆل هاتنە ناو دینی خواوە.

لەمــەش زیــاتر، لــە رۆژەکــانی یەکــەمی ســەرهەڵدانی ئیســلامەوە هــیچ کاریگەرییەکی دیانی یا جوویی لەسەر رۆشنبیریی ئیسلامی نەبووە.

پـاش ئـەوەی رۆشـنبیرییە نایەهودییـەکان هاتنـە نـاوەوە و کاریگـەرییان لـە ئـاوەزی ئیسـلامی کـرد، زانـراوە یەهودییـەکان بـە زاڵـی مایـەوە لەسـەر هـەموو زانراوەکانی تر، بە سەرچاوە جیاجیاکانەوە، بەتایبـەتی لـە راڤـەدا، کـە بێگومـان لێکخشــاندنێك لــە نێــوان موســڵمانان و رۆشــنبیریی یەهودیــەت و زانــراوە ئیسرائیلییەکاندا لە رۆژانی یەکەمیانـدا لـە مەدینـە سـەری هەڵـدا، کـە ئەمـەش لـە

---

[٤] التفسیر والمفسرون، ١١/١٦٤.

سـەردەمی حـەزرەتی پێغەمبـەردا[٥] (ﷺ) بـووە. پاشـان بێگومـان ئیسـرائیلیات هەمووی لاواز و دەستهەڵبەست نییە، بەڵکو چەن جۆرێکە:

هەیانـە سـاغە لـە سـەنەد و مەتنەکەیـدا[٦]، هەشـیانە لەسـەنەددا لاوازە[٧]، هەشیانە لە مەتندا[٨]. بەشێکیشی کە دانراو و دەستهەڵبەست و دروستکراوە[٩].

## باسی دووەم:

## هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلام دەربارەی ئیسرائیلیات

پاش ئەوەی زانیمان مەبەسـت لـە ئیسـرائیلیات چییە، پێویسـتە لەسـەرمان بزانین بڕیاری شەرع لەبارەیـەوە چییە و هەڵوێسـتی ئیسـلام دەربارەیـان بخەینـە ڕوو، تا بەرچاومان ڕوون بێت، چونکە ئیسـرائیلیات لـە ڕووی بابەتییـەوە دەچـێتە نـاو بیروبـاوەڕ و بڕیـارە شـەرعی و ئامۆژگـاری و چـیرۆکەکانەوە، کـە هەنـدێکی - ئیسرائیلیات - گونجاوە لەگـەڵ شـەرعماندا و هەنـدێکی پێچـەوانەیەتی و هەنـدێکی تریشی بێدەنگیی لێ کراوە، جا ئایا ئەم ئیسرائیلیاتە هەمووی دەدرێتـە دواوە بـە کورتی و درێژی (جملة وتفصیلا) یان لێرەدا لێکۆڵینەوە و ڕای جۆربەجۆر هەیە؟

لەسەرمانە - پێش هەموو شتێك - ئەوە لەبەرچاو بگرین کە شەریعەتی ئیسلام هەڵوەشێنەرەوە و سڕەرەوەی شەریعەتەکانی پێش خۆیەتی. ئەگەر پێغەمبـەرانی نەتەوەکانی تـر زینـدوو بوایـەن، ئـەوا بێگومـان باوەڕیـان بـە پێغەمبـەری خۆمـان

---

٥ تەماشای: مناهج المفسرين، ل٨٠ بكە. التفسير والمفسرون، بەرگی یەك ل١٦٥.

٦ راجع ما ورد في قوله تعالى: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً) (الأحزاب : ٤٥ ) تفسير ابن كثير، ٢٥٣/٢. وراجع: صحيح البخاري: ١٦٩/٦.

٧ راجع ما رواه الطبراني عن الملائكة وتفسيره، ٣٤٤/١.

٨ راجع ما نبه اليه ابن كثير في تفسيره عن (هاروت وماروت)، ١٣٨/١.

٩ راجع ما نبه اليه ابن كثير في تفسيره عن (بناء بيت المقدس)، ٢٥/٣.

دەهێنا، بەڵکو کاتی خۆی موژدەیان داوە بە هاتنی موحەممەد (ﷺ) و داوایان کردووە لە نەتەوەکانیان بە ملکەچبوون و باوەڕی پێ بهێنن، بەڵام جوو و دیانەکان بێباوەڕ بوون پاش ئەوەی ڕاستییان بینی، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە دروست نییە گێڕانەوەی هەواڵە ئیسرائیلییەکان و بە بەڵگە هێناوەیان بۆ پەند و ئامۆژگاری، بەڵکو ئەم کارە ڕێگەپێدراوە - هەروەك پاش کەمێك دەیبینین - چونکە قورئانی پیرۆز چیرۆکی پێغەمبەران بە کورتی دەگێڕێتەوە و تەنها ئەوە باس دەکات کە جێگەی پەندە و باسی بەشەکانی ناکات، بەڵام تەورات و ئینجیل لە هێنانی چیرۆکەکاندا هەموو بەشەکانی بابەتەکان باس دەکەن، ناو و بەرواری ڕووداو و شار و .... هتد، دێنن و هەرچییەك پەیوەندیی بە گۆشە و قوژبنەکانی چیرۆکەکانەوە هەبێت، باسی دەکەن. هەروەك دەزانین هەریەك لە تەورات و ئینجیل باسی زۆر شت دەکەن، کە قورئانیش لەبارەیانەوە دوواوە، کە دیارە بەرگرێکی شەرعی لە گێڕانەوەی ئەمانەدا نییە، ئەگەر لەگەڵ ڕێسا و بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامدا دژنەوەستن، دژایەتییان نەبێت لەگەڵ وێڵی ساغدا، واتە دەبێت لەلایەن شەرع و عەقڵەوە وەرگیراو و پەسەند بێت[10].

بەڵام ئەو فەرموودەیەی کە پێشەوا ئەحمەد بە سەنەدی خۆی گێڕاویەتییەوە لە فەرموودەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە، کە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا بە نووسراوێك کە دەستی کەوتبوو لە لایەن هەندێ لە ئەهلی کیتابەوە و خوێندییەوە بەسەر پێغەمبەری خوادا و پێغەمبەریش (ﷺ) تووڕە بوو و فەرمووی: ئایا سەرسامن لەوەی لەو نووسراوەدا

[10] هەروەك گۆڕین و دەستتێوەردانی تەورات و ئینجیلیان خستووەتە بەرچاو، ئەگینا هەموو ئاینە ئاسمانییەکان عەقڵ پەسەندیان دەکات. هەمدیس ئاینە ئاسمانییەکان لە گێڕانەوەی چیرۆك و ڕووداوەکاندا جیاوازییان نییە، چونکە هەموویان لە یەك سەرچاوەوەن.

هەیە ئەی کوڕی خەتتاب؟ سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەم ئایەتەم بۆ هێناون بە سپیەتی و خاوێنی و پرسیار مەکەن لێیان (واتە ئەهلی کیتاب) لەبارەی هیچ شتێکەوە، ئەوان راستیتان پێ بڵێن و ئێوە باوەڕتان پێی نەبێت، یان ناڕاستتان پێ بڵێن و ئێوەش باوەڕی پێ بکەن. سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر موسا زیندوو بوایە بواری نەبوو، دەبوایە شوێنی من بکەوتایە[11]. ئەم فەرموودەیە دژی ئەوەی لەمەوپێش وتمان ناوەستێتەوە، لەبەرئەوەی ئەو بەرگری و یاساغکردنە لێرەدا هاتووە لە سەرەتای ئیسلامەوە بووە و پێش جێگیربوونی بڕیارە ئیسلامییەکان بووە. زانای فەرموودەناس، پێشەوا ئیبن حەجەر لە (فتح الباري)دا فەرموویەتی: (ئەم یاساغکردنە (نەهیکردنە) پێش جێگیربوونی بڕیارە ئیسلامییەکان و ڕێسا و یاسا ئایینییەکان بووە، لە ترسی ئاژاوە و کێشەی بیروباوەڕی، جا کاتێك ئەم هۆکارە نەما، واتە فیتنە، ڕێگە درا بە گێڕانەوە لە ئەهلی کیتابەوە، بەتایبەتی لە بیستنی ئەو هەواڵانەی کە لە سەردەمی ئەواندا سوودی پەند وەرگرتنی هەبوو)[12]. دەگونجێ بەو قسەیەی کە (ابن بطال) لە موهەلەبەوە گوێزاویەتییەوە، ئەم دژبەیەکبوونە نەهێڵین کە گومانی لێ دەکرێت، کە دەڵێ: ئەم قەدەغەبوونە لە گێڕانەوە و پرسیارکردنە لە شتێکدا کە دەقی لەبارەوە نییە، لەبەرئەوەی ئایینی ئێمە تەواوە، تەنانەت ئەگەر دەقێکی تێدا نەبێت ئەوا لە وردبوونەوە و بەڵگەکاریدا پێویستیمان بە پرسیار لێکردنیان نییە، هەروەها ناچێتە ناو بازنەی یاساغکردنەوە و پرسیارلێکردنیان لەبارەی ئەو هەواڵانەوە کە پشتڕاستی

[11] مسند الإمام أحمد، ب٣، ل٣٨٧.

[12] فتح الباري، ب٦، ل٣٢٠.

ئاینەکـــەیان دەکەنـــەوە، هـــەروەها ئـــەو هەواڵانـــەی کـــە لـــەبارەی نەتـــەوە رابوردووەکانەوە دەدەوێن[١٣].

کەواتە هەواڵە ئیسرائیلییەکان ـ بەشێوەیەکی گشتی ـ دابەش دەبـن بـۆ سـێ بەش، کە ئەمانەی خوارەوەن:

**بەشی یەکەم:** ئەو بەشەیە کە ساغییەکەی (صحته) زانـراوە، بـەوەی کـە لـە پێغەمبەرەوە گوێزراوەتـەوە بـە گوێزرانەوەیـەکی سـاغ و دروسـت، ئـەوەش وەك: دیاری کردنی هاوڕێکەی موسـا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) کـە نـاوی (خضر)ەو بێگومان ئەم ناوە بە راشکاوی لەسـەر زمـانی پێغەمبـەر ﷺ هـاتووە، هەروەك لای بوخاری دەبینرێت[١٤]. یان گەواهێکی شـەرعی پشـتگیریی لێـدەکات، ئەم بەشە ساغ و دروست و وەرگیراو و پەسەندە.

**بەشی دووەم:** ناڕاستی و درۆینەبوونی ئاشکرا و زانراوە بەوەی دەچێ بە گـژ یاسا شەرعییەکاندا یان لەگەڵ وێڵدا (عـەقڵ) رێکناکـەوێت. وەك ئـەو گێڕانەوانـەی کە شکۆ و ڕێزی پێغەمبەران لەکەدار دەکات و گونجاو نییە لەگەڵ پایـەی ئەوانـدا. ئەم بەشە دروست نییە وەربگیرێت و بگێڕدرێتەوە.

**بەشـی سـێیەم:** بێـدەنگیی لـێ کـراوە، نـە لـە بەشـی یەکـەم، نـە لـە بەشـی دووەمە. ئەم بەشە هەڵوێستەی لەسەر دەکەین، نە باوەڕی پێ دێنین، نە بە درۆی دەزانین. دروستە گێڕانەوەی لەبەر فـەرمودەی پێغەمبـەر ﷺ ((لا تصـدقوا أهـل الكتاب ولا تكذبوهم، وقولوا آمنا بالله وما أنزل إلينا ـ الآية))[١٥].

زۆربەی ئەم بەشە هیچ سوودێکی تێدا نییە کە پەیوەندیی بە ئاینەوە هـەبێ، ئەوەش وەك ئەو گێڕانەوانەی کە لەوانـەوە (جـوو و دیانـەکان) هـاتووە لـە باسـی

---

[١٣] سەرچاوەی پێشوو، ب١٣، ل٢٥٩.

[١٤] صحيح البخاري، ب٤، ل١٧٥٢.

[١٥] بوخاری بە سەنەدی خۆی گێڕاویەتییەوە، ب٤، ل٩٦٣، ژمارە (٤٢١٥).

یارانی ئەشکەوت (أصحاب الکهف) و رەنگی سەگەکەیانەوە، عەساکەی موسا پێغەمبەر کە لە چ دارێك بووە، ناوی ئەو باڵدارانەی کە خودا زیندووی کردنەوە بۆ ئیبراهیم پێغەمبەر (د.خ) .... جگە لەمانەش کە خودا بە نادیاری لە قورئاندا هێناویەتی (باسی کردووە) و هیچ سوودێك لە دیاریکردنیدا نییە بۆ ئەوانەی داوای شەرع دەیانگرێتەوە (المکلفین)، نە بۆ ژیانی، نە بۆ رۆژی دواییان.[١٦]

ئەم گێڕانەوانەش ئەگەر هێنران، تەنها بۆ بەڵگەهێنانەوەیە نەك باوەڕپێبوون[١٧]. پاشان ئەگەر هەر کاتێك شتێك لەم جۆرە هات ـ واتە ئەو بەشەی کە شەرع لێی بێدەنگیی کردووە و هیچی لەبارەیەوە نەوتووە، نە بە پشتگیری و نە بە دانەدواوەی ـ لە یەکێك لە هاوەڵانەوە (الصحابة)، بە رێگەیەکی ساغ و دروست، ئەگەر بەبێ گومانی باسی کردبوو، ئەوا وەك بەشی یەکەم وایە، وەردەگیرێت و نادرێتە دواوە، لەبەرئەوەی ئەقڵ نابینرێ و پەسەندی ناکات کە لە (جوو و دیانەوە) وەری گرتبێت، لە پاش ئەوەی کە زانیبێتی کە پێغەمبەر ﷺ یاساغی کردبێت. ئەگەر بەبێ گومانی باسی نەکردبێت، واتە بە جەزم نەیهێنابێ، ئەوا دەروون ئارامترە لە وەرگرتنیدا، لەبەرئەوەی ئەو ئیحتیمالەی کە ئەو هاوەڵە لە پێغەمبەرەوە بیستبێتی، یان لە کەسێکەوە کە لە پێغەمبەریەوە بیستووە، بەهێزترە لە ئیحتیمالی بیستن لە ئەهلی کیتابەوە، بەتایبەتی کە هاوەڵان کەمتر شتیان لە ئەهلی کیتابەوە وەرگرتووە لەچاو شوێنکەوتووان و پاش ئەوانەوە.

بەڵام ئەگەر شتێك لەم گێڕانەوەدا لە هەندێ شوێنکەوتووی هاوەڵانەوە هات، ئەوە لەو جۆرەیە کە هەڵوێستەی تێدا دەکرێت و بڕیاری لەبارەوە نادرێت، نە بە راست نە بە درۆ. ئەمەش لەبەر هێزی ئەگەری بیستن لە جوو و دیانەکانەوە (أهل الکتاب). لەبەرئەوەی بەوە ناسراوە کە لەوانەوە زۆر شت وەردەگرن و دوورە

---

[١٦] بۆ درێژەی باسەکە تەماشای کتێبی (التفسیر و المفسرون) بکە، ب١، ل١٧٩.

[١٧] بڕوانە نووسراوی (البغوي ومنهجه في التفسیر) ل١٠٨.

لەوەی کە لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بیسرا بێت. ئەمە لە کاتێکدایە کە هەموو زانایانی راڤەی قورئان یەکدەنگ نەبن لەسەری. بەڵام ئەگەر یەکڕابوون لەسەری، ئەوا زۆر دوورە لەوەی کە لە جوو و دیانەکانەوە بیسترا بێت. لەم کاتەدا دەروون بە ئارامی وەری دەگرێ، واتە ڕادێ لەگەڵیدا و پێی ئارام دەبێت[18].

هەندێ کەس وا گومان دەبات کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگای کردووەتەوە بۆ گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان و مۆڵەتی داوە بە گێڕانەوەیان بەشێوەیەکی رەها، بە بەڵگەی ئەو فەرموودە ساغە (صحیح) کە لە پێغەمبەرەوە هاتووە: (بلغوا عني ولو آية. وحدثوا عن بني اسرائيل ولا حرج ومن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار)[19]. واتە: لە نوێنەرایەتی منەوە بیگەیەنن با ئایەتێکیش بێت و بگێڕنەوە لە بەنی ئیسرائیلەوە و هیچ خراپییەك لەمەدا نییە و کەسێك درۆم بەدەمەوە بکات، بە ئەنقەست، ئەوا با جێگەی خۆی لە ئاگردا خۆش بکات.

ئەمانە کە بەم جۆرە لەم فەرموودەیە تێگەیشتوون، راستیان نەپێکاوە، لە مەبەستی فەرموودەکە نەگەیشتوون. لەبەرئەوەی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە دروستە ئەو شتە سەیر و سەمەرانەی لە بەنی ئیسرائیلەوە رووی داوە بگێڕدرێتەوە، لەبەرئەوەی ئامۆژگاری و پەندیان تێدا هەیە، ئەمەش بەو مەرجەی کە بزانن درۆ نییە. لەبەرئەوەی عەقڵ رێگە نادات کە پێغەمبەر ﷺ رێگە بدا بە گێڕانەوەی درۆ. بەپێی ئەمە دژایەتی نامێنێت لە نێوان فەرمودەی: (حدثوا عن بني اسرائيل ولا حرج) و فەرموودەی: (تصدقوا أهل الكتاب ولا تكذبوهم).

ئیبنو حەجەر لە (فتح الباري)دا لە لێکدانەوەی فەرموودەی یەکەمدا[20] فەرموویەتی: شافیعی فەرموویەتی: شتێکی ئاشکرایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[18] تەماشای (مقدمة في أصول التفسير) ل١٣، ل٢٦ـ ٢٧ بکە.

[19] بوخاری لە سەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە، بەرگی١، ل٥٢، ژمارەی فەرموودە: ١١٠.

[20] فتح الباري، ٦/٣٢٠.

ڕێگــە نــادات فــەرموودەی درۆینــە بگێڕینــەوە، واتاکــە: بگێڕینــەوە لــە بــەنی ئیسرائیلەوە ئەو شتانەی کە دەزانن درۆ نـین، بـەڵام ئـەوەی کـە درۆ هەڵـدەگرێ، ئەی ئێوە ئەوا دەتوانن بیانگێڕنەوە؟ کە ئەمەش هاوتـای فـەرموودەی پێغەمبـەر: (إذا حـدثكم أهـل الكتـاب فـلا تصـدقوهم ولا تكـذبوهم) ڕێگـەدان یـان سـاغکردن نەهاتووە لەبارەی شتانێکەوە کە ڕاستن.

بەڵام فەرموودەی دووەم مەبەست لێی هەڵوێستەکردنە لەو شتانەدا کە (جـوو و دیانەکان) دەیگێڕنەوە، لەو شتانەی ڕاسـت و درۆ هەڵـدەگرێ، لەبەرئـەوەی لەوانەیـە ئەوانـە ڕاسـت بێـت بـە درۆی دادەنـێن، یـان درۆ بێـت بەڕاسـتی دادەنێـت، بەمـەش دەکەونـە ناڕەحەتییـەوە، بـەڵام ئـەوەی کـە پێچـەوانەی بەرنامـەی ئێمەیـە، ئێمـە دەتوانین بـە درۆی بخەینـەوە، بـەڵام ئـەوەی گونجـاوە لەگـەڵ ئیسـلامدا ئـەوا ئێمـە ڕێگەپێدراوین لە باوەڕپێکردندا.

ئـیبن حەجـەر لـە لێکدانـەوەی ئـەم فەرموودەیـەدا (لا تصـدقوا اهـل الكتـاب ولا تكـذبوهم) دەفـەرموێ: واتــە ئەگــەر ئــەوەی هــەواڵتان پــێ دەدەن لەوانەیــە، یــان هەڵدەگرێ کە لـە ڕاسـتدا ڕاسـت بـن، ئێـوە بـە درۆی بـزانن، یـان درۆ بـن، ئێـوە بـە ڕاستیان بزانن و تووشی ناڕەحەتی ببن. یاساغکردن نەهاتووە لە بـەدرۆزانینیان لـەو بابەت و گێڕانەوانەدا کـە پێچـەوانەی شـەریعەتی ئیسـلامن، لـە باوەڕپێکردنیـان لـەو گێڕانەوە و بابەتانەدا.

پێشـەوا شـافیعی لەسـەر ئـەم بابەتـە هۆشـداریی داوە، پاشـان فـەرمووی .... هەرچییەك لە زانایانی پێشینەوە هاتبن لەسەر ئەم بارە هەڵدەگیرێ[٢١]، کەواتـە ئـەو تەرازووەی ڕاستی و ناڕاستی ئیسـرائیلیاتی پـێ دەزانـرێ، ئەوەیـە دەبـێ بـە چـاوی ڕەخنەسازییەوە تەماشا بکرێ، لەژێر تیشـکی (ڕۆشـنایی) ئـەو دەقـە ئیسـلامییانەدا لەبارەی ئەو بابەتانەوە هاتوون.

---

[٢١] فتح الباري، ب٨، ل١٢٠.

# جیٚباسی دووەم:
# هۆکارەکانی هاتنەناوەوەی ئیسرائیلیات بۆ ناو ڕاڤەی قورئان و شوێنەوارە خراپەکانی لەسەر نەتەوەی ئیسلامی

## باسی یەکەم:
## هۆکارەکانی هاتنەناوەوەی ئیسرائیلیات بۆ ناو ڕاڤەی قورئان

کۆمەڵێك هۆکار هەن فاکتەرن لە وەرگرتنی ئیسرائیلیاتدا و هاتنە ناوەوەیان بۆ ناو ڕاڤەی قورئان. بێگومان تەورات و ئینجیل زۆر شتیان باس کردووە لەوەی کە لە قورئاندا باس کراوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندییان بە چیرۆکی پێغەمبەرانەوە هەیە، کە ئەوەش بە جیاوازییەکەیەوە لە کورتی و درێژیدا، قورئان تەنها باسی ئەو شوێنانە دەکات لە چیرۆکەکاندا کە جێگەی پەند و ئامۆژگارین و باسی لایەنە جوزئییەکانی بابەتەکان ناکات، لە کاتێکدا تەورات و ئینجیل بە پێچەوانەوە، هەموو لایەن و قوژبنی چیرۆکەکان باس دەکات. لەبەر ئەم هۆکارە موسڵمانان دەگەڕانەوە لای (جوو و دیانەکان) و پرسیاریان لیٚ دەکردن لەبارەی ئەو شتانەوەی کە قورئان پێچابوونیەوە و باسی نەکردبوون و جوو دیانەکانیش (أهل الكتاب)یش بە رۆڵی خۆیان وەڵامی پرسیارەکانیان دەدانەوە و رۆشنبیریی ئاینیی خۆیانیان بۆ دەگوێزانەوە (پیٚ دەوتن)[٢٢].

دەتوانین بڵێین بیٚ گومان هاتنی ئیسرائیلیات بۆ ناو راڤەی قورئان، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەم و چاخی هاوەڵان. لەبەرئەوە هاوەڵ (صحابی) ئەگەر تووشی چیرۆکێك لە چیرۆکەکان بهاتایە، حەزی دەکرد کە لەبارەی هەندیٚ لایەنی شاراوەی ئەو چیرۆکەوە کە قورئان لێی نەدوواوە و باسی نەکردووە، زانیاریی هەبێت، کەسی دەستنەدەکەوت کە وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە جگە لەو

---

[٢٢] التفسير والمفسرون، ب١، ل١٦٩.

کەسانە نەبێت کە هاتوونەتە ناو ئاینی ئیسلامەوە و لەگەڵ خۆیاندا رۆشنبیریی ئاینییان هێناوە و هەواڵ و چیرۆکی ئاینییان بڵاوکردووەتەوە)[٢٣]. جگە لەوە کە هاوەڵان (رەزای خوا لە هەموویان بێت) لەبارەی هەموو شتێکەوە پرسیاریان لێنەکردوون، هەموو شتێکیان لێ وەرنەگرتوون، بەڵکو پرسیاریان لە شتێ دەکرد کە لە روونکردنەوەی چیرۆکێ یان شتێکی نادیاری ناو قورئان زیاتر نەبوو. سەرەڕای ئەوەش هەڵوێستەیان لەسەر ئەو شتانە دەکرد کە پێیان دەوترا و بڕیاریان بەسەردا نەدەدا، نە بە باوەڕپێکردن (ڕاست زانین) یان بە درۆ زانین، مادام هەردوو بارەکەی هەڵدەگرت. هەروەك لەبارەی ئەو شتانەوە کە پەیوەندییان بە بیروباوەڕ و بڕیارەکانەوە هەبوو، پرسیاریان لە جوو و دیانەکان نەدەکرد، ئەگەر وەکو بە بەڵگەکردن و پشتگیری کردنێك بۆ ئەو باسانەی کە لە قورئاندا هاتوون، هەروەها لایان نەدەدا لە فەرموودەی راستی پێغەمبەر بۆ پرسیار کردن لە جوو و دیانەکان (أهل الکتاب). هەروەك پرسیاریان نەدەکرد لەبارەی ئەو شتانەوەی کە پرسیار لەبارەیانەوە لای ئەوان بەبێ هودە و کات کوشتن دەدرایە قەڵەم، وەك پرسیار کردن لەبارەی رەنگی سەگەکەی یارانی ئەشکەوت و ئەندازەی کەشتییەکەی نوح، جۆری دارەکە، .... هتد[٢٤].

بەڵام شوێنکەوتووانی هاوەڵان (تابعین) بە فراوانی لە جوو و دیانەکانەوە شتیان وەرگرتووە. لەبەرئەوە لە سەردەمی ئەواندا گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان لە راڤەی قورئاندا بەدی دەکرێت[٢٥].

لە هۆکارەکانی وەرگرتنی ئیسرائیلیات و تێکەڵبوونی لەگەڵ راڤەی قورئاندا، ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ رێگەی دا بە گێڕانەوەی لەوانەوە، دوای ئەوەی

---

[٢٣] هەمان سەرچاوە، ب١، ل١٦٩.

[٢٤] بروانە التفسیر والمفسرون، ب١، ل١٧٠.

[٢٥] بروانە سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل١٧٥.

هۆشداریی ئەوەی دا کە باوەڕ بهێنن بەوەی کە پێچەوانەی ئاینی ئیسلامە و ئاگاداری کردووینەتەوە کە ئەو گێڕانەوە و هەواڵانە هەڵوەشێنراونەتەوە و هەرشتێکیش جگە لەمانە بێ، موسڵمانان ترسیان نییە لە گێڕانەوەی[٢٦].

لەو هۆکارانە: ئاگاداربوونی هەندێ لە موسڵمانان لە پەرتووکی ئاینە پێشووەکان. ئەوەتا عەبدوڵڵای کوڕی کوڕی عەمری کوڕی عاص، تەورات و ئینجیلی خوێندووەتەوە و هەندێ شت لەوەوە گێڕدراوەتەوە کە پەیوەندیی بە چیرۆك و هەواڵی فیتنە و رووداوەکانی دوارۆژەوە هەیە و دەوترێ گوایە لە جوو و دیانەکانەوە وەریگرتووە[٢٧]. هەروەها زۆرێك لە گێڕدراوە ئیسرائیلییەکان کە کەوتوونەتە ناو راڤەی قورئانەوە، لەسەر دەستی ئەوانەدا بووە لە جوو و دیانەکان کە موسڵمان بوون. هەروەك ئاشکرایە کە گرووپێك لە زانایانی جوو و دیانەکان هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە و زۆر لە هاوبەشدانەرانی عەرەب کە زۆرێك لە زانیارییەکانیان لە زانایانی جووەوە وەرگرتبوو، ئەوانە زانییان هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتبوو، بەتایبەتی لەو بوارانەدا کە پەیوەندیی بە هەواڵ و ئامۆژگارییانەوە هەبوو کە رادەربڕین تێیاندا لەسەر دەقێك لە لایەن پێغەمبەرەوە نەوەستابوو، ئەوان چیرۆکە کورتکراوەکانیان درێژ کردەوە و هەواڵی رووداوە گەورەکانیان فراوان دەکرد، نموونەی ئەوەش پاش سەردەمی پێغەمبەر بوو، بەپێ ئەو بارەی کە لە بیر و هۆشیاندا گیرسابوو لە زانیارییە ئیسرائیلییەکەیان کە لەو کاتەدا رەمەکی خەڵکی رووی تێدەکردن بۆ گوێگرتن لە هەواڵەکانیان[٢٨]. هەندێك لە موسڵمانان هاتوچۆی جولەکەکانیان دەکرد و پرسیاریان لێ دەکردن لەبارەی ئەو شتانەوەی کە لایان بوو، هەروەها کۆمەڵێك

---

[٢٦] بڕوانە: مناهج المفسرين ل٨٢.

[٢٧] حلية الاولياء، ب١، ل٢٨٦. الإتقان في علوم القرآن، ب٢، ل١٨٩ـ ١٩٠.

[٢٨] مجمع البيان في تفسير القرآن، ب١، ل٥.

لەو موسڵمانانەی راڤەی قورئانیان دەكرد، دەیانووسی بۆ لای جووەكان و پرسیاریان لێدەكردن دەربارەی هەندێ لەو شتانەی كە لە قورئاندا هاتبوون. بێگومان ئەم شێواز و رێگەیە دەگیرایە بەر لەو بوارەدا كە پەیوەندی بە بڕیارەكانی شەریعەت و بیروباوەڕەوە نەبوو، بەڵام لە بواری دیاردە گەردوونییەكاندا بوو كە دەروون ئارەزووی ناسینیانی هەبوو[٢٩].

لەو هۆكارانەی بوونە فاكتەری وەرگرتنی ئیسرائیلیات، بزوێنەوەی یەكەم لە راڤەی قورئاندا پشتی بە گێڕانەوە و گوێزانەوە دەبەست، لەوێدا هیچ بواری كاری هزری نەبوو كە نەرێنی و ئەرێنی دەكات تێیدا، بەڵكو كارەكە دەگەڕایەوە بۆ گێڕانەوەی رووت[٣٠]. بێگومان پشتبەستن بە هێنان و گوێزانەوە لەلایەن راڤەكەرانی قورئانەوە، تووشی هەڵەی زۆری كردن، ئەمەش لەبەرئەوە بوو كە ئەوان لە چیرۆك و رووداوەكانیاندا جیاوازییان نەدەكرد لە نێوان لاواز و قەڵەودا، واتە: چاك و خراپیان نەدەكێشا بە تەرازوی رێساكانی و پێوانەیان نەدەكردن لەگەڵ هاوشێوەكانیاندا و قووڵنەبوونەتەوە تێیاندا بە ئامێری حیكمەت و هەڵوێستەیان نەكردووە لەسەر سروشتی دروستكراوەكان و وردبوونەوە و بەرچاوڕوونییان نەكردووەتە داوەر لە هەواڵەكاندا[٣١].

وا بە باش دەزانین كە دەستەواژەكەی ئیبن خەلدون بهێنین لە پێشەكییەكەیدا (المقدمە)، تا بۆمان روونبێتەوە كە هۆكاری ئەم گێڕانەوە زۆرانە لە ئیسرائیلیات چییە؟ چۆن دزەی كردووەتە ناو موسڵمانان، كە ئەمەش دەقەكەیەتی:

---

[٢٩] الاتجاهات الفكرية، ل٢٤٣، تەماشای جامع البيان في تفسير القرآن ب١، ل١١٧ بكە.

[٣٠] نشأة التفسير في الكتب المقدسة والقرآن، ل٢٥.

[٣١] المقدمة لان خلدون، ل٩.

"عەرەبە پێشینەکان لە راڤەی قورئاندا وتەی جوو و دیانەکانیان کۆکردووەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نووسراوە گوێزراوەکانیان باش و خراپی تێدایە و وەرگێراو و دراوەدواوەی گرتووەتە خۆ، بەهۆی ئەوەوە کە نەتەوەی عەرەب خاوەنی پەرتووك و زانیاری نەبوون، بەڵکو بارودۆخی دەشتەکیبوون و نەخوێندەواری زاڵبوو بەسەریاندا و هەرکاتێك حەزیان لە ناسینی شتێك بوایە، لەو شتانەی کە دەروونی مرۆڤ حەزی پێ دەکات، لە هۆکارەکانی ئافراوەکان یان سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر و نهێنییەکانی بوون، پرسیاریان لە جوو و دیانەکانی (أهل الکتاب) پێش خۆیان دەکرد و زانیارییان لەوانەوە بەدەستدەهێنا، کە ئەوان خاوەنی تەورات بوون لە جولەکەکان و ئەو کەسانەیش بوون لە عەرەبە دیانەکان کە شوێن ئاینەکەی ئەوان کەوتبوون. خاوەنانی تەوراتیش لە جووەکان، ئەوانەی لە نێو عەرەبەکاندا دەژیان، لەو کاتەدا وەك ئەوان (عەرەبەکان) دەشتەکی بوون و شارەزای تەورات نەبوون و وەك رمەکی (العامة) جوو و دیانەکان نەبێت، کە ئامەنیش زۆربەیان لە (حِمَیر)[٣٢]ەکان کە بە ئاین جوو بوون و کاتێك موسڵمان بوون لەسەر هەندێك لەو بۆچوون و باوەڕانە مابوونەوە کە پەیوەندیدار نەبوون بە بڕیارە شەرعییەکانەوە، وەك باسەکانی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر و رووداوە گەورە و داستانە گەورەکان و وێنەی ئەوانە. ئەو کەسانەش وەك (کعب الأحبار) و عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و وەهەبی کوڕی مونەبیھ و وێنەی ئەمانە راڤەی قورئان پڕ بووە لە قسە و گێڕانەوەی ئەم کەسانە، لە وێنەی ئەم مەبەستانە هەواڵگەلێکی زۆرمان هەیە کە ئەم زانایانە خاوەنینی و هەروەك وتمان پەیوەندییان بە بڕیارە شەرعییەکانەوە نییە تا بە شوێن ڕاستییاندا بگەڕێین، کە پێویستە بۆ کارپێکردنیان، ڕاڤەکەرانی قورئان لەمەدا زۆر پێداگیرییان نەکردووە و پەرتووکەکانیان پڕکردووە لەمانە، کە بێگومان

---

[٣٢] حمیر: هۆزێکی کۆنی وڵاتی یەمەنە.

سەرچاوەیان (ئەم گێڕاوانە) لە خاوەنانی تەوراتەوە بووە کە دەشتەکی بوون و هیچ لێکۆڵینەوەیەکیان لەبارەی ئەم قسە و گێڕانانەوە نەکردووە، بەڵام لەبەرئەوەی شۆرەت و شکۆ و پایەیان هەبووە، قسە و گێڕانەوەکانیان جێگەی متمانە بووە و وەرگیراوە[٣٣].

## باسی دووەم:

## ئیسرائیلیات و کاریگەرییە خراپەکانی لەسەر نەتەوەی ئیسلامی

بێگومان ئەو ئیسرائیلیاتانەی کە راڤەکەرانی قورئان لە جوو و دیانەکانەوە وەریان گرتووە و پەرتووکی خوایان پێ لێکداوەتەوە، کاریگەرییەکی خراپی لەسەر راڤەی قورئان هەبووە، لەبەرئەوەی گێڕانەوە و هێنانی ئەم ئیسرائیلیاتانە وەك لە سەردەمی هاوەڵان نەمایەوە، بەڵکو فراوانتر بوو و هەرچییەك بیانوتایە قسەی دیان و جووەکانە (أهل الكتاب) دەگێڕدرایەوە، ئەگەر راست یان درۆ بوایە. زۆرێك لەم جۆرانە هاتنە ناو راڤەی قورئانەوە کە خۆیان لە چیرۆکە خەیاڵییە هەڵبەستراوەکاندا دەنواند، وای دەکرد لەو کەسەی ئەگەر سەیری پەرتووکی راڤەکانی قورئانی بکردایە کە بەم شێوەیە بوایە، هیچی لێ وەرنەدەگرتن و متمانەی نەبوو پێیان، لەبەرئەوەی باوەڕی وابوو کە هەموو لە یەك دۆڵەوەن. ئەوەی راستی بێ ئەوانەی زۆر لەم گێڕانەوە ئیسرائیلیاتانەیان هێناوە، گومانیان لە رێگەی سەرگەرمبووواندا بە راڤەی قورئانەوە دروست کرد و زۆرێك لە هەواڵە راستەکانیان لەگەڵ هەواڵ و چیرۆکە ناڕاستەکاندا تێکەڵ کرد، هەروەك دانەپاڵی ئەم ئیسرائیلیاتە کە کەمێکی لەوانەیە دروست بێت، بۆ لای هەندێ لە جوو و

---

[٣٣] مقدمة ابن خلدون، ل٤٩٠ـ ٤٩١.

دیانەکان، کە باوەڕیان بە ئاینی ئیسلام هێناوە، وای کردووە لە هەندێ لە خەڵکی کە بە چاوی تۆمەت و گومانەوە تەماشایان بکات[٣٤].

لەو شوێنەوارە خراپانەی کە گێڕاوەی ئیسرائیلیات لەسەر نەتەوەی ئیسلامی بەجێی هێشت، بڵاوکردنەوەی هەندێ بیری (یەهودی) بوو لەناو کۆمەڵگەی موسڵمانانندا، لەو هزر و بیرۆکانە:

(التشبیه والتجسیم) بوو واتە: چوواندن و بڕیاردانی ئەندام و لەش بوو بۆ خودا. هەروەك (شەهرستانی) ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە تەورات پڕە لە لێکچووەکان (المتشابهات)، وێنە (الصورة).

(والمشافهة) قسەکردن بە زار و زمان و (ولیتکلم جهرا) قسە لەگەڵ کردن بە ئاشکرایی، (النزول علی طور سیناء انتقالاً) هاتنەخوارەوە و دابەزین لەسەر شاخی توور لە سینا، وەك دابەزینی مرۆڤ لە شاخ، (الاستقرار علی العرش) جێگیربوون لەسەر عەرش بەجێگیربوونی وەك مرۆڤ لەسەر کورسی، (جواز الرؤیة فوقا) گونجانی بینینی لەسەرەوە.[٣٥] ئەم دەستەواژانە و وێنەی ئەمانە کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی باوەڕی کۆمەڵێك لە جولەکە هەبوو، بە چوواندن و بڕیاردانی لەش و ئەندام (التشبیه والتجسیم) تا وای لێهات چواندن بووە سروشت و مۆرکی باوەڕیان و وتیان چاوەکانی ئێشیان کرد و فریشتەکان چوونە سەردانی و گریا بە هۆی لافاوەکەی نوحەوە، تا چاوەکانی هاتنە ئێش، عەرش لەژێر پێیدا جیڕە و هاواری دی وەك چۆن مرۆڤێك لەژێر باری قورسدا دەنوکێنێ. هەروەها وتیان خوا لە شێوەی پیرێکدایە و لەسەر کورسییەك دانیشتووە و فریشتەکانیش لەبەردەمیدا وەستاون و کتێبەکانیش لە خزمەتیدا دەخوێنرێنەوە[٣٦].

---

٣٤ التفسیر والمفسرون، ب١، ل١٧٩.

٣٥ الملل والنحل، بەشی یەکەم، ل٤٩٤.

٣٦ تەماشای (الجدال بین المسلمین والنصاری) بکە ل١٩٠ـ ١٩١.

هەندێ لە بیریاران و بیرمەندان پێیان وایە کە ئەم بیرۆکە یەهودییە چووێنەرانە، هەندێ لەو جووانەی کە موسڵمانیی خۆیان نیشانداوە، لە نێو موسڵماناندا بڵاویان کردووەتەوە و هەندێ هەلومەرج و هۆکاریش یارمەتیدەربوون بۆ وەرگرتنیان، تاکو ببنە ئاراستەی بیری و دروشمی هەندێك گرووپی ئیسلامی.

سەرەتای ئاشکرابوونی (سەرهەڵدانی) چوواندن (التشبیە) لە ژینگەی ئیسلامیدا لە چوارچێوەی گرووپێك لە شیعە (شوێنکەوتووی) توندڕەودا بوو، وەك ئیبن سەمعان کە دەڵێ: خوا ئەندام و لەشی هەیە. هیشامی کوڕی حەکەم و هیشامی کوڕی سالمی جەوالیقی و ئەبو جەعفەری ئەحوەل، کە بە شەیتانی تاق (الشیطان الطاق) بانگ دەکرا، کە وەك زانراوە ئەمانە لەژێر هەژموون و کاریگەریی تەوراتدا بوون[٣٧]. ئەوانە و وێنەی ئەوان دەڵێن: کە خوا باڵا و شێوەی هەیە و دەجوڵێ و دەوەستێ و نزیکدەکەوێتەوە و دووردەکەوێتەوە و سووك دەبێ و قورس دەبێ، زانیارییەکەی پەیدا بووە (محدث)، لەمەوپێش زانا نەبووە و پاشان بووەتە زانا[٣٨].

شەهرستانی دەڵێ: گومان و قسەی شیعە توندڕەوەکان لە ئاینزا و پەیڕەوی جولەکە و دیانەکانەوە سەریهەڵداوە، لەبەرئەوەی جووەکان خوایان دەچوواند بە دروستکراوەکان و دیانەکانیش بە هەمان شێوە و ئەم گومان و قسانە لە زەینی شیعەکاندا کاری کرد، بە جۆرێك کە ئەمانیش هەندی تایبەتمەندیی خوایەتییان بڕی بەسەر هەندێ لە پێشەواکانیان. چوواندن لە بناغە و ئەسڵدا بووە کارێکی شیعەکان[٣٩].

---

[٣٧] تەماشای (اعتقادات فرق المسلمین) بکە ل٣٤ و ٦٣.

[٣٨] تەماشای (الاتجاهات الفکریة في التفسیر) ل٢٧٣ بکە.

[٣٩] تەماشای الملل والنحل، بەشی یەکەم، ل٣٦٤ بکە.

بێگومان چوواندن و ئەندام و لەش بڕیاردان بۆ خوا، کاریگەریی لەسەر تێگەیشتنی هەندێ لە گرووپەکانی شیعە هەبوو لە کاتی ڕاڤەکردنی قورئاندا و بەنانی کوڕی سەمعان، سەرکردی گرووپی (بنانیة)ی شیعە، دەڵێ: خوا و پەرستراوەکەی لەسەر شێوەی مرۆڤە، هەمووی لەناودەچێ بێجگە لە دەموچاوی و ئەم ئایەتەی بە وتەی خۆی تەئویل کردووە (کل شيء هالك الا وجه)[40]. واتە: هەموو شتێ لەسەر زەوی لەناودەچێ و نامێنێ، زاتی پەروەردگاری خاوەن و شکۆ و ڕێزی تۆ دەمێنێتەوە. یونسی کوڕی حەبیبیش دەڵێ: گوایە کە خوا فریشتەکانی هەڵگری عەرش هەڵی دەگرن، ئەم ئایەتەشی کردە بەڵگە: (ویحمل عرش ربك فوقهم يومئذ ثمانية)[41][42] هەروەها بەردەوام..

یەکێك لەو ڕاڤەکارانەی قورئان کە باوەڕی بە (ئەندام و لەش) بڕیاردان بۆ خوا هەیە، موقاتیلی کوڕی سولەیمانی بەڵخی، ساڵی (١٥٠ ك) کۆچی دوایی کردووە. ئەم زانایە لە تەفسیرەکەیدا پابەندی ئەم فیکرەیە بووە و کردوویەتییە ڕێبازێکی خۆی و پێشیان دەڵێت، لەم بڕەدا کاریگەریی جوو و دیانەکانی لەسەر بووە[43]. لە پەرتووکی (میزان الإعتدال)دا هاتووە: موقاتیلی کوڕی سولەیمان

---

[40] سورەتی (القصص) ئایەتی ژمارە (٨٨).

[41] سورەتی (الحاقة) ئایەتی ٢٧.

[42] الفرق بين الفرق، ل٥٣.

[43] هەندێك لە توێژەرەوەکان دەڵێن: دەیسەلمێنین کە چوواندن لای یەهودەکان هەبووە پێش ئەوەی لە ژینگەی ئیسلامیدا هەبووبێ. دەیسەلمێنن کە زۆربەی ئەوانەی لە ئیسلامدا باوەڕیان بە (تشبیه) هەبووە، لە (شیعە یانزەکانن) کە لە بناغەدا جوولەکە بوون. بەڵام ئێمەش دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ئایەتانێکی زۆر لە قورئاندا هاتوون بە ڕواڵەت ئاماژە ـ ئەگەر واتای پیتییان بکرێ ـ بە بیری (تجسیم) دەکەن، کەواتە هیچ نامۆ نییە کە هەندێك لە موسڵمانانی سەردەمی یەکەم باوەڕی بەم بیرە هەبێ، بەهۆی تێگەیشتنی لەم دەقانە (ئایەتانە) لە ڕووی ڕواڵەتی پیتەوە. بێگومان زیادەڕەویمان کردووە ئەگەر بڵێین هزری ئیسلامی کەوتووەتە ژێر هەژموونی هەندێ سەرچاوەی یەهودی کە باوەڕی

زانیاریی قورئانی له جوو و دیانەکانەوە وەرگرتووە و خوای چوواندووە بە دروستکراوەکان[٤٤]. موقاتیل دەڵێ[٤٥]: هەر کەلیمەیەکی (واستوی) کە لە قورئاندا هەیە، واتە: استقر، جێگیر بوو، نموونەش لەسەر ئەمە زۆرە.

هەندێ لە گرووپە ئیسلامییەکان کەوتنە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی گەڕانەوە (الرجعیة) کە لە جوو و دیانەکانەوە پێیان گەیشتبوو. چونکە لەناو جوولەکەدا هەبوو کە گەڕانەوەی بە ڕەوا دەزانی، ئەم قسەیەشیان لە دوو شتەوە وەرگرتبوو:

یەکەمیان: ڕووداوی (عزیر) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) کاتێك کە خودای گەورە (١٠٠) ساڵ مراندی، پاشان زیندووی کردەوە.

دووەمیان: ڕووداوەکەی (هارون) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) کاتێك کە لە کاتی سەرلێشێوانی بەنی ئیسرائیلدا کۆچی دوایی کرد، وتیان موسا پێغەمبەر کوشتوویەتی، وتیان موسا لە ڕژیدا کوشتوویەتی. لەبەرئەوەی جوو‌ەکان (هارون)یان زیاتر لە موسا خۆشدەویست، ڕای جیاوازیان هەبوو لە مردنەکەیدا، هەندێکیان دەیانوت: کۆچی دوایی کردووە و دەگەڕێتەوە. هەندێکی تریشیان دەیانوت: بزربووە و دەگەڕێتەوە[٤٦].

بێگومان عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء بناغەی بیردۆزەی گەڕانەوەی دانا لە نێوان شیعە لە سنوور دەرچوو و توندڕەوەکاندا (الغلاة) و دەیوت:

سەرم سوڕدەمێنێ لە کەسێك کە پێی وایە عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەگەڕێتەوە، باوەڕ ناکات بە گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە حاڵێکدا کە

---

بەم بیرە هەیە، نزیکتر لە ڕاستییەوە ئەوەیە بڵێین کارتێکرانی موسڵمانان لەلایەن یەهودەوە لە شێوازی باسکردنیانە دەربارەی دانپیادانان، یان دانەدواوەی ئەم بیرەیە، هەروەها لە جۆری چارەسەرکردنیانە بۆ ئەم بابەتە لە هەردوو سەریەوە. تەماشای (الجانب الإلهي من الفکر الإسلامي) د. محمد البهي، ل٧٠.

[٤٤] میزان الإعتدال، ب٣، ل١٩٧.

[٤٥] تەماشای (التنبیه والرد علی أهل الأهواء والبدع) ل٧٢ـ ٨٠ بکە.

[٤٦] تەماشای: الملل والنحل، بەشی یەکەم، ل٤٩٥ بکە.

خودا فەرموویەتی: (إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ)[٤٧]. کەواتە موحەممەد ﷺ شایانترە بە گەڕانەوە لە عیسا[٤٨].

بیرۆکەی (الرجعة) گەڕانەوە، شیعە دای نەناوە، یان بیروباوەڕێکی تایبەت بەوان نییە، لەوانەیە بیرۆکەی مەدهیەت کە دەرهاویشتەی بیردۆزەی پێشەوایەیە (الإمامة) کە نیشانەکانی لە باوەڕبوون بە گەڕانەوە خۆی دەنوێنێ، لە کاریگەری جوو و دیانەکان بێت[٤٩]. لە شیعەکاندا ئەوانەی باوەڕیان بە گەڕانەوە هەیە گرووپی (السبئية)ن، کە ئەوانیش ئەو کەسانەن کە لە عەبدوڵلای کوڕی سەبەء کۆبوونەتەوە، کە یەکەم کەس بوو بیرۆکەی (الرجعة) گەڕانەوەی داهێنا. هەروەك گێڕدراوەتەوە کاتێ هەواڵی کۆچی دوایی عەلیی کوڕی ئەبی تالیب گەیشتە عەبدوڵلای کوڕی سەبەء لە مەدائین، وتی بەو کەسەی کە هەواڵەکەی هێنا: درۆت کرد، ئەگەر کەللەسەر و دەماغی بهێنیت لە (٧٠) کیسەدا و (٧٠) شاهیدی دادپەروەر بهێنیت لەسەر کوژرانی، ئەوا بێ گومانین و دەزانین کە کۆچی دوایی نەکردووە و نەکوژراوە. ناشمرێت هەتا نەبێتە خاوەنی سەرزەوی[٥٠].

هەروەك گرووپی سەبەئیە هەستاون بە تەئویلکردنی ئەم ئایەتە (إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ)[٥١]. کۆمەڵێك گرووپی زۆری تری شیعە بەدی دەکرێن لە مێژوودا کە باوەڕیان بە بیروباوەڕی گەڕانەوە هەیە[٥٢].

بێگومان باوەڕبوون بەم بیرۆکەیە دەنگدانەوەی خۆی هەبوو لە بواری ڕاڤەی قورئانیدا، ئەوەتا ڕاڤەکارانی قورئان کە سەر بەم گرووپانە بوون، ئایەتەکانی

---

٤٧ سورەتی (القصص) ئایەتی (٨٥).

٤٨ تەماشای: تأريخ الطبري، ب٥، ل٩٨ بکە.

٤٩ تەماشای: الاتجاهات الفكرية في التفسير، ل٢٨٦ بکە.

٥٠ تەماشای سەرچاوەی پێشوو بکە، ل٢٨٩.

٥١ (القصص: ٨٥ ).

٥٢ تەماشای: (فرق الشيعة) بکە ل٤.

قورئانیان راڤە دەکرد بەپێی ئەو بیروباوەڕەی کە لە بارەی (گەڕانەوە)وە لە زەینیاندا چێنرابوو. بۆ نموونە (طبرسي) لە راڤەی ئەم ئایەتەدا: (الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ)[٥٣]. واتە ئەوانەی باوەڕیان بە شتە نادیارەکان هەیە، نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا بەرپا دەکەن و لەوەی پێمان داون دەیبەخشن و دەیکەنە خێر. دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە گێڕدراوەتەوە کە واتای وشەی (الغیب) ئەوەیە کە زانینی لە بەندەکان پەردەپۆش کرابێت. پاشان دەڵێ: ئەم واتایەش جێی خۆیەتی، لەبەرئەوەی (الغیب) گشتی و گشتگیرە، دەچێتە بازنە و چوارچێوەی (الغیب)ەوە، ئەوەی کە هاوڕێکانمان گێڕاویانەتەوە لەبارەی سەردەمی دیارنەمانی (مەهدی) و رووداوی سەرهەڵدان و هاتنی[٥٤] و شتانی پەیوەندیدار بەوەوە، بەپێی ئەمە بێت، سەرهەڵدانی بیروباوەڕی گەڕانەوە (الرجعة) لای شیعەکان لە کاریگەریی جووەکانەوەیە. لەگەڵ ئەوەشدا هەیە لای وایە ئەگەر جووەکان کاریگەرییان هەیە لەسەر شیعە لەم بیرۆکەیەدا، واباشترە بوترێت ئەم کاریگەرییە لە خێرا سەرهەڵدانی ئەم باوەڕە لە ناویاندا (شیعەکان) دەردەکەوێت، دانانی بە بەشێك لە ئاین[٥٥].

لەو دیاردانەی کە مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێ تێبینیی بکات، ئەو لێکچوونەیە لە نێوان باوەڕبوون بە (بۆ دەرکەوتن) (البَداء) لە بیروباوەڕی جووەکاندا لەگەڵ باوەڕی شیعە سەبارەت بەم بیروباوەڕەی (البداء)، وا دەردەکەوێت کە جووەکان سەرنجی شیعەیان بۆ ئەم بیرۆکە و باوەڕە راکێشاوە. کەوابوو (البداء) بۆ دەرکەوتن بیروباوەڕێکی جولەکانەیە و تەورات باسی کردووە، ئەوەتا لە (سفر)ی

---

[٥٣] البقرة: ٣.

[٥٤] تەماشای: مجمع البيان في تفسير القرآن بكە ب١، ل٣٨.

[٥٥] تەماشای (الجانب الإلهي من الفكر الإسلامي) ل٧٩ بكە.

(التكوين) پێکهێناندا هاتووه (ورأى الله كلَّ ما عمله فاذ هو حسن جداً)[٥٦] . واته خوا تەماشای کرد ئەوەی کە کردوویەتی، شتێکی زۆر چاکە، مانای ئەمەش بەشێوەیەکی روونتر ئەوەیە کە خوا شتەکان دروست دەکات بیٚ ئەوەی بزانیٚ ئەوەی کە دروستی دەکات و دەیخولّقێنیٚ چاکە یان خراپ، دوایی و پاشان بۆی دەردەکەوێت کە هەموو ئەوەی ئەنجامی داوە زۆر باشن[٥٧]. جگە لەوەش شتانی تر هەن کە بەڵگەن لەسەر بوونی ئەم باوەڕە لای ئەوان، ئەمە بیرۆکەی (البداء)ە لە بیروباوەڕی یەهودییەکاندا، ئایا هەمان شت لە ئاینی ئیسلامدا بەدی دەکرێت؟

پشکنینی ئەو ئایەتە قورئانییانەی کە بێژەی (لفظ)ی (البداء)یان تێدا هاتووە، ئاماژە ناکات بۆ زیاتر لەوەی کە مەبەست لە وشەی (البداء) واتا زمانییەکەیەتی کە ئەویش واتە (الظهور)ە، دەرکەوتن و سەرهەڵدان، خوای گەورە فەرموویەتی: (فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا)[٥٨]. واتە: جا شەیتان وەسوەسەی خستە دڵیانەوە تا عەورەتی داپۆشراویان دەرکەویٚ و بۆیان روون بیٚ کە دەرکەوتنی شتێکی ناشیرینە. خوای مەزن فەرموویەتی: (وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ)[٥٩]. واتە لەو رۆژەدا بۆیان دەردەکەویٚ لەلایەن خواوە لە ئازار و سزا، ئەوەی کە هەر بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات.

وشەی (البداء) هەروەك دەزانین لە ئایەتانێکی زۆردا هاتووە و هەموویان واتای (الظهور) دەرکەوتن و ئاشکرابوون دەدەن بە دەستەوە.

کەواتە واتای وشەی (البداء) وەکو جووەکان دەڵێن و لێی تێگەیشتوون، لە ئیسلامدا نییە، بەڵکو بەکارهێنانی بۆ خوای پەروەردگار مەحاڵە، لەبەرئەوەی

---

٥٦ سفر التكوين: الاصحاح الأول، الفصلة ٣١.

٥٧ الاتجاهات الفكرية في التفسير، ل٢٩٢.

٥٨ (الأعراف : ٢٠ ).

٥٩ (الزمر : ٤٧ ).

زانیاریی خودا ڕەهایە و هیچی لێ ون نابێ و ناشاردرێتەوە، نە لە زەویدا و نە لە ئاسمانەکاندا. زانیاریی ئەو چواردەوری هەموو شتێکی داوە، لە ئەتۆم و گەردێکەوە تا گەلە ئەستێرەیەك (کەهکەشانێك). هەروەك دەزانین کە شیعەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی یەهودەکانەوە لە باوەڕبوویان بە بیرۆکەی (البداء) و ئەم ئایەتەشیان کردووەتە بەڵگە (يَمْحُو اللّٰهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ)[٦٠].

واتە: هەرچی لەو بڕیارە کاتییانەی کە خوا پێشتر بۆ پێغەمبەرانی ناردووە، هەرکامێکیشیان ویستبێتی لای بدا، ئەوا لایداوە و سڕیویەتییەوە و هەرچییەکیش ویستبێتی بیهێڵێتەوە، ئەوا بۆ کاتی دیاریکراوی خۆی هێشتویەتییەوە و نەیگۆڕیوە. سەرچاوەی هەموو کتێبە ئاسمانییەکان لای خوای گەورەیە. بەپێی ڕای خۆیان ڕاڤە و تەئویلیان کردووە. هەروەها خۆیان هەڵواسیوە بەو ریوایەتەوە کە دەڵێ: گەیاندنی پەیوەندیی خوێشایەتی تەمەن زیاد دەکات و خێر و خێرات ڕووداو و قەزای حەتمی دەگێڕێتەوە، چەندان ریوایەتی تریش. بەتاڵی و پووچیی پەیڕەو و بۆچوونەکەیان شتێکی ئاشکرایە، وەك ئاشکرایی ڕۆژ لە جەرگەی ئاسماندا.

بابەتی دروستکردنی قورئان (خلق القرآن)، لەو باسانە بوو کە زەینی ئیسلامی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، هەروەك وتراوە کە ئەم بیرۆکەیە سەرچاوەکەی لە ئایینی جووەکانەوەیە، هەندێك لە جوو لە ئیسلامدا بڵاویان کردووەتەوە.

خەتیبی بەغدادی دەڵێ: بێگومان (بیشری مورسی) ـ کە یەکێکە لە گەورەکانی ڕێبازی موعتەزیلەکان، کە بانگخوازی ئەم بیرۆکەیە بووە ـ باوکی جوولەکەیەکی زەڕەنگەر بووە لە شاری کوفە (نەجەف)دا[٦١].

---

[٦٠] (الرعد: ٣٩ ).

[٦١] تەماشای: الاتجاهات الفکریة في التفسیر، ل٢٩٥ بکە.

ئیبن ئەسیر دەڵێت: یەکەم کەس کە بیرۆکەی (دروستکرانی) قورئانی بڵاوکردەوە لە نێو موسڵمانانندا، لەبیدی کوڕی ئەعسەمی یەهودی بوو، پاشان تالوقی خوشکەزای ئەم وتەیەی لێوەرگرت و لەم باسەدا پەرتووکی نووسی و یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا ئەم کارەی ئەنجامدا[٦٢].

هەندێ کەسی تریش هەن کە دەڵێن: سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئەم بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی دیانی (مەسیحی)[٦٣].

گرووپی موعتەزیلە لە بیرۆکەی دروستکرانی قورئان (خلق القرآن) بەرگری دەکەن: ئەوەتا زەمەخشەری لە تەفسیرەکەیدا لەبارەی ئەم ئایەتەوە: (قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً)[٦٤]. واتە: بڵێ ئەی موحەممەد ﷺ ئەگەر هەموو ئادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، با هەندێکیشیان پشتیوانیی هەندێکی تریان بن. دەڵێ: ئەگەر یارمەتیی یەکتر بدەن بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، لە رەوانبێژییەکەی (بلاغة) و جوان رێکخستنەکەی و دانانیدا، لە کاتێك عەرەبە رەسەنەکانیان لەگەڵدا بێت، ئەوا دەسەوسان و کش هاتوون لە هێنانی وێنەی قورئاندا. سەرسوڕمان لە (الثوابت)دایە و کەسێ کە هاوڕایە لەگەڵیاندا کە دەڵێن: قورئان (قدیم)ە، واتە: بێ کۆتایە و لەگەڵ ئەوەشدا دان بەوەدا دەنێنن کە دەسەوسانکەر (معجز)ە، ئەم دەسەوسانکردنەش کاتێ دەبێت کە توانا هەبێت. دەوترێت: خوای گەورە بەتوانایە بەسەر دروستکردنی تەنەکاندا و بەندەکان بێ توانان لێی، ئەما ئەو مەحاڵەی کە بواری تواناى تێدا نییە و دەروازەی نییە وەك دووەمی بێ کۆتایی

---

[٦٢] تەماشای: الكامل في التأريخ، ب٧، ل٤٩ بکە.

[٦٣] تەماشای: الاتجاهات الفكرية في التفسير، ل٢٩٩ بکە.

[٦٤] (الإسراء: ٨٨ ).

(كثاني القديم) ئەوا بە ئەنجامدەر و بكەر، ناوترێ بێ توانا بووە لێی و نەكراوەكەش بەدەسەوسانكەر نادرێتە قەڵەم، ئەگەر ئەوە بوترێ، ئەو كاتە رەوا دەبێ كە بڵێین خوا دەسەوسانە، لەبەرئەوەی كە ناوترێ خوا هێزی بەسەر مەحاڵدا دەشكێ، مەگەر هەر ملكەچی راستی نەبن و بڵێین ئەو توانای بەسەر مەحاڵیشدا دەشكێت، چونكە بەراستی سەرمایەیان ملكەچ نەكردنە بۆ راستی و هەڵگێڕانەوە و ئاوەژووكردنی راستییەكانە[٦٥].

[٦٥] الكشاف، ب٢، ل٦٩٢. كەسێك زانیاریی پتری دەوێ، با تەماشای پەرتووكە كەلامییەكان بكات.

# جێباسی سێیەم:
# جەمسەران و سەرانی گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان و دیدگای زانایان و هەڵوێستی ڕاڤەکارانی قورئان دەربارەیان

## باسی یەکەم:
## سەرانی گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان و دیدگای زانایان دەربارەیان

وەك لەمەوپێش وتمان، زۆرێك لە گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان دزەیان کردووەتە ناو ڕاڤەی قورئانەوە، لەسەر دەستی ئەو جوو و دیانانەی کە موسڵمان بوون. ئەم گێڕانەوانەش جەمسەری خۆیان هەیە، لە دیارترینیان:

١- عەبدوڵڵای کوڕی سەلام: ئەو باوکی یوسف، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، کوڕی حارسی ئیسرائیلی ئەنسارییە، کاتێ موسڵمان بوو کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، بوخاریش لە سەحیحەکەیدا - لە کاتی باسکردنی چاکەی ئەنسارەکاندا - بەشێکی سەربەخۆی لەبارەی چاکەکانی (باشییەکانی) عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە نووسیوە. لەو گێڕانەوەی کە لەم بوارەدا بوخاری هێناویەتی بە سەنەدی خۆی لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە کە وتوویەتی: نەمبیستووە کە پێغەمبەر ﷺ بە کەس بڵێ لە زەویدا کە بەهەشتییە، جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام. سەعد فەرمووی ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوەوە هاتووەتە خوارەوە: (وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ)[٦٦]. واتە: گەواهێك لە بەنی ئیسرائیل گەواهی دا. گێڕدراوەتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام: ئایا موحەممەد دەناسی وەك چۆن کوڕەکەی خۆت دەناسی؟ وتی بەڵێ زیاتر، لە ئاسمانەوە سپاردە پارێز (أمین) هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر سپاردەپارێز و ناسیومە و هیچ گومانم نییە تێیدا کە ئەو پێغەمبەرە، بەڵام مناڵەکەم نازانم لە

---

[٦٦] (الأحقاف: ١٠).

دایکیەتی یان نا، لەوانەیە ناپاکیی کرد بێ. عومەر سەری عەبدوڵڵای کوڕی سەلامی ماچ کرد[٦٧]. ئەوەش پاڵپشتی ئەم فەرموودەیەی خوایە (الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمُ الَّذِينَ خَسِرُواْ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ)[٦٨]. واتە: ئەوانەی خاوەنی تەورات و ئینجیلن، پێغەمبەر دەناسن وەك کوڕانی خۆیان. بێگومان گرووپێك لەوان ئەم راستییە دەشارنەوە لە کاتێکدا کە دەزانن، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام زاناترین کەسی سەردەمی خۆی و کوڕی زاناترین کەس بووە، لەناو هاوەڵاندا بە زانیاری ناوبانگی دەرکردبوو. لەبەرئەوەی زانیاریی تەورات و زانیاریی قورئانی لابوو، رۆشنبیریی ئیسلامی و یەهودیی لا کۆببووبووەوە. موسڵمانان زۆر شتیان لێوەرگرتووە کە بەڵگەیە لەسەر شارەزابوونی لە تەوراتدا[٦٩].

ئێمە لەبەردەم ئەو شتانەداین کە لێوەی دەگێڕدرێتەوە، نە هەمووی بە هەڵبەستراو دەزانین، نە هەمووی وەردەگرین، بەڵکو لەسەرمانە ئەوەی لێیەوە دەگێڕدرێتەوە، بدەین لە پێوەری دروستی باوەڕپێکراو لە بواری گێڕانەوەدا، هەرچییەك راست دەرچوو، وەریدەگرین و هەرچییەکەیش راست دەرنەچوو، دەیدەینە دوواوە.[٧٠]

٢ـ کەعبی ئەحبار: ئەبو ئیسحاق، کەعبی کوڕی نافیع حومەیرییە، کە ناسراوە بە کەعبی ئەحبار. لە رەچەڵەکدا لە جووەکانی یەمەنە، دەوترێت لە سەردەمی جێنشینی ئەبوبەکری صدیقدا موسڵمان بووە، وتراوە لە سەردەمی

---

٦٧ صفوة التفاسير، ب١، ل٩٣.

٦٨ (الأنعام: ٢٠).

٦٩ التفسير والمفسرون، ب١، ل١٥٨.

٧٠ التفسير والمفسرون، ب١، ل١٨٦.

جێنشینی عومەری کوڕی خەتتابدا، وتراویشە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ موسڵمان بووە، کۆچکردنی دواکەوتووە[٧١].

کەعب خاوەنی زانیارییەکی گەورە بوو، لەبەرئەوە پێی دەوترێت کەعبی حیبر، پاژنەی زانایان، یان کەعبی ئەحبار، پاژنەی بەرزی زانایان. لە راڤەی قورئاندا و لە هەندێ بواری تردا، شتانێکی زۆری لێوە گێڕدراوەتەوە، کە بەڵگەیە لەسەر زانیاریی فراوانی ئەم زانایە و شارەزابوونی لە رۆشنبیریی ئاینیی جولەکە و ئیسلامدا[٧٢]. بێگومان زۆر شتی بە تۆمەت دراوەتە پاڵ، بەڵام پێویستە لەسەرمان وەکو (محمد حسن الذهبي) ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە ئیبن عەباس سەرەڕای شکۆ و رێزی، ئەبو هورەیرەش لەگەڵ ئەو هەموو زانیارییەیدا کە هەیبوو، جگە لەم دوانەش لە هاوەڵان، هاوەڵانی تریش زانیارییان لێوەردەگرت و شتیان لێدەگێڕایەوە، ئەوەتا پێشەوا موسلیم لە سەحیحەکەیدا لێیەوە دەگێڕێتەوە، لە کتێبەکەیدا لە چەندین شوێنێکدا لە کۆتاییەکانی نووسراوی (كتاب الإيمان)دا ئەم کارە بەدی دەکرێت.

هەروەك ئەبوداود و ترمزی و نەسائی لە کەعبی ئەحبارەوە گێڕاویانەتەوە کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر جێ متمانەبوونی ئەم زانایە لای هەموو ئەمانە. گەواهییەکی بەسە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر تۆمەتێك کە بلکێنرێت بەم زانا شکۆمەندەوە[٧٣]. کەعب ئەوەی دەیگێڕایەوە بەو پێیە کە دروستە و نەگۆڕاوە و دەستکاری نەکراوە، بە ئەنقسەت درۆی نەکردووە و نادرێتە پاڵ درۆکردن، با ئەوەی دەیگێڕێتەوە لە خودی خۆیدا درۆ بێت، چونکە ئەمیش وەك کەسانی تر درۆی لێ شاراوە بووە و پێی نەزانیوە، هەر لەبەر ئەم دەسکاری و گۆڕانەیە کە

[٧١] تەماشای: الاتجاهات الفكرية في التفسير، ل٢٤٦ بکە.

[٧٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٦ .

[٧٣] التفسير والمفسرون، ب١، ل١٨٨.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەرگری و ڕێگریی کردووە لە باوەڕکردن بە جوو و دیانەکان (أهل الکتاب) یان بە درۆ دانانیان، یان لەوەی دەیگێڕنەوە، لەبەرئەوەی لەوانەیە ئەوە ڕاست بێ ئەوان بە درۆی بزانن، یان درۆ بێ باوەڕی پێ بکەن، لە ئەنجامدا تووشی تاوان ببن[٧٤].

٣ـ وەهەبی کوڕی مونەبیە: باوکی عەبدوڵڵا، وەهەبی کوڕی مونەبیهی کوڕی مینجی یەمەنی سەنعانییە. خاوەنی زانیارییەکی فراوان بووە و ئاگادارییەکی زۆری لە پەرتووکە کۆنەکاندا هەبووە. هەواڵ و چیرۆکێکی زۆری لا بووە لەبارەی نەتەوە پێشینەکان و سەرەتای جیهانەوە[٧٥].

وەهەب سەرەتا باوەڕی بە قەدەر هەبوو، پاشان پەشیمان بووەوە. حەممادی کوڕی سەلەمە لە ئەبو سینانەوە دەڵێ بیستم لە وەهەبی کوڕی مونەبیە دەیوت: من باوەڕم بە قەدەر هەبوو، بانگەوازم بۆ دەکرد تاکو نزیکەی ٧٩ پەرتووکم لە پەرتووکی پێغەمبەران خوێندەوە لە هەموویاندا هەبوو (هەرکەسێك شتێك لە ویست بداتە پاڵ خۆی، ئەوا بێگومان کافر دەبێت) بەم هۆیەوە وازم لەم بیرە هێنا. جوزجانی وتوویەتی: وەهەب لەبارەی قەدەرەوە پەرتووکێکی نووسی، پاشان وتوویەتی کە پەشیمان بووە لەم کارەی[٧٦]، هەندێ هێرشیان کردووەتە سەر و لەکەداریان کردووە، هەروەك کەعب[٧٧] لەکەدار کراوە لەسەر ئەم جۆرە بیرانە، بە درۆزن و خەوش شارەوە (المُدَلِّس) و تێکدانی ئاوەزی موسڵمانان و بیروباوەڕیان تاوانبار کراوە. ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە ـ وەکو موحەممەد حسەین زەهەبی دەڵێ ـ بۆ وتەی زانایانی ڕەخنەگر لەبارەی وەهەبەوە، ئەوا بۆمان

---

[٧٤] التفسير والمفسرون، ب١، ل١٩٥.

[٧٥] فجر الإسلام، ل١٩٤.

[٧٦] التفسير والمفسرون، ب١، ل١٩٦.

[٧٧] لەوانە: ڕەشید ڕەزا و هەندێ کەسی تر، کە پەنجەی تۆمەتیان بۆ وەهەب ڕاکێشاوە.

ڕووندەبێتەوە کە پیاوێکی دوورە لەو ڕەخنانەی لێدەگرێت، بەرییە لە هەموو ئەو شتانەی کە دادگەری و ڕاستگۆیی بڕووشێنێ. زەهەبی فەرموویەتی: وەهەب جێی متمانە و ڕاستگۆ بووە. زانیاریی زۆر لە پەرتووکە ئیسرائیلییەکانەوە دەگوێزێتەوە. عجێلی فەرموویەتی: شوێنکەوتەیەکی (تابعي) متمانەپێکراوە. ئیبن حەجەر فەرموویەتی: وەهەبی کوڕی مونەبیهی سەنعانی، لە شوێنکەوتەی هاوەڵانە و کۆمەڵێ زانایان متمانەیان پێداوە و فەلاس بە تەنها دەڵێ: وەهەب لاواز بووە، بەڵگەیشی لەم بۆچوونەیدا ئەوەیە کە وەهەب بانگەوازی بۆ بیرۆکەی قەدەر کردووە. ئیبنو حیبانیش لەناو متمانەداراندا ناوی بردووە. جگە لەمەش زۆرێك لە زانایان گەواهیی دادگەری و باوەڕپەهێزیی بۆ دەدەن.

وەهەب ئەگەرچی ئیسرائیلیاتی زۆری هێناوە لە چیرۆك و شتانی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە پەنجەی تۆمەتی بە درۆی بۆ ڕانەکێشرێ، تێکدانی بیروهۆش و باوەڕی نەدرێتە پاڵ، لەبەرئەوەی کۆمەڵێ لە زانایان (الجمهور) متمانەیان پێداوە. کەواتە وەهەب پیاوێکی ستەملێکراوە لەلایەن تۆمەت بۆکەرانییەوە، کە شتانێکیان داوەتە پاڵ ئەو و کەعب، کە ڕاست نین(٧٨).

٤ـ عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی جورەیج: باوکی خالید، یان باوکی وەلید. عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی جورەیج، بە ڕەگەز ڕۆمییەکی دیانە. کوڕی جوریەج یەکێك بووە لە زانایان و فەرموودەناسانی مەککە. یەکەم کەس بووە کە لە حیجازدا پەرتووکی نووسی و جەمسەری ئیسرائیلیات بوو لە سەردەمی شوێنکەوتووی هاوەڵاندا. بە یەکێك لە پیاوانی چینی مالیکی کوڕی ئەنەس دەدرێتە قەڵەم کە فەرموودەکانی پێغەمبەریان کۆکردووەتەوە و تۆماریان

---

[٧٨] تهذیب التهذیب، ب١١، ل١٦٦ـ ١٦٧. میزان الإعتدال، ب٣، ل٢٧٨. التفسیر والمفسرون، ب١، ل١٩٩.

کردووە[79]. چەند بەشێکی زۆری لە راڤەی قورئاندا لێوە گێڕدراوەتەوە، کە هەندێکی راستە و هەندێکی ناڕاست، ئەوەش لەبەرئەوەیە مەبەستی کۆکردنەوەی گێڕدراوە راستەکان نەبووە، بەڵکو هەرچییەك لەبارەی هەر ئایەتێکەوە هاتبێ، هێناویەتی، ئایا ساغ بووبێت یان نەخۆش[80]. ئەمما لە لایەنی دادگەرییەوە، ئەوا دیدگای زانایان لەبارەیەوە جیاجیایە. هەندێکیان بەجێی متمانەی دەزانن و هەندێکی تریان دەڵێن: لاوازە. عجێلی دەربارەی دەڵێ: خەڵکی مەککەیە و جێی متمانەیە. ئیبنو مەعین دەڵێ: جێی متمانەیە لە هەموو ئەو شتانەیدا لێیەوە دەگێڕدرێتەوە. لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە فەرموویەتی: ئیبنو جورەیج زۆر راستگۆ بووە، هەرکاتێك فەرموودەم بۆ بگێڕێتەوە ئەوە بیستنە (سمّاعَ)، هەرکاتێك وتی: هەواڵی پێدام (أخبرني) ئەوە خوێندنەوەیە (قراءة)، واتە بۆی خوێندراوەتەوە، هەرکاتێك وتی: وتوویەتی (قال)، ئەوە لە با دەچێت (شبه الريح). دارەقوتنی دەڵێ: دووربکەوەرەوە لە تەدلیسی ئیبن جورەیج، چونکە بە ڕاستی تەدلیسی ناشیرینە، تەدلیس ناکات لە کەسێکەوە نەبێ کە لە بریندارێکەوە[81] (مجروح) بیستبێتی. ئیبنو حەبان لەناو متمانەپێکراوەکاندا ناوی بردووە. وتوویەتی: یەکێك بووە لە شەرعزان و قورئانزان و خاوەن لێکۆڵینەوەکانی حیجاز و لە گێڕانەوەدا تەدلیسی کردووە. هەندێك لە فەرموودەناسان فەرموودەیان لێوەرگرتووە و هەریەکێکیان ڕوانینی تایبەتی خۆی هەبووە دەربارەی ئەم زانایە[82].

---

[79] التفسير والمفسرون، ب١، ل١٩٩.

[80] الاتقان، ب٢، ل١٨٨.

[81] زاراوەیەکی فەرموودەناسییە، کە بە یەکێك دەوترێت کەموکوورپی تێدا بێت کە زیان لە گێڕانەوە بدات.

[82] ميزان الإعتدال، ب٢، ل١٥١، ل٢٠٧. تهذيب التهذيب، ب٦، ل٤٠٢ و ٤٠٦.

ئەمە ڕوانینی زانایانە بۆی و بڕیاری ئەوانە بەرامبەری، دەبینین زۆربەیان دەڵێن تەدلیسی لە گێڕانەوەدا کردووە و هەندێ لە گێڕدراوەکانی جێی متمانە نین، پێویستە لەسەر ڕاڤەکاری قورئان (المفسر) زۆر وریا بێت و ئاگای لەخۆی بێت لە گێڕانەوە لە ئیبنو جورەیجەوە و لە ڕاڤەدا، تا گێڕانەوەی لاواز نەهێنێ، یان پشت نەبەستێ بە وتەی نەخۆش.

پاش هەموو ئەمانە.... ئەوانە پێشەنگ و جەمسەرەکانی ئیسرائیلیات بوون، بەسەر ئەمانەدا دەسوڕێتەوە (دەخولێتەوە)، زۆربەی ئەو گێڕانەوانەی کە لە پەرتووکەکانی ڕاڤەی قورئاندایە، ئیتر جیاوازیی نییە ئەوەی دەدرێتە پاڵ ئەمان ڕاست بێت یان بۆیان هەڵبەسترا بێت، بێگومان نرخی هەریەکە لەمانەت زانی و بەهای گێڕانەوە ئیسرائیلییەکانت بۆ دەرکەوت کە کامیان دروستە بگێڕدرێتەوە و کامیان دروست نییە.

## باسی دووەم:

## هەڵوێستی ڕاڤەکاران دەربارەی ئیسرائیلیات

ڕاڤەکاران بەرامبەر گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان هەڵوێستی جیاجیان هەیە، لەوەدا کەوتوونەتە ڕاجیاوازییەکی گەورە و فراوانەوە.

لە ڕاڤەکاران هەیە بە تەواوی پشتی کردووەتە ئەم گێڕانەوانە و هەرگیز نایهێنێ و ناوی نابات، بەڵکو ڕووی لێوەردەگێڕێ، هەشیانە نکوڵی لەم گێڕانەوانە دەکات و هۆشداری دەدات دەربارەیان، لایەنە ناتەواوەکانی ڕووندەکاتەوە. هەیانە تەنها ئەو گێڕانەوانە دەهێنێت کە پەیوەندیی بە بیروباوەڕ و بڕیارەکانیەوە هەیە و لەگەڵ ئاوەزی ساغدا دژایەتیی نییە. هەیە ئەم گێڕانەوانە ناو دەبات لە تەفسیرەکەیدا بە فراوانی، بێ ئەوەی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکات. هەیانە لەو گێڕانەوە ئیسرائیلیاتانە دەهێنێ، کە شکۆی پێغەمبەران لەکەدار

دەكات و لەگەڵ دادگەری و پاراستن و تایبەتمەندییەكانیاندا ناگونجێ. هەشیانە ئەم گێڕانەوانە هەڵدەسەنگێنێ، كاتێك كە دەیانهێنێ هەر وا پێیان رازی نییە. هەیە دەیانهێنێ و هیچیان لەسەر ناڵێت، كە ئەمەش وا دەگەیەنێت لای ئەو وەرگیراوە. ئاوا هەر راڤەكەرێك شێواز و رێگەی خۆی هەیە دەربارەی ئەم گێڕدراوانە. لەمەولا لەم جێگەباسەدا هەڵوێستی هەندێ لە راڤەكارانی قورئان شرۆڤە دەكەین لە تەفسیرەكانیاندا دەربارەی ئەم گێڕدراوانە، تا بەرچاومان لەم كارەدا روون بێت.

١ـ هەڵوێستی موقاتیلی كوڕی سولەیمان دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووكەكەیدا:

تەفسیری (موقاتیلی كوڕی سولەیمان) باشترین نموونەیە بۆ تەفسیرێ كە پڕ و تێرە لە ئیسرائیلیات، بە جۆرێك كە هەواڵە ئیسرائیلییەكان ناو دەبات بێ ئەوەی لێكۆڵینەوەی لێ بكات و بیدا لە بێژنگ، كە هەندێكی هێنانی زیانی نییە، وەك راڤەكردنی ئەم فەرموودەیەی خوا: (وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَاناً فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ * لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لَأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ)[٨٣].

ئەم ئایەتە باسی چیرۆكێك دەكات كە حەوای خێزای ئادەم (دروودی خوای لەسەر بێت) بە سكێك كوڕ و كچێكی بوو كە ناویان (قابیل و ئیقلیما) بوو، پاشان لە سكێكی تردا كوڕ و كچێكی تری بوو كە ئەمانیش (هابیل و ئیلیزا) بوون. خوشكی قابیل جوانتر بوو لە خوشكی هابیل. وەختێك گەورە بوون، ئادەم وتی: هەریەكە لە ئێوە خوشكی ئەویترتان بهێنێ، بەڵام قابیل بە دڵی نەبوو و رەخنەی گرت و وتی: بەڵكو هەریەكە لە ئێمە ئەو خوشكەی خۆی مارە بكات كە لەگەڵیدا

---

[٨٣] (المائدة: ٢٧ـ ٢٨).

لەدایکبووە. ئادەم بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە بڕیاری دا کە هەریەکە لە قابیل و هابیل خێرێك بکەن، هەرکامێکیان خێرەکەی وەرگیرا ئەوە شایانی مارەکردنی ئەو کچەی هەیە. قابیل هات خراپترین کشتی (زرع)ی هێنا، هابیلیش خاوەنی ئاژەڵ بوو، باشترین مەڕی هێنا لەگەڵ هەندێ لە شیرینی و کەرەدا، پاشان هەردوو خێرەکەیان لەسەر شاخێك دانا، ئاگرێك هات خێرەکەی قابیلی خوارد و سووتاندی، بەڵام هابیل خێرەکەی هەر مایەوە، بۆیە قابیل ئیرەیی برد بە هابیل و کوشتی.

ئەمە یەکێکە لەو چیرۆکە ئیسرائیلیاتانە کە موقاتیل هێناویەتی لە تەفسیرەکەیدا، کە چیرۆکێکە گێڕانەوەی زیانی نییە. بەڵام هەندێ کات گێڕانەوەی ئیسرائیلیات شکۆ و ڕێزی پێغەمبەران لەکەدار دەکات، هەروەك لە چیرۆکی داود پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێ بێت) ئەم کارەی کردووە لە کاتی راڤەکردنی ئەم ئایەتەدا (وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ)[٨٤]. واتە: ئایا هەواڵت پێ گەیشتووە لەبارەی ئەو کەسانەوە کە دەمەقاڵێیان هەبوو سەرکەوتنە سەر دیواری میحرابەکەت. لە کاتی تەفسیری ئایەتەکەدا چیرۆکێکی درێژ باس دەکات کە ئەمە کاکڵە و کورتەکەیەتی:

پێغەمبەری خوا داود (سەلامی خوای لێ بێت) دڵی چووە سەر خێزانەکەی (ئەوریا) کە مێردەکەی لە شەڕدا بوو، داود بڕیاریدا کە ئەوریا بخرێتە سەرەتا و پێشی سوپاوە تا کوژرا، بەم هۆیەوە هەل ڕێککەوت و رەخسا بۆ داود و ژنەکەی ئەوریای مارە کرد و سلێمانی لێ بوو. موقاتیل ئەم چیرۆکەی لە تەفسیرەکەیدا هێناوە بێ ئەوەی قسەی لەسەر بکات و رەخنەی لێ بگرێت، یان ئاماژە بکات

---

[٨٤] (ص: ٢١).

بەوە کە شتی وا و کاری ئاوەها زیان دەگەیەنێت بە پایەی پێغەمبەران و لەگەڵیاندا ناگونجێت، لەگەڵ دادگەری و پارێزران و پاکیی ئەواندا رێکناکەوێت[٨٥].

٢ـ هەڵوێستی ئیبن جەریری تەبەری لەبارەی ئیسرائیلیاتەوە لە پەرتووکەکەیدا (جامع البيان في تفسير القرآن):

تەفسیری ئیبن جەریر بە یەکێك لە تەفسیرە راست و بەناوبانگەکان دەدرێتە قەڵەم، هەروەك بە یەکەم سەرچاوە دادەنرێت لای ئەو راڤەکارانەی قورئان کە گرنگییان بە راڤەی قورئان داوە بە پشتبەستن بە فەرموودە و وتەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان (النقلي)، ئەگەرچی لە هەمانکاتدا بە سەرچاوەیەکی تاڕادەیەك گرنگ دادەنرێت لە سەرچاوەکانی راڤەی عەقڵی و ئاوەزی، لەبەرئەوەی هەڵێنجان و ئاراستەی راکان کە پشت بە تێڕوانین و وردبوونەوەی ئاوەزی و لێکۆڵینەوەی ئازادانەی پڕ وردەکاری دەبەستێت. (کارادی فر) رای وایە کە تەفسیری تەبەری هیچ شتێك لە ئیسرائیلیاتی تێدا نییە.

مامۆستا ئەمین خولی لەسەر ئەم بۆچوونە قسەی کردووە، کە دەڵێ: گەورەترین گومان ئەوەیە کە ئەم بڕیارە لەسەر هەڵسەنگاندن و تێڕوانینێکی تایبەتی نەوەستاوە. روونی کردووەتەوە کە بێگومان تەبەری هەندێ لە گێڕانەوەی ئیسرائیلیی هێناوە.[٨٦]

ئیبن جەریر لە تەفسیرەکەیدا هەندێ هەواڵی هێناوە کە وەرگیراون لە چیرۆکە ئیسرائیلییەکان و بە سەنەدی خۆی دەیانگێڕێتەوە لە کەعبی ئەحبار و وەهەبی کوڕی مونەبیە و ئیبنو جورەیج و سەدی و کەسانی ترەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق گێڕانەوەی زۆری هەیە لەوەی کە لە موسەیلەمەی ئەنسارییەوە

---

٨٥ مناهج المفسرين، ل٨٧ـ ٨٩.

٨٦ الاتجاهات الفكرية في التفسير، ل٧٤.

گێڕاویەتییەوە. هەندێ لەو سەنەدانەی کە سەرنجڕادەکێشن، ئەم وەپاڵدانەیە (الاسناد):

ئیبنو حومەید قسەی بۆ کردم، وتی: سەلەمە قسەی بۆ کردین لە ئیبن ئیسحاقەوە لە ئەبی عتابەوە.... پیاوێك لە هۆزی سەعلەب تەمەنێکی زۆر لەسەر ئاینی دیانەکان بوو، پاشان موسڵمان بوو، قورئانی خوێند و لە ئیسلام تێگەیشت، هەروەك خۆی وتوویەتی کە ٤٠ساڵی ڕەبەق دیان بووە، پاشان ٤٠ ساڵ لە ئیسلامیشدا ژیاوە. ئیبن جەریر ئەم سەنەدە ناو دەبات و لەم پیاوە دیانەوە هەواڵێك دەگێڕێتەوە لەبارەی کۆتا پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلەوە، لە کاتی ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا: (إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا فَإِذَا جَاء وَعْدُ الآخِرَةِ لِيَسُوؤُواْ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُواْ الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوْاْ تَتْبِيراً)[87][88].

تەبەری بە سەنەدی خۆی لە تەفسیرەکەیدا لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا: (وَالْجَآنَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ)[89]. دەگێڕێتەوە، وتی: لە وەهەبی کوڕی مونەبیهم بیست کە پرسیاری لێکرا لەبارەی پەرییەوە (الجن) کە چین؟ ئایا دەخۆن و دەخۆنەوە یان دەمرن، یان ژن و ژنخوازی دەکەن، وتی: ئەوان چەندان ڕەگەزن، بەڵام پەریی تەواو (خالص الجن) ئەوان بان (هەوا)ن، ناخۆن و ناخۆنەوە و نامرن و منداڵیان نابێت، هەیانە چەندان ڕەگەزن، دەخۆن، دەخۆنەوە، ژن و ژنخوازییان هەیە و دەمرن، ئەمانەن کە دێو و دڕندە و درنجن و هاووێنەی ئەمانە[90]. لە وتە و بۆچوونی دیانەکان دەهێنێ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (وَأُحْيِـي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ

---

[87] (الإسراء: ٧).

[88] جامع البيان في تفسير القرآن، ب١، ل٣٣.

[89] (الحجر: ٢٧).

[90] جامع البيان في تفسير القرآن، ب٢١، ل١٤.

وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)[٩١].

وەهەب دەڵێ: زۆربەی جار (٥٠٠٠٠) نەخۆش هاتوونەتە لای عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) و هەرکەسیش نەیتوانیبێت بێتە لای، عیسا خۆی دەچوو بۆ لای ئەو، چارەی هەموو نەخۆشەکانی بە پاڕانەوە و نزا دەکرد[٩٢].

بەم شێوەیە ئیبن جەریر هەندی ئیسرائیلیات دێنێت، ئەمەش لەوانەیە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە کەوتووەتە ژێر کاریگەریی ئەو گێڕانەوە مێژووییانەی کە لە باس و لێکۆڵینەوە مێژوویيە فراوانەکاندا هێناونی. لەگەڵ ملکەچبوونیشمان بۆئەوەی کە تەبەری زۆرێك لە ئیسرائیلیاتی لە تەفسیرەکەیدا هێناوە، لە هەمانکاتدا بڕیار دەدەین، کە تەبەری لای کردووەتەوە بە لای بێ نرخیی هەندێکیاندا، وەك ئاشکرایە لە کاتی قسەکردن لەسەریان[٩٣]. هەروەها ئیبن جەریر لە کاتی هەر گێڕانەوەیەکدا سەنەدی گێڕانەوەکە بە تەواوی دەهێنێ، بەمەش بەرپرسیارانە مامەڵە دەکات، لەسەرمان پێویستە لە سەنەد وردبینەوە و گێڕانەوەکان بەسەربکەینەوە[٩٤].

٣ـ هەڵوێستی سەعلەبی دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (الکشف والبیان عن تفسیر القرآن):

سەعلەبی بەوە جیادەکرێتەوە کە بەشێوەیەکی بەرفراوان ئیسرائیلیاتی هێناوە لە پەرتووکەکەیدا، بێئەوەی هیچیان لەسەر بڵێ، یان هۆشداری بدات لەسەریان، سەرەڕای لە عەقڵ دووری و نامۆبوونیان. لەم تەفسیرەدا چیرۆکگەلێکی ئیسرائیلی هەن کە لەوپەڕی نامۆییدان. لەکاتی تەفسیری ئەم

---

[٩١] (آل عمران: ٤٩).

[٩٢] جامع البیان في تفسیر القرآن، ب٣، ل١٩٢.

[٩٣] الاتجاهات الفکریة في التفسیر، ل٨٠.

[٩٤] التفسیر والمفسرون، ب١، ل٢١٥.

ئایەتەدا: (إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَداً)[٩٥]. لە سەدی و وەهەبە و جگە لەمانیش قسەیەکی درێژ دەگێڕێتەوە لەبارەی ناوەکانی یارانی ئەشکەوت، لە کەعبی ئەحباریشەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەوەی کە لە سەگی شوانەکەدا چییان کرد کاتێ کەوتە شوێنیان بۆ ناو ئەشکەوتەکە. گێڕاویەتییەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە داوای لەخودا کرد کە یارانی ئەشکەوتی نیشان بدات، خواش وەڵامی دایەوە کە ناتوانێ هەرگیز لە جیهاندا نایان بینێت، فەرمانی پێ کرد کە چوار لە یارانت بنێرە لایان تا پەیامەکەت بگەیەنن پێیان... تا کۆتایی چیرۆکەکە، کە عەقڵ باوەڕیشی پێ ناکات و بە ڕاستی نازانێت[٩٦].

٤ـ هەڵوێستی بەغەوی دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (معالم التنزيل):

تەفسیری بەغەوی زۆرێك لە ئیسرائیلیاتی گرتووەتە خۆی. لەوانە، ئەوەی کە بەغەوی لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی لە باسی چۆنیەتی ئەو (چوارپێیە) کە لەم ئایەتەدا ناوبراوە: (وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ)[٩٧]. ئیبن جەریر لە ئیبن زوبەیرەوە گێڕاویەتییەوە کە باسی ئەم چوارپێیەی کردووە و وتوویەتی: سەری سەری گایە، چاوی چاوی بەراز و گوێی گوێی فیلە، شاخی شاخی کەڵەکێوییە، سینەی سینەی شێرە، ڕەنگی ڕەنگی پڵنگە، کەلەکەی کەلەکەی بەبرە (پشیلەی نێر) و کلکی کلکی بەرانە، سمەکانی سمی حوشترن،..... هتد[٩٨].

---

[٩٥] (الكهف: ١٠).

[٩٦] التفسير والمفسرون، ب١، ل٢٣١ـ ٢٣٢.

[٩٧] (النمل: ٨٢).

[٩٨] البغوي ومنهجه في التفسير، ل١١٢.

بەغەوی وەك وتمان، هەواڵی ئیسرائیلی زۆر دەهێنێ، بەتایبەتی لە کاتی باسکردنی چیرۆکی پێغەمبەراندا ـ درووود و سڵاوی خوایان لێ بێت ـ.

لە چیرۆکی یوسف پێغەمبەردا لەگەڵ ژنەکەی عەزیزی میسردا ـ کە ویستی هەڵیخەڵەتێنێ ـ وەك زۆربەی راڤەکارانی تری قورئان، قسە و گێڕانەوەی ئیسرائیلیات دەهێنێ کە ناگونجێ لەگەڵ پارێزەرانی یوسف پێغەمبەردا و هیچی لەسەر ناڵێت، ئەوەش لە روونکردنەوەی واتای وشەی (البرهان)[99]دا و هەروەها چەندان شتی تریش.

٥ـ هەڵوێستی زەمەخشەری دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التنزيل):

زەمەخشەری کەمێك لە گێڕانەوە ئیسرائیلییەکانی لە تەفسیرەکەیدا هێناوە، ئەوەشی کە ناوی دەبات، یان سەرەتاکەی بە وشەی (رُوِيَ) واتە: گێڕدراوەتەوە، دەستپێدەکات، کە ئاماژەیە بە لاوازیی گێڕانەوەکە و دوورییەتی لە ساغی و دروستی، یان زانینەکەی دەسپێرێ بە خوای گەورە، ئەمەش زۆربەی کات لە ناوبردنی ئەو گێڕانەوانەدایە کە باوەڕپێکردنیان ناتگەیەنێت بە ئاینی ئیسلام، یان ئاگاداری و هۆشداری دەدات لەسەر پلەی گێڕانەوەکە و ڕاددەی ساغ و دروستی، یان لاوازییەکەی بەشێوازێکی کورتیش بێت. ئەمەش زۆربەی کات لە کاتی هێنانی ئەو گێڕانەوانەدایە کە زیان لە ئاین دەدەن و پەیوەندییان پێوەی هەیە. لە کاتی راڤەی فەرموودەی خوای گەورەدا: (وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحاً لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ)[100]. دەڵێ گێڕدراوەتەوە کاتێ فیرعەون بڕیاری بنیاتنانی کۆشکەکەی دەرکرد، هامان کرێکارەکانی کۆکردەوە، تا پەنجا هەزار وەستای

---

[99] هەروەها سەرچاوە، ل١١٣.

[100] (القصص: ٣٨).

هێنا، جگە لە شوێنکەوتە و کرێکار. بڕیاری برژاندنی خشتی دا و فەرمانی هێنانی گەچ و تاشینی دار و داکوتانی بزماری دەرکرد، تا کۆشکەکەی بە جۆرێك بەرزکردەوە کە لەو سەردەمەدا هیچ کۆشکێك شانی نەدەدا لە شانی لە بەرزیدا، تا وەستاکانی نەیاندەتوانی بەسەریەوە بوەستن بۆ زیاتر بەرزکردنەوەی. خوای گەورە فریشتە جوبرەئیلی نارد لە کاتی ئاوابوونی رۆژدا بە باڵەکانی کێشای بە کۆشکەکەدا و کردی بەسێ پارچەوە، پارچەیەکی کەوت بەسەر لەشکرەکەی فیرعەوندا و هەزار هەزار پیاوی لەناوبرد، پارچەیەکی کەوتە نێو دەریاوە و پارچەیەکی کەوتە رۆژئاوا، هیچ کام لە کرێکارەکانی نەمانەوە و تیاچوون.

لەم چیرۆکەدا دەگێڕێتەوە کە فیرعەون سەرکەوتە سەر ئەو کۆشکەوە و تیرێکی بۆ ئاسمان هاویشت، خوداش ویستی تاقییان بکاتەوە و تیرەکە بە خوێناوییەوە هاتەوە لای فیرعەون، فیرعەونیش وتی: خودای موسام کوشت. لەم کاتەدا خوای گەورە جوبرەئیلی نارد بۆ ڕماندنی کۆشکەکە. پاشان لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دەڵێت: (والله أعلم بصحته)[١٠١]. واتە خوا زاناترە بە راستیی ئەم چیرۆکە.

دەبینین زەمەخشەری لە سەرەتای چیرۆکەکەوە وشەی (رُويَ)ی هێنا، کە مانای لاوازی چیرۆکەکە دەگەیەنێت، قسەی لەسەر چیرۆکەکە کرد بەم رستەیە: (والله أعلم بصوابه) واتە خوا زاناترە بە دروستیی ئەم چیرۆکە.

کە ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە گومان هەیە لە دروست و ساغیی ئەم گێڕانەوەیەدا. ئەم چیرۆکەش ئەگەر گریمان راست بێت، رەخنەی تێدا نییە، لەبەرئەمە (زەمەخشەری) لە سەرەتاکەیەوە وشەی (رُويَ)ی هێنا[١٠٢].

---

[١٠١] الكشاف، ب٢، ل١٦٢.

[١٠٢] التفسير والمفسرون، ب١، ل٤٧٧. الاتجاهات الفكرية في التفسير، ل٩٢.

زەمەخشەری لەگەڵ ئەو نەرمییەی نیشانی دەدا لە وەرگرتنی ئەو ئەفسانە ئیسرائیلییانەدا کە پەیوەندییان بە بیروباوەڕەوە نییە، لە هەمانکاتدا لە بەرامبەر ئەو گێڕانەوانەی شکۆ و پارێزراویی پێغەمبەران لەکەدار دەکەن، هەڵوێستێکی جیاوازی هەیە، بەردەوام سوورە و پێ دادەگرێ لەسەر دانەدواوەی ئەو گێڕانەوانەی شکۆی پێغەمبەران لەکەدار دەکەن و ئابڕووی لادانەکانیان دەبات. بۆ نموونە دەبینین نکوڵی دەکات لەو چیرۆکانەی کە باسی داود پێغەمبەر دەکەن و دەدرێنە پاڵی، کە شتی وایان تێدایە پایەی پێغەمبەرێتی و پارێزراوبوونی لەکەدار دەکەن[103].

٦ـ هەڵوێستی تەبریسی دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (مجمع البيان في تفسير القرآن):

تەبریسی ئیسرائیلیاتی زۆر دەهێنێ و بە سەنەد دەیداتە پاڵ بێژەرەکەی، وا دەردەکەوێت لە کاتی هێنانیاندا رەخنەیان لێ ناگرێ یان قسەیان لەسەر ناکات و پێیان رازییە و وەریان دەگرێت. نموونەی ئەوەش ئەوەی کە لە کاتی تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَى * قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى)[104]. وتی: (مآرب أخرى): واتە: چەند پێویستییەکی تر، ئیبن عەباس وتی توێشووی پێ هەڵدەگرت، دای دەچاند ئاوی لێدەهات، دەیدا بە زەویدا، بەو هۆیەوە هەرچییەکی بویستایە لە زەوی دەهاتە دەرەوە و دەیخوارد. دڕندەشی پێ دەردەکرد، ئەگەر دوژمن بهاتایە دژی دەوەستا. واتە دارەکە ئەگەر بویستایە ئاوی پێ دەربهێنێ، درێژ دەبوو و هەر لەپەکەی دەبوونە دۆڵچەی ئاو، بە شەویشدا سەری ئەم عاسایە دەبووە چرا و

---

[103] الكشاف، ب٢، ل٢٧٩ـ ٢٨٠، في تفسيره لقوله تعالى : (وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ) (ص: ٢١ ).

[104] (طه : ١٧ـ ١٨).

شەوی بۆ رووناك دەكردەوە و قسەی لەگەڵ موسادا دەكرد و نەیدەهێڵا بێتاقەت بێت. فەرمووی لەبارەی ئەم ئایەتەوە: (قَالَ أَلْقِهَا يَا مُوسَى * فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى)[١٠٥]. وتراوە: عەساكە بووە مارێكی پوپ و باڵدار، وەك یاڵی ئەسپ و دەواسی، تا دەبووە مارێكی گەورە، كە گەورەترین مار بوو. وتراوە كاتێ كە عەساكەی فڕێدا، بوو بە گەورەترین مار و خەڵكی بۆیان دەنواڕی، تێپەڕدەبوو بەلای هەر تاشە بەردێكدا قوتی دەدا و كەڵبەكانی دەدا لە ڕیشەی داری گەورە و لەبن دەری دەهێنا، چاوەكانی ئاگریان فڕێدەدا..... تا كۆتایی ئەو شتانەی ناوی بردن[١٠٦]. جگە لەمە، تەبریسی ئیسرائیلیاتی دەدایە دواوە و لاوازیانی ئاشكرا دەكرد، بەڵكو خۆی لا دەدا لە باوەڕپێكردنیان و گوێگرتن بۆیان، ئەگەر دژایەتییان لەگەڵ بیروباوەڕدا هەبوایە و نەگونجایەن لەگەڵ پرەنسیپەكانیدا. ئەو لەو كاتەدا تەماشای درۆزنیی گێڕەرەوەكانی دەكرد، ئەو بەڵگانەی دەهێنا كە پشتیوان بوون بۆ ڕاكانی و بیروبۆچوونەكانی. لەو نموونانەی لەم بوارەدا، هەڵوێستی تەبریسی دەربارەی ئەو چیرۆكە جیاوازەیە كە دەدرێتە پاڵ داود پێغەمبەر، لە كاتی ڕاڤەكردنی ئەم فەرموودەیەی خوادا: (وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ * إِذْ دَخَلُوا عَلَى دَاوُودَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ قَالُوا لَا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَى بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ فَاحْكُم بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَاهْدِنَا إِلَى سَوَاءِ الصِّرَاطِ * إِنَّ هَذَا أَخِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِيَ نَعْجَةٌ وَاحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ * قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَى نِعَاجِهِ وَإِنَّ كَثِيراً مِّنْ الْخُلَطَاء لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ وَظَنَّ دَاوُودُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعاً وَأَنَابَ)[١٠٧] بەتاڵی و پووچیی ئەم چیرۆكەی روونكردووەتەوە وتوویەتی:

---

[١٠٥] (طه : ٢٠).

[١٠٦] مجمع البيان في تفسير القرآن للطبرسي، ب٧، ل٨.

[١٠٧] (ص: ٢١ـ ٢٤).

هیچ بناغەیەکی نییە. پاشان دەستی کردووە بە ڕاڤەی ئایەتەکە: وتوویەتی: بێ داوای لێخۆشبوون کردن لە لایەن داودەوە، لەبەر تاوانێکی بچووك بووە کە لێیەوە روویداوە، وتراوە سزا دراوە لەسەر هێنانی ئەو ژنەی کە (ئەوریا)ی کوڕی حەنان دەستی گرتبوو پێش داود، یان وتراوە ئەم داوای لێخۆشبوونکردنە لەبەرئەوەوە بووە کە داود پێغەمبەر ناڕەحەت نەبووە بۆ کوژرانی (ئوریا)ی کوڕی حەنان، چونکە ئارەزووی مارەکردن و هێنانی خێزانەکەی هەبووە، وتراوە ئەم داوای لێخۆشبوونکردنە لەبەر پەلەکردنی بووە لە دەرکردنی بڕیاری شەرعیدا[١٠٨].

٧ـ هەڵوێستی نەسەفی دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (مدارك التنزيل وحقائق التأويل):

نەسەفی لەم تەفسیرەیدا زۆر بە کەمی ئیسرائیلیات دەهێنێ، ئەوەشی دەیهێنێ لەم ئیسرائیلیاتە بەسەریدا تێپەڕی و بێ ئەوەی قسەی لەسەر بکات و لێی بدوێت، هەندێجار قسەیان لەسەر دەکات و پێیان ڕازی نییە، بۆ نموونە دەبینین لە کاتی تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ)[١٠٩]. دەڵێ: گێڕدراوەتەوە کە کۆترەباریکەیەك هاواری کرد، ئەویش هەواڵیدا کە دەڵێ: خۆزگا دروستکراوەکان هەر نەبوونایە. تاوسێك زریکاندی، وتی: ئەوە دەڵێ وەکو قەرز وەردەگریت، دەبێ قەرز بدەیتەوە. پەپووسولەیمانەیەك خوێندی و وتی: ئەوە دەڵێت ئەی گوناهبارینە داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن. شەمشەمەکوێرەیەك دەنگی لێوەهات، وتی: ئەوە دەڵێت چاکە بکەن دەیبیننەوە. وتی: قەتێ دەڵێت هەرکەس بێدەنگ بێت، پارێزراوە. وتی: کەڵەشێر دەڵێت ناوی خودا ببەن ئەی بێئاگایان. وتی: سیسارکە کەچەڵە (النسر) دەڵێ هەرچەندێ دەدەیت بژیت،

---

[١٠٨] مجمع البيان في تفسير القرآن، ب٨، ل٤٧١ـ ٤٧٢.

[١٠٩] (النمل: ١٦).

کۆتاییەکەت هەر مردنە.... هتد. پاشان قسە دەکات لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وأتينا من كل شيء). واتە: لە هەموو شتێکمان پێدراوە، بێ ئەوەی کە قسە بکات یان بدوێ لەسەر ئەو شتانەی کە هێنانی و باسی کردن[110]. بۆ نموونە لە کاتی راڤەی ئەم ئایەتەدا: (وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَى كُرْسِيِّهِ جَسَداً ثُمَّ أَنَابَ)[111]. دەبینین لێرەدا هەندێ گێڕانەوە دەهێنێت کە لە پارێزراوی (عصمة)ی سولەیمان پێغەمبەردا هەرگیز ناگونجێ. پاشان دەڵێت: کە ئەمە دەقەکەیەتی (ئەوە دەگێڕدرێتەوە لە فەرموودەی ئەنگوستیلە و شەیتان و پەرستنی بت لە ماڵی سولەیمان پێغەمبەردا، ئەوە لە شتە هەڵە و پووچەکانی شەیتانە[112].

لەم ئایەتەدا نەسەفی دەبینین هۆشداری و ئاگاداری دەدات و بەرپەرچی ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوانە دەداتەوە کە لەگەڵ پارێزراووی (العصمة)ی پێغەمبەراندا ناگونجێ، لێرەدا نەرمی نانوێنێ و لەمەوپێش نموونەمان هێنایەوە، لەوانەیە پێی وابێت کە هەر شتێك بیروباوەڕ لەکەدار نەکات، دەتوانرێ بگێڕدرێتەوە و قسەی لەسەر نەکرێت، مادام راست بێت یان درۆ بێت لە خودی خۆیدا و دژایەتی لەگەڵ وێڵ و ئاوەزدا نەبێت و لەگەڵ شەرعدا پێکدا بدەن[113].

٨ـ هەڵوێستی خازن دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا: (لباب التأويل في معاني التنزيل):

خازن لە پەرتووکەکەیدا زۆر گێڕانەوەی راڤەی جێماو لە هاوەڵ و شوێنکەوتووانەوە (التفسير المأثور) دێنێت، تا ئەندازەیەك، گرنگی دەدات بە باسکردنی بڕیار و بەڵگەکانیان. تەفسیرەکەی پڕە لە هەواڵ و باسی مێژوویی و

---

[110] (النمل: ١٦).

[111] (ص: ٣٤).

[112] تفسير النسفي، ب٤، ل٣٢.

[113] التفسير والمفسرون، ب١، ل٣٠٩.

ئەو چیرۆکە ئیسرائیلییانەی کە زۆربەیان پارێزراو نابن لە بەردەم تەرازووی زانیاریی راست و وێڵی ساغدا. ئەو بە فراوانی چیرۆکە ئیسرائیلییەکان دێنێت و زۆربەی کات هیچیان لەبارەوە نالێت و بە چاوی ڕەخنەگری بینا لێیان ناڕوانێ، ئەگەرچی لە هەندێ شوێندا چیرۆکەکە بەجێ ناهێڵێ بێ ئەوەی لاوازییەکەی روونبکاتەوە و ناڕاستییەکەی نیشان بدات، کە ئەمەش بە دەگمەن بەرچاو دەکەوێ[١١٤].

بۆ نموونە لە کاتی راڤەی ئەم ئایەتەدا: (وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ * إِذْ دَخَلُوا عَلَى دَاوُودَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ قَالُوا لَا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَى بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ فَاحْكُم بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَاهْدِنَا إِلَى سَوَاء الصِّرَاطِ * إِنَّ هَذَا أَخِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِيَ نَعْجَةٌ وَاحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ * قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَى نِعَاجِهِ وَإِنَّ كَثِيراً مِّنْ الْخُلَطَاء لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ وَظَنَّ دَاوُودُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعاً وَأَنَابَ).[١١٥] دەبینین کۆمەڵێ چیرۆك دەهێنێ کە زیاتر لە ئەفسانە و شتی پڕوپووچ دەچن، وەك چیرۆکی ئەو شەیتانەی کە خۆی لە شێوەی کۆترێکی ئاڵتوونیدا نیشان دا بە داود پێغەمبەر و چیرۆکی ئەو ژنەی کە چاوی پێی کەوت و جوانیی سەرنجی راکێشا و فێڵی لە مێردەکەی کرد تا کوژرا. ئەمەو چەندان گێڕانەوەی سەیر و نامۆ، بەڵام پاش هەموو ئەمانە دێت و دەڵێت: بەندێك دەربارەی دووریی داود پێغەمبەر لەو شتانەی کە شایانی نین و دەدرێنە پاڵی. لەم بەندەدا هەڵدەستێت بە هەڵوەشاندنەوە و تەفروتوناکردنی هەموو ئەو چیرۆك و

---

[١١٤] التفسير والمفسرون، ب١، ل٣١٢.

[١١٥] (ص: ٢١ـ ٢٤).

گێڕانەوانەی کە هێنابوونی و لەگەڵ پارێزراوی و پایەی پێغەمبەری خوا، داود، ناگونجێ[116].

بەڵام ئێمە (خازن) دەبینن تێدەپەڕێ بەسەر چیرۆکگەلێکی زۆرداو قسەیان لەسەر ناکات، کە بێگومان هەندێکیان لەوپەڕی نامۆیدان و هەندێکیان پایەی پێغەمبەرێتی لەکەدار دەکەن.

بۆ نموونە لە کاتی راڤەی ئەم فەرموودەیەی پەروەردگاردا: (إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَداً)[117]. دەبینین چیرۆکی یارانی ئەشکەوت دەهێنێت لەگەڵ هۆکاری چوونەکەیان بۆ ئەو ئەشکەوتە لە (محمد)ی کوڕی ئیسحاق و موحەممەدی کوڕی یەسارەوە، کە لەوپەڕی نامۆیی و درێژیدایە، لەگەڵ ئەوەشدا دەیهێنێت و بە یەك وشە لەبارەیەوە نادوێ[118].

٩ـ هەڵوێستی ئیبن کەسیر دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (تفسیر القرآن العظیم):

تەفسیری ئیبن کەسیر لە بەناوبانگترینی ئەو تەفسیرانەیە کە لە بواری راڤەی جێماو لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانەوە نووسراوە و لەم لایەنەوە بە پەرتووکی دووەم دەزانرێت پاش پەرتووکەکەی ئیبن جەریر. ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا گرنگیی داوە بە گێڕانەوە لە راڤەکارانی پێشینەوە (مفسري السلف)، تێیدا فەرموودەی خوای گەورە راڤە دەکات بە فەرموودە و وتەی هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان لەگەڵ سەنەدەکانیاندا، لەگەڵ قسەکردن لەسەر بریندارکردن (الجرح) یان بە دادگەر ژماردن (التعديل) لەکاتێکدا کە پێویست بێت. باسی زۆر لەو شتانەی ئیبن کەسیر جیادەکاتەوە لە راڤەکارانی تر، ئەوەیە ئاگاداری دەدات

[116] تفسير الخازن، ب٦، ل٣٨ـ ٤٢.

[117] (الكهف: ١٠).

[118] تفسير الخازن، ب٤، ل١٦٠ـ ١٦٥.

لەبارەی ئەو ئیسرائیلیاتانەوە کە لە تەفسیری مەئسوردا بەدی دەکرێن و هەندی جار بە کورتی هۆشداری دەدات لەبارەیانەوە و هەندێ جاری تریش خراپی و نابەجێییان باس دەکات و دەخاتە ڕوو[119]. بۆ نموونە لە کاتی ڕاڤەی ئایەتی: (وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُواْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُواً قَالَ أَعُوذُ بِاللّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ)[120]. دەبینین چیرۆکێکی درێژ و نامۆمان بۆ دەگێڕێتەوە لە گەڕانیان بە شوێن ئەو مانگە تایبەتییەدا کە دەیانویست و دۆزینەوەی لای کابرایەکی بەنی ئیسرائیلی کە زۆر بەرامبەری باوکی باش بوو... هتد، هەرچییەك لەوبارەوە وترا بێت، هەمووی دەگێڕێتەوە لە هەندێ زانایانی پێشینەوە. پاشان دوای ئەوەی لە باسەکە دەبێتەوە، دەڵێت: ئەم داڕشتن و باسکردنانە لە عوبەیدە و ئەبوعالیە و سودیەوە هاتووە کە جیاوازییان تێدا هەیە، وا دەردەکەوێ کە لە پەرتووکی بەنی ئیسرائیلییەکانەوە وەرگیراوە و لەو شتانەیە کە دروستە بگێڕدرێتەوە، بەڵام نە بە درۆ نە بە ڕاست، نادرێتە قەڵەم. لەبەرئەوە پشتی پێنابەسترێت، مەگەر لەگەڵ پێوەری ڕاستییەکانی لای ئێمەدا بگونجێ. خوا زاناترە[121].

١٠- هەڵوێستی خەتیبی شەربینی دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (السراج المنير في الإعانة على معرفة بعض معاني كلام ربنا الحكيم الخبير):

تەفسیری خەتیب بە ئاسانی سوودی لێوەردەگیرێت و دەستەواژەکانی جوان و سەرنجڕاکێشن. درێژ و بێزارکەر نین و کورت و لەکەدار نین. خاوەنەکەی هەندێ ڕاڤەی بەجێماوی لە پێشینانەوە وەرگرتووە و گرنگی دەدات بە وردەکارییە ڕاڤەییەکان و باسی گونجانی نێوان ئایەتەکان دەکات و بڕیارە فیقهییەکانیش

[119] التفسير والمفسرون، ب١، ل٢٤٥.

[120] (البقرة : ٦٧).

[121] تفسير ابن كثير، ب١، ل١٠٨- ١١٠.

دەخاتە ڕوو. تەفسیری خەتیب خاڵی نییە لە هێنانی هەندێ لە چیرۆکە ئیسرائیلییە نامۆکان، ئەوەش بێ ئەوەی بە ڕاست و درووستیان بداتە قەڵەم، یان لاوازییان بخاتەڕوو. بۆ نموونە لە کاتی ڕاڤەی ئایەتی: (وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ)[١٢٢]. دەبینین هەواڵێکی درێژ لە کەعبەوە دەگێڕێتەوە کە تێیدا هاتووە: لای سولەیمان پێغەمبەر بووم هاواری کرد، وتی: دەزانن چی دەڵێت: وتیان نەخێر. وتی: دەڵێت بۆ مردن لە دایك بن و بۆ وێرانبوون بنیات بنێن. کۆترەباریکەیەك گماندی، وتی: دەزانن چی دەڵێت؟ وتیان: نەخێر. وتی: دەڵێت: خۆزگایە دروستکراوەکان هەر دروست نەکرانایە، .... هتد، باسی لە دەنگ و هاواری زۆر لە ئاژەڵانی تر کردووە، پاشان خەتیب بەسەریاندا ڕادەبورێت بێ ئەوەی قسەیان لەسەر بکات بە یەك وشە، لەگەڵ ئەوەشدا کە چیرۆکەکە لەوپەڕی نامۆیدا بێت[١٢٣]. بەڵام خەتیب ئەگەرچی بەسەر ئەم جۆرە چیرۆکانەدا تێپەڕ دەبێت بێ ئەوەی قسەیان لەسەر بکات، ڕێگە بەخۆی نادات کە بەسەر چیرۆکێکدا تێپەڕێ کە پایەی پێغەمبەرێتی لەکەدار دەکات، تا قسەی لەسەر نەکات و پووچی و ناڕاستیی نەخاتەڕوو[١٢٤].

١٠ـ هەڵوێستی ئالووسی دەربارەی ئیسرائیلیات لە پەرتووکەکەیدا (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني):

ئەوەی لەسەر ئالووسی تێبینی دەکرێت، ئەو ڕەخنەی توند لە ئیسرائیلیات و ئەو هەواڵە درۆیانە دەگرێت کە زۆرێك لە ڕاڤەکارانی قورئان ئاخنیویانەتە ناو تەفسیرەکانیانەوە و گومانی ڕاستی و دروستییان لێیان هەبووە، لەگەڵ

---

[١٢٢] (النمل: ١٦).

[١٢٣] تفسير الخطيب، ب٣، ل٤٣ـ ٤٤.

[١٢٤] سەرچاوەی پێشوو، ب٣، ل٣٨٤ـ ٣٨٦. بۆ درێژەی زیاتر تەماشای التفسير والمفسرون بکە، ب١، ل٣٤٣ـ ٣٤٤.

گاڵتەکردن پێیان لە هەندێکجاردا. ئالووسی خاوەنانی ئیسرائیلیات بە (أرباب الأخبار) واتە: خاوەنانی هەواڵەکان ناو دەنێت و متمانەی پێیان نییە، بە یەکجاری گێڕدراوەکانیان دەداتە دواوە و ئاوات دەخوازێت کە لە پەرتووکی زانا ئیسلامییەکاندا نەهاتنایە[١٢٥].

ئالووسی گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان بە درێژی باس دەکات، هەروەك بیەوێت ئاگاداری ئەو درۆیانە بێت کە گونجاو نییە عەقڵی ساغ بە راستیان بزانێ و باوەڕیان پێ بکات. پاشان وتەی زانایان دێنێت بۆ پووچکردنەوەیان[١٢٦].

بۆ نموونە لە کاتی راڤەی ئەم ئایەتەدا: (وَلَقَدْ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيباً وَقَالَ اللّهُ إِنِّي مَعَكُمْ)[١٢٧]. دەبینین چیرۆکێکی سەیروسەمەرەمان بۆ دەگێڕێتەوە لەبارەی (عوج)ی کوڕی عونقەوە لە بەغەوییەوە. بەڵام پاش لێبوونەوە لێی، دەڵێت: کاری عەوجی کوڕی عونق لای خەڵکی ئاشنایە و چەندان چیرۆك و حیکایەتی گەندی لەسەر هێنراوە کە هیچ بنەما و بناغەیەکیان نییە. هەروەها دەڵێت: ئەم چیرۆکانە دەستهەڵبەستی جوو و دیانەکانە و لە سەردەمی (نوح) پێغەمبەردا نەبووە و هیچێك لە بێ باوەڕان باوەڕیان نەهێناوە[١٢٨].

لەگەڵ دانەدواوەی توندی ئالووسی بۆ ئیسرائیلیات و چیرۆك و هەواڵە خورافییەکان، هەندێ جار چیرۆکێك یان باسێکی ئیسرائیلیی لە دەست دەردەچێت: لە کاتی لێکدانەوەی عەساکەی موسا پێغەمبەردا، ئەو ڕایە دەهێنێت کە دەڵێت ڕایەکی ناسراو و بڵاوە و پێی وایە: لە داری (ئاس) دروست کراوە و

---

[١٢٥] الآلوسي مفسراً، ل٢٨٢ .

[١٢٦] الآلوسي مفسراً، ل٢٨٢.

[١٢٧] (المائدة: ١٢).

[١٢٨] تفسير الآلوسي، ب٦، ل٨٦ـ ٨٧.

درێژیی (١٠) باڵە وەك ئەندازەی باڵی موسا پێغەمبەر، دوو لەپی (لقی) هەبووە کە لە تاریکیدا دادەگیرسان، کە بچووك و گەورە بە میرات وەریدەگرت، تا گەیشتە دەستی (شوعەیب) پێغەمبەر و لەوێشەوە بۆ موسا پێغەمبەر. هەمدیس گێڕدراوەتەوە کە ژمارەی بەنی ئیسرائیل لە کاتی سەرگەردانی و ڕێلێتێکچوونەکەدا گەیشتە (٦٠٠٠٠٠) کەس، جگە لە ئاژەڵەکانیان و فراوانیی لەشکرگەکەیان ١٢ میل بوو[١٢٩].

هەروەها هەر راڤەکەرێکی قورئان رێباز و شێوازی تایبەتی خۆی هەبووە لە مامەڵە کردنی لەگەڵ ئیسرائیلیاتدا، باشترین رێگە و رێبازی ناو ئەم رێبازانە، ئەو پەیڕەو و شێوازەیە کە میانەڕەوانە مامەڵەی لەگەڵ ئەم ئیسرائیلیاتانەدا کردووە و نە هەموو گێڕانەوە ئیسرائیلییاتەکانی وەرگرتووە و نە هەمووشیانی داوەتە دواوە، بەڵکو بە تەنها ئەوانەی پەسەند کردووە کە ئاوەز و عەقڵ و شەرع گەواهیی ڕاستی و ساغیی بۆ داون.

---

[١٢٩] الآلوسي مفسراً، ل٢٨٦ـ ٢٨٧.

# کۆتایی

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، گەیشتمە کۆمەڵێك دەرئەنجام، کە گرنگترینیان لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەخەمەڕوو:

١ـ بێگومان زاراوەی ئیسرائیلیات هەموو ئەو شتانە دەگرێتەخۆ کە هاتوونەتە ناو ڕاڤەی قورئانەوە، لەو ئەفسانە کۆنانەی کە لە بناغەی گێڕانەوەیاندا دراونەتە پاڵ سەرچاوەیەکی جوویی یان دیانی، یان جگە لەم دوانە. بۆیە بۆ هەموو ئەو شتانە وشەی ئیسرائیلیات بەکارهێنراوە، لەسەر یاسای زاڵکردنی ڕەنگ و ڕەگەزی جوو بەسەریاندا.

٢ـ بەڕاستی هەواڵ و سەرگوزەشتە ئیسرائیلییەکان هەموویان تێکڕا نادرێنە دواوە و ڕەفز ناکرێن ـ وەك هەندێ کەس وێنای دەکات ـ بەڵکو هەندێکی هەیە کە دروست و پەسەندە، ئەوەش ئەوەیە کە گەواهێکی شەرعی پشتیوانیی دەکات. هەندێکی وەرنەگیراو و ناپەسەندە، ئەمەش ئەو بەشەیە کە دژایەتیی لەگەڵ عەقڵ و شەرعدا هەیە. هەندێکی تریشی بێدەنگیی لێ کراوە لەلایەن زانایانەوە، نە لە بەشی پەسەندە و نە لە بەشی ناپەسەند، نە باوەڕی پێ دەکرێت و نە بە درۆ دەدرێتە قەڵەم، بەڵام گێڕانەوەی ڕێگەپێدراوە بە مەبەستی پەند لێوەرگرتن.

٣ـ هاوەڵان دەگەڕانەوە بۆ لای دیان و جووەکان و ڕا و گێڕانەوەی ئەوانیان وەردەگرت لە ڕاڤەی قورئاندا، بەڵام لە چەند سنوورێکی تەسکدا. پرسیاریان لێ نەکردوون لەبارەی بابەت و شتانێکەوە کە پەیوەندیی بە بیروباوەڕ و بڕیارە شەرعییەکانەوە بووبێت، مەگەر لە ڕێگەی بەڵگەهێنانەوە و بۆ پاڵپشتیی ئەو بابەتانە بووبێت کە قورئان هێنابوونی.

٤ـ شوێنکەوتووانی هاوەڵان (تابعین) زۆرێك لە ئیسرائیلیات و نەصرانییات (ڕاوبۆچوونی دیانەکان)یان خستووەتە ناو ڕاڤەی قورئانەوە، بێ ڕەخنە و پشکنین، لەسەر ڕێبازی هاوەڵان نەچوون بەڕێوە لە مامەڵەکردن لەگەڵ گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان.

٥ـ کۆمەڵێك هۆکار و فاکتەر هەن کە یارمەتیدەرن بۆ وەرگرتنی ئیسرائیلیات و هاتنیان بۆ ناو راڤەی قورئان، کە هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ لایەنی ئاینی و هەندێکی تریان پەیوەندییان بە بوارەکانی کۆمەڵایەتییەوە هەیە. لە گرنگترین ئەو هۆکارانە، ئەوەیە کە قورئان هاودەنگ و رایە لەگەڵ تەورات و ئینجیلدا لە دارشتن و باسکردنی چیرۆکی پێغەمبەراندا و هەواڵ و باسی نەتەوە رابوردووەکاندا، بەڵام لەگەڵ جیاوازییەك لە چۆنیەتی باسکردن و دارشتنەکەدا، چونکە قورئان ئەم چیرۆکانە دێنێ بەشێوەیەکی کورت و کۆتا، لەگەڵ جەختکردن لەسەر چەند شوێنێك لە چیرۆکەکاندا. لە هەمانکاتدا تەورات و ئینجیل بە درێژی چیرۆکەکان باس دەکەن. موسڵمانانیش کاتی خۆی دەگەڕانەوە بۆ لای جوو و دیانەکان بۆ زانینی ئەم درێژی و لایەنانە بە پاڵنەری زانستخوازی، لەبەرئەوەی مرۆڤ هەمیشە حەزی لە زیادکردن و زیاتر بەدەستهێنانی زانیاری هەیە.

٦ـ هەندێ لە گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان شوێنەواری خراپیان لەسەر نەتەوەی ئیسلامی جێهێشتووە و لەنێوان رۆڵەکانیدا هەندێ هزر و بیرۆکەی لاتەریب و لارێیان بڵاوکردووەتەوە.

٧ـ هەڵوێستی راڤەکارانی قورئان بەرامبەر گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان جۆربەجۆر و جیاوازە، هەندێك لەوان لێیان دوورکەوتوونەتەوە لە تەفسیرەکانیاندا و هۆشیارییان داوە لە گێڕانەوەیان، هەشیانە بە بەرفراوانی ئەم گێڕانەوانەی هێناوە بێ ئەوەی لێیان بکۆڵێتەوە و رەخنەیان لێ بگرێت. هەندێکی تریان تەنها ئەو گێڕانەوە ئیسرائیلییانەی هێناوە کە پەیوەندیی بە بیروباوەڕ و بڕیارەکانەوە نییە و دژایەتیی عەقڵ و ئاوەزی ساغ ناکەن، نە هەموویانی داوەتە دواوە و نە هەمووشیانی پەسەند کردووە و وەرگرتووە، بەڵکو میانەڕەوانە مامەڵەی کردووە و باشترینی کار و شتەکان ناوەندەکانیانە.

٨ـ ناگونجێ و نابێ پەنجەی تۆمەت درێژ بکەین بۆ جەمسەران و سەرانی گێڕانەوە ئیسرائیلییەکان، ئەوانەی کە زۆربەی ئەو گێڕانەوانە لە تەفسیرەکاندا پرژ

و بڵاون و لەسەر شانی ئەمانە، ئەوانەش وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، وەهەبی کوڕی مونەبیە، کەعبی ئەحبار، بە کەمنرخ تەماشایان نەکەین، بەڵام پێویستە ئەوەی کە لێیانەوە دەگێڕدرێتەوە، بە پێوەری شەرع و عەقڵ بپێورێت، بۆ دڵنیابوون لە راستی و ناڕاستییان.

## سەرچاوەکان:

أ ـ القرآن الكريم.

١ـ الإتقان في علوم القرآن، جلال الدين عبد الرحمن بن أبـي بكر بن محمد بن سابق الدين السيوطي، مطبعة حجازي، ط٢، القاهرة، سنة ١٣٦٨ هـ.

٢ـ الاتجاهات الفكريّة في التفسير، الدكتور الشحات سيد زعلـول، الهيئـة المصـريّة العامة للكتاب، ط١، سنة ١٣٩٥هـ ١٩٧٥م.

٣ـ أسد الغابة في معرفة الصحابة، ابن الأثير الجزري، الهيبة، ط٢، ١٢٨٠ هـ.

٤ـ أنوار التنزيل وأسرار التأويل، ناصر الدين أبـي سعيد عبد الله بن عمر بن محمد الشيرازي البيضاوي، مؤسسة شعبان للنشر والتوزيع، ط٢، بيروت.

٥ـ الآلوسي مفسّراً، محسن عبد الحميد، مطبعة المعارف، ط١، بغداد، ١٩٦٩م.

٦ـ البغوي ومنهجه في التفسير، عفاف عبد الغفـور حميـد، مطبعـة الإرشـاد، ط١، بغداد، ١٩٨٣م.

٧ـ تاريخ الأمم والملوك، محمد بن جرير بـن يزيـد المعـروف بـالطبري، القـاهرة، المطبعة الحسينية المصريّة ١٣٢٦هـ.

٨ـ تاريخ بغداد: الخطيب البغدادي، القاهرة، مطبعة السعادة، ط١، ١٩٣٠م.

٩ـ التنبيه والرّد على أهل الأهواء والبدع: أبو الحسن الملطي، ط٢،سنة ١٣٦٩هـ – ١٩٤٩م.

١٠ـ تفسير القرآن العظيم، عماد الدين إسماعيل بن عمر بن كثير، القاهرة، مطبعـة مصطفى محمد، سنة ١٩٣٧م.

١١ـ التفسير والمفسّرون، محمد حسين الذهبــي، القـاهرة، مطبعـة السـعادة سـنة ١٣٩٦هـ – ١٩٧٦م، (الطبعة الثانيّة).

١٢ـ تاريخ الفلسفة العربية: حنا الفاخوري، وخليل البصر، بيروت دار المعارف.

١٣ـ تهذي التهذيب: ابن حجر العسقلاني، طبع الهند ١٣٢٥هـ.

١٤ـ الجانب الإلهي من التفكير الإسلامي، الدكتور محمد البهي، القاهرة، مطبعة مخيمر (الطبعة الثالثة).

١٥ـ الجدال بين المسلمين والنصارى: أبو الفضل المالكي، طبع بريل سنة ١٨٩٠م.

١٦ـ جامع البيان في تفسير القرآن، محمد بن جرير الطبري، القاهرة، المطبعة الأميريّة، سنة ١٣٢٣ هـ، (الطبعة الأولى).

١٧ـ حلية الأولياء وطبقات الأصفياء: لأبي نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني، القاهرة، مطبعة السعادة، سنة ١٣٥١هـ ١٩٣٢م، (الطبعة الأولى).

١٨ـ روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، شهاب الدين الآلوسي، المطبعة المنيريّة (الطبعة الثانية).

١٩ـ صحيح البخاري: محمد بن إسماعيل أبو عبد الله البخاري الجعفي (ت ٢٥٦ هـ)، تحقيق د. مصطفى ديب البغا، دار ابن كثير، اليمامة — بيروت، ط٣، ١٩٨٧م — ١٤٠٧هـ.

٢٠ـ عيون الأخبار: ابن قتيبة الدينوري، القاهرة، مطبعة دار الكتب المصريّة سنة ١٩٢٥م (الطبعة الأولى).

٢١ـ فتح الباري بشرح صحيح البخاري: ابن حجر العسقلاني، المطبعة الخيريّة بمصر سنة ١٣٢٩ هـ.

٢٢ـ الفصل في الملل والأهواء والنحل: ابن حزم الظاهري، المطبعة الأدبية، سنة ١٣١٨ هـ.

٢٣ـ فِرق الشيعة: الحسن بن موسى النوبختي، إستامبول، مطبعة الدولة، سنة ١٩٣١م (الطبعة الأولى).

٢٤ـ الفرق بين الفِرق: أبو منصور البغدادي، القاهرة، مطبعة المعارف، (الطبعة الثانيّة).

٢٥ـ فجر الإسلام: أحمد أمين، دار الكتاب العربـي، بيروت، لبنـان سـنة ١٩٦٩م، (الطبعة الأولى).

٢٦ـ الكشّاف عن حقائق التنزيل، وعيون الأقاويل، في وجوه التأويل: محمـود بـن عمر الزمخشري، القاهرة، المطبعة الأميريّة، بولاق سنة ١٣١٨هـ (الطبعة الثانية).

٢٧ـ الكامل في التاريخ: ابن الأثير، ليدن، مطبعة توربنرج، سنة ١٨٦٦.

٢٨ـ مجمع البيان في تفسير القرآن: الفضل بن حسن الطبرسي، مؤسسـة الأعلمـي للمطبوعات، بيروت — لبنا، سنة ١٤١٥ هـ — ١٩٩٥م (الطبعة الأولى).

٢٩ـ مدارك التنزيل وحقائق التأويل: الإمام عبد الله بن أحمد بن محمود النسـفي، دار القلم، بيروت — لبنان، ط١، ١٤٠٨هـ، ١٩٨٩م.

٣٠ـ المسند: للإمام أحمد بن حنبل، القاهرة، مطبعة اليمنية، ١٣١٣هـ.

٣١ـ مقدمة في أصول التفسير، ابن تيميّة الحراني، مطبعـة الترقـي، دمشـق، سـنة ١٣٥٥هـ، سنة ١٩٣٦م، (الطبعة الأولى).

٣٢ـ مقدمة ابن خلدون: ولي الـدين، عبـد الـرحمن بـن محمـد بـن خلـدون مطبعـة مصطفى محمد، ١٣٢٧هـ.

٣٣ـ الملـل والنحـل: محمـد بـن عبـد الكـريم الشهرسـتاني، مطبعـة الأزهـر سـنة ١٣٧٥هـ، سنة ١٩٥٥، (الطبعة الأولى).

٣٤ـ مناهج المفسّرين: مساعد مسلم آل جعفر ومعي هلال السرحان، دار المعرفة، سنة ١٩٨٠. (الطبعة الأولى).

٣٥ـ ميزان الاعتدال في نقد الرجال: شمس الدين الذهبـي، مطبعـة السـعادة، سـنة ١٣٢٥هـ، (الطبعة الأولى).




# بنچینەی شیعری جاهیلی و
# گومانی ڕەنگدانەوەی لە قورئاندا

د. ئیسماعیل بەرزنجی

# پێشەکی

بڕوابوون بە ڕاست و دروستیی قورئان و ئەوەی کە وتەی خوای گەورەیە، مەسەلەیەکی بێچەندوچوونە و پێویستی بە هیچ پاساوێك نییە لەلای تاکی مسوڵمان، چونکە بەشێکە لە ئیمان و بڕوابوونی، بەڵام ڕەتکردنەوەی ئەو گومان و دوودڵییانەی کە لە دەوروبەری قورئان دەوروروژێنرێن، پێویستی بە بەڵگە و پاساوی عەقڵی و لۆجیکی هەیە، چونکە ئەوانەی ئەم گومانانە دەوروروژێنن، کەسانێکن لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام و بێبڕوان بەو قورئانە، بۆیە ناکرێ بە لۆجیکێکی ئیسلامییانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو هەر لەو شوێنەوە کە دەست پێدەکەن و بەو شێوەیەی کە گومان دروست دەکەن، دەبێت وەڵام بدرێنەوە.

گرنگیی ئەم بابەتە لەوەوە دێت کە هەر بەو لۆجیك و شێوازەی هێرش دەکرێتە سەر قورئان، بەرەنگاریی دەکات و هەر لەو شوێنەوە کە دەکرێتە خاڵی ڕەخنەگرتن، ڕەگ و ڕیشاڵی گومانەکە وشك دەکات و سەرچاوەی لێڵ و ناڕۆشنی ئاشکرا دەکات. بۆ ئەمەش پشت دەبەستێت بە ڕای مێژوونووسان و لێکۆڵەران و بنەماکانی ڕەخنەی هاوچەرخ، کە زۆربەیان ڕەگوڕیشەیان دەگەڕێتەوە بۆ کلتووری ڕۆژئاوا، لەوانە ڕای ڕۆژهەڵاتناسان و تەها حوسێن، کە ڕێبازی لێکۆڵینەوەکەی نزیکە لەوانەوە، پاشان بنەماکانی ڕەخنەی کلتووری. بۆ ئەمەش کۆمەڵێك سەرچاوەی جۆراوجۆر بوونەتە پاڵپشت و بەڵگەی بەهێز، کە هەندێکیان کۆنن و نزیك لە سەردەمی نووسینەوەی شیعری جاهیلی دانراون، هەندێکیشیان نوێن و بۆچوونی توێژەرانی ئەم سەردەمە دەردەخەن، لە کۆتاییشدا گرنگترین ئەنجام هاتووەتە بەرهەم کە پووچەڵکرنەوەی گومانی ڕەنگدانەوەی شیعری جاهیلییە لە قورئاندا و سەلماندنی ئەوەیە کە ئەم گومانە هەر لە بنەڕەتدا بێ بنچینەیە.

٢٠١١/١١/٢١

سلێمانی

# لەیەکچوونی شیعری جاهیلی و قورئان

وەکو زۆرێك لە گومانەکانی تر، مەسەلەی تێکەڵبوونی شیعری سەردەمی جاهیلی بە قورئان، یاخود ڕەنگدانەوەی ناڕاستەوخۆیان تیایدا، لە ئێستادا دەورووژێنرێت، لە چوارچێوەی ئەو هەڵمەتە جیهانییەدا کە دژ بە قورئان بەڕێوەدەچێت. بێگومان ئەم بابەتەش نوێ نییە و لە ئێستادا دۆزرابێتەوە، بەڵکو جوینەوەی چەند مەسەلەیەکی کۆن و هەڵبەستراو و بێ بنچینەیە، تەنانەت لای خاوەنەکانیشیان ڕاستییەك لە خۆیان ناگرن و تەنها بۆ درووستکردنی گومان و دوودڵین لە ناو مسوڵماناندا.

دیارە مەبەستیش لێی بێ بەهاکردنی قورئانە و داڕنینی سیفەتی ئاسمانی و خوداوەندییە لێی، بۆ ئەوەی بڵێن قورئان لە خودی موحەممەدەوە (درودی خوای لەسەر بێت) سەرچاوەی گرتووە و ئەوەتا کاریگەریی شاعیرانی پێش ئیسلامی لەسەرە، جا بە ئاگایی بێت یان بە شێوەی کەڵەکەبوون لە بیرەوەریدا.

مەعلومە ئەوەی کە شارەزابێت لەم بوارەدا، نەزۆکیی ئەم گومانانەی لا ڕوونە، بەڵام بۆ کەسانێك کە زانیارییەکی ئەوتۆیان دەربارەی شیعری جاهیلی و چۆنیەتی ژیان و گوزەرانی عەرەب نەبێت لە پێش ئیسلامدا، جێگای هەڵوەستەکردنە، چونکە ئەم بابەتە لە چەند ڕوویەکەوە گومان درووست دەکات، گرنگترینیان ئەوەیە کە شیعر لە پێش هاتنی ئیسلامدا جێگای بایەخی زۆر بووە لای عەرەب و سەرتاپای ژیانیانی داگیرکردووە، تا ئەو ڕادەیەی وتراوە جێگای هەموو زانستێکی گرتووەتەوە، هەروەها شاعیری زۆر و شیعری بەهێزیان هەبووە.

لەلایەکی ترەوە، ئەو سەردەمە لە ڕووی مێژووییەوە پێش ئیسلام و هاتنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بووە، لە هەمووشی گرنگتر، هاوشێوەیی و لەیەکچوون لە نێوان ئایەتەکانی قورئان و شیعری جاهیلیدا هەیە، جا بۆ ڕەواندنەوەی ئەم گومانە و بۆ ئەوەی لای هەموو خوێنەرێکی کورد ڕاستییەکان ڕوون و ئاشکرا بن، بە پێویستم زانی وەك بەشێك لە پسپۆڕییەکەم، تیشك بخەمە

سەر ئەم مەسەلەیە، بەتایبەتی کە لەم دواییانەدا هەندێك میدیای کوردی بە مەبەست بێت یان نەزانی، دەرگای ئەم بابەتەیان کردووەتەوە.

سەرەتا با بەم پرسیارە دەست پێ بکەین: ئایا لەیەکچوون لە نێوان هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان و بەشێك لە شیعری جاهیلیدا هەیە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، هەر ئەمەشە کراوە بە دەروازەیەك بۆ دروستکردنی ئەو گومانە بێ بنچینەیە، وەکو ئەم نموونانەی کە دێن:

ئەمە بەشێکە لە شیعری (امرؤ القیس):

**دنت الساعة وانشق القمر ... عن غزال صاد قلبي ونفر**

**أحورٌ قد حرتُ في أوصافه ... ناعس الطرف بعينيه حوَر**

**مرّ يوم العيد بي في زينة ... فرماني فتعاطى فعقر**

**بسهامٍ من لحاظٍ فاتك ... فرَّ عنّي كهشيم المحتظر**

**وإذا ما غاب عني ساعة ... كانت الساعة أدهى وأمر**

**كُتب الحُسن على وجنته ... بسحيق المسك سطراً مختصر**

**عادةُ الأقمارِ تسري في الدجى ... فرأيتُ الليل يسري بالقمر**

**بالضحى والليل من طرته ... فرقه ذا النور كم شيء زهر**

**قلت إذ شقّ العذار خده ... دنت الساعة وانشق القمر**

ئەو ئایەتانەی لەیەکچوونیان هەیە لەگەڵ ئەم دەقە شیعریەدا:

﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وانْشَقَّ القَمَرُ﴾ (سورة القمر ١).

﴿فَنَادَوا صَاحِبَهُم فَتَعَاطَى فَعَقَرَ﴾ (سورة القمر ٢٩).

﴿كَهَشِيمِ المُحْتَظَرِ﴾ (سورة القمر ٣١).

﴿بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ﴾(سورة القمر٤٦).

﴿والضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى﴾ (سورة الضحى ١-٢).

ئەمانە و چەند نموونەیەکی تر دەهێنرێنەوە بۆ ڕەواجدان بەو گومانەی سەرەوە، بەڵام با بزانین ئەم لەیەکچوونە لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئایا ئەوە شیعری جاهیلییە لە قورئاندا ڕەنگی داوەتەوە؟ یان ئەو شیعرەی بە ناوی جاهیلییەکانەوە بڵاوکراوەتەوە کاریگەریی قورئانی لەسەرە؟ تۆ بڵێی کامیان لەویتردا ڕەنگیدابێتەوە؟

لەوانەیە بوترێت: شیعری جاهیلی بە چەندان ساڵ پێش دابەزینی قورئان هەبووە و وتراوە، چۆن دەکرێ بە قورئان کاریگەر بووبێت؟ خۆ شاعیرانی عەرەب بە چەندین ساڵ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) هەبوون و شیعریان وتووە، بەڵام هەر لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتەشە دەمانگەیەنێتە ئەنجام، بۆ وەڵامی ئەمە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ بنچینە و مێژووی ئەم شیعرە و چۆنیەتی نووسینەوە و ڕای توێژەران لەسەری، تا نهێنیی ئەم لەیەکچوون و کاریگەرییە ئاشکرا بکەین، چونکە ئەوانەی ئەم گومانە دروست دەکەن بەهیچ جۆرێك خۆیان لەم بابەتە نادەن و وا لە بەرامبەر دەگەیەنن کە بوونی ئەم شیعرە هیچ گومانی لەسەر نییە و مێژوویەکی بێ کێشە و گرفتە، کە لەڕاستیدا بە پێچەوانەی ئەمەوەیە. بۆیە کاتێك مەسەلەی ڕاستی و دروستیی ئەم شیعری جاهیلییە دەخرێتە بەر باس، خوێنەر بە ئەنجامێکی ڕوون و ئاشکرا دەگات بەبێ زۆر لەخۆکردن، کە ئەویش پێچەوانەی ئەو گومانەی سەرەوەیە.

## شیعر لە سەردەمی جاهیلیدا

زۆربەی مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن کە سەردەمی جاهیلی لە ژیانی عەرەبدا (بەو ماوەیە دەوترێت کە دەکەوێتە نێوان عیسی (سەلامی خوای لێبێت) و پێغەمبەر موحەممەد دروودی خوای لێبێت)، بەڵام زانیاری و هەواڵی ئەو ماوە زۆرە، لەبەردەستدا نییە، بەڵکو ئەو شتانەی گێڕدراونەتەوە لە شیعر و ژیاننامە و خەبەر دەگەڕێنەوە بۆ نزیکەی سەدو پەنجا ساڵ بەر لە هاتنی ئیسلام، بۆیە بەو

ماوەیە وتراوە سەردەمی جاهیلی و ئەوەی پێشوو بە (جاهیلیەتی یەکەم) ناودەبرێت[1]، ئەو ماوەیەش مێژوویەکی دوورودرێژە و لەبەرئەوەی لە دوورگەی عەرەبیدا خوێندن و نووسین بەربڵاو نەبووە و عەرەب لە هەموو ڕوویەکەوە دواکەوتوو بوون، نەیانتوانیوە مێژوو و کلتووری خۆیان تۆمار بکەن، لە ناویشیاندا شیعری شاعیرەکانیان نەنووسیوەتەوە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە شاعیر لەو سەردەمەدا هەبوون و شیعری زۆریشیان وتووە، بەڵام نە خۆیان نە کەسانی تر تۆماریان نەکردوون و نەنووسراونەتەوە، ئەوەشی ئێستا لەبەردەستدایە ڕاوبۆچوونی جیاوازی مێژوونووسان و توێژەرانی لەسەرە، هەروەکو لە دواتردا شیی دەکەمەوە.

بەڵام ئەوەی لەبەردەستدایە و بەناوی شیعری جاهیلییەوە ناونراوە، دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٥٠) پەنجا ساڵ بەر لە هاتنی ئیسلام و گوایە شیعری شاعیرەکانی ئەو سەردەمەیە و دەماودەم گێڕدراونەتەوە، بۆیە هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن کە بە هیچ جۆرێك شیعری جاهیلی لە سەردەمی خۆیدا و لە ژیانی پیش ئیسلامدا تاکە یەك دێڕیشی لێ نەنووسراوەتەوە، ئەوەشی دەوترێت سەبارەت بە (قەسیدە هەڵواسراوەکان) کە گوایە بە ئاوی ئاڵتوون نووسراونەتەوە، ئەوا وەکو باقیی شیعری جاهیلی گومانی زۆری لەسەرە[2]، ئەمەش بە دوو بەڵگە: یەکەمیان ئەوەیە لە باسی ئەو سەردەمەدا ئاماژە بەوە نەکراوە کە نووسین جگە لە مەبەستی بازرگانی و کۆمەڵایەتی بەکارهاتبێت، ئەویش بۆ نووسینی پەیماننامە و گرێبەست لە نێوان هۆزەکاندا. دووەم ئەوەیە کە شیعر خۆی جێگای نووسینی گرتبووەوە، بەشێوەیەك مێژوو و ڕەچەڵەك و ڕۆژەکان و هەموو شتێکی گرنگیان

١ . بڕوانە: تأريخ الأدب العربي، د. شوقي ضيف /٣٨-٣٩.

٢ . بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە، بڕوانە: قراءة جديدة لقضية الشك في أدب الجاهلية، مصطفى الجوزو/٥-٢٢.

لەناو شیعردا تۆمارکردووە، چونکە ئاسان لەبەرکراوە و لە بیرەوەریدا ماوەتەوە، خۆ ئەگەر نووسین بەربڵاو بووایە ئەوا ئەو کارەیان بەو دەکرد.

ئەوەش گومانی تێدا نییە کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلام و لە ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت) شیعری نە جاهیلی و نە ئیسلامی نەنووسراوەتەوە، چونکە لەوکاتەدا تەنها قورئان دەنووسرایەوە، تەنانەت فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەماودەم دەگێڕدرانەوە. لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینیشدا کە هێشتا دەوڵەتی ئیسلامی پایەکانی زۆر بەهێز نەبووبوون و نووسینەوەی بابەتە مەعریفی و زانستییەکانیش نەهاتبووە ئاراوە، نووسین تەنها لە چوارچێوەیەکی تەسکی ئیداری و نووسینەوەی چەند نووسخەیەکی قورئاندا بەرجەستە بوو.

ئەم بارە درێژەی کێشا تا ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچی و لە سەردەمی ئومەوییەکاندا هۆکارەکانی نووسین بڵاوبوونەوە و بنکەی دەوڵەتی ئیسلامی فراوانبوو و زانست و زانیاری گەشەی کرد، ئینجا لە پاڵ نووسینەوەی زانستە جۆراوجۆرەکاندا شیعریش نووسرایەوە. لەم میانەیەشدا شیعری جاهیلی کۆکرایەوە لە دەمی خەڵکییەوە بۆ سەر ڕووپەڕی کەرەستەکانی نووسین.

واتە نزیکەی (دوو سەدە) بەسەر ئەم شیعرەدا تێپەڕی و هەر بە ڕێگای (گێڕانەوە — الرواية) و بەهۆی (بیرەوەری — الذاكرة)ەوە مابووەوە. هاتنی ئیسلام و دروستبوونی کلتوورێکی ئیسلامی لەو ماوەیەشدا لەناو کۆمەڵگای عەرەبدا، هۆیەکی تری وەلانان و کەنارگیریی ئەم شیعرە بوو، چونکە بەرهەم و کەلەپووری سەردەمێکی دژ بە ئیسلام بوو، تا وایلێهات لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا و لای کەسانێکی کەم پاشماوەی مابوو، بەڵام ئەوەی وایکرد سەرلەنوێ ئەم شیعرە زیندوو ببێتەوە و گرنگیی پێبدرێتەوە، هۆکارگەلێك بوون:

١ ـ پەیدابوونەوەی گیانی هۆزایەتی و شانازیکردن بە مێژووی هۆزەکانەوە، تەنانەت لە جاهیلیشدا، ئەمەش بەهۆی دوورکەوتنەوە لە دین و وردە وردە

ڕووکردنە دنیا ڕوویدا، بەتایبەتی کە ئەو سەردەمە نزیکەی سەدە و نیوێك لە هاتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دوور بوو.

٢ ـ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز و لێکدانەوەی مانا و وشە نەبیسراوەکان، ئەمەش لە کاتێکدا سەریهەڵدا کە گەل و نەتەوە و خەڵکی غەیری عەرەب هاتنە ناو ئیسلامەوە و نەیاندەتوانی لە قورئان تێبگەن، بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتنی قورئان لەلایەك و هەڵێنجان و دەرهێنانی حوکمی شەرعی لەلایەکی ترەوە لە ئایەتەکان. زانایانی تەفسیر پێویستیان بە پاڵپشت هەبوو بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانیان لە کاتی ڕاڤە و تەفسیری ئایەت و وشەکاندا، بۆ ئەمەش پەنایان دەبردە بەر شیعری جاهیلی بە حوکمی ئەوەی بنچینەیەکی زمانی عەرەبییە و لەو کاتەدا کە قورئان دابەزیوە عەرەب بەو زمانە قسەی کردووە.

٣ ـ سەرهەڵدانی ڕستەسازی و پێشکەوتنی زانستی زمانەوانیی عەرەبی هەر لەم کاتەدا بوو، کاتێك زانایانی (نحو)ی عەرەبی ویستیان بنچینەی یاسا زمانییەکان دابنێن بە هەمان شێوەی موفەسیرەکان پێویستیان بە بنەما و پاڵپشت هەبوو بۆ چەسپاندنی یاسا و ڕێساکانی ڕستەسازی و وشەسازیی زمانی عەرەبی، بۆ ئەمەش پەنایان دەبردە بەر شیعری جاهیلی و قسەی ڕەوانبێژانی عەرەب لە کۆندا.

بەم شێوەیە شیعری جاهیلی ژینگەیەکی لەباری بۆ ڕەخسا بۆ کۆکردنەوە و گرنگی پێدان، هەرچەندە لە کولتوورێکی ئیسلامیی سەدەو نیوێکدا قورسبوو ئەم شیعرە وەکو خۆی بێتە وجود، بۆیە بەشێکی زۆری بوو بە قوربانی ئەم بارە و فەوتا.

## گومان لە ڕاستی و درووستیی شیعری جاهیلی

هەر لە سەردەمی نووسینەوەدا و لە گەرمەی کۆکردنەوەی ئەو شیعرەدا، مێژوونووسان و ئەدیبان سەرنجگەلێکیان لەسەر ئەو شیعرانە لا دروست بوو،

لەسەر شێوازی گێڕانەوە و نووسینەوە و بێبەندوباری و نەپرسینەوە لەو سەرچاوانەی کە لێیانەوە وەردەگیرا. هەر لەوکاتەدا (ابن سلاّم الجمّحي ١٣٤–٢٣١ك) کتێبی (طبقات فحول الشعراء – چینەکانی کەڵەشاعیران)ی نووسی و تێیدا دەڵێت: ((لە شیعردا دروستکراو و هەڵبەستراو و دانراوێکی زۆر هەیە کە هیچ ئەرزشێکی نییە))[٣]. هەروەها دەڵێت ((کاتێك عەرەب سەیری شیعرەکانی ڕۆژەکان و دەسکەوتەکانی کردەوە و پێیاندا چووەوە. هەندێك لە هۆزەکان شیعری شاعیرەکانیان بە کەم زانی و ئەو شتانەی دەربارەی سەروەرییەکانیان دەگێڕدرانەوە، وەکو پێویست نەبوون، ویستیان وەکو ئەو هۆزانەیان لێبێت کە زۆریان هەیە. کەوتنە دروستکردنی شیعر لەسەر زمانی شاعیرەکانیان، دواتر راوییەکانیش لێیان زیاد کرد))[٤].

گرنگیی ئەم قسانە لەوەدایە، کە هەر لەو سەردەمەدا و لە گەرمەی کۆکردنەوە و نووسینەوەی شیعرەکاندا وتراون و گومانێك نییە دوای چەند سەدەیەك خەڵکانی تر دروستیان کردبێت.

جگە لە (ابن سلاّم)، چەندین کەسی تریش لە گێڕەرەوە و مێژوونووسان ئەمەیان وتووە و نکوولّییان لە بێسەروبەرەیی لە کۆکردنەوە و هەڵبەستنی شیعر بە زمانی شاعیرانەوە نەکردووە، بەڵام ئەم بابەتە لەوکاتەدا زۆر جێگای بایەخ نەبوو، چونکە کۆکردنەوەی زانستە جۆراوجۆرەکان و پاراستنیان لە فەوتان، گرنگتر بووە.

بەڵام جارێکی تر و لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا، ئەم بابەتە سەریهەڵدایەوە، کاتێك ڕۆژهەڵاتناسان کەوتنە نووسینەوە و لێکدانەوەی زۆر بابەتی پەیوەست بە نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات و لەم میانەیەشدا (تیۆدۆر نۆڵدکە)ی

٣ . طبقات فحول الشعراء، ص٤.

٤ . هەمان سەرچاوە، ص٦٤.

ئەڵمانی لە ساڵی (١٨٦١ز)دا باسێکی نووسی دەربارەی (مێژوو و ڕەخنەی شیعری عەرەبی کۆن)[٥]، تێیدا بە پشتبەستن بەو پاشماوە کۆنانەی لە یەمەن دۆزرابوونەوە و شیکردنەوەی ئەو ژینگە و کەشەی شیعری تێدا نووسراوەتەوە، جەختی لە ناڕاستی و هەڵبەستنی بەشێکی زۆر لە شیعری جاهیلی کردووەتەوە. دوای ئەویش (ئەلڤێرت و برۆکلمان و مارجیلیۆس و کەسانی تر) هەمان ڕایان دووپات کردووەتەوە. تەنانەت (مارجیلیۆس) لەو بابەتەیدا کە لە ساڵی(١٩٢٥)دا لە گۆڤاری (کۆمەڵەی ئاسیایی مەلەکی)دا بڵاویکردەوە، سەرتاپای شیعری جاهیلی ڕەتدەکاتەوە و بە درۆ و هەڵبەستراوی دادەنێت[٦].

ئەم بابەتە بووە جێگای مشتومڕ ی زۆرێك لە بیرمەند و نووسەرانی عەرەب و بە پیلانی ڕۆژئاوا بۆ سەر مێژوو و کلتووری خۆیانیان دەزانی، تا لە بڕبڕەی پشتی خۆیان و لە عیملاقێکی وەکو (د. طه حسین)ەوە هەمان بۆچوونیان بیست لە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و مەنهەجیدا، کە دواتر بە درێژی لەسەری دەوەستم.

## هۆکارەکانی شیعر هەڵبەستن بە دەم شاعیرانەوە

گرنگترین ئەو هۆکارانەی وایان لە توێژەران و مێژوونووسان کرد گومان لە ڕاستی و دروستیی ئەم شیعرە بکەن تا ڕادەی ڕەتکردنەوەی سەرلەبەری، ئەمانە بوون:

١ ـ دواکەوتنی نووسینەوەی شیعری جاهیلی و مانەوەی لە بیرەوەری و لەسەر زمانی خەڵکی بۆ نزیکەی (٢٠٠ ساڵ)، ئەمە بووە هۆی ئەوەی:

٥ . دراسات المستشرقين حول صحة الشعر الجاهلي، د. عبدالرحمن بدوي/٢٢.

٦ . هەمان سەرچاوە، هەروەها: قراءة جديدة لقضية الشك في أدب الجاهلية/٣٠. تأريخ الأدب العربي العصر الجاهلي/١٦٦-١٦٧.

أ ـ زیاد و کەمیان تێدا بکرێت و گۆڕانکاری لە وشە و مانا و ستراکتۆری زمانی شیعریاندا ڕوویدات.

ب ـ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی نەگۆڕ نەمێنێت بۆ وەرگرتن لێی، بەمەش هەرکەسێك پارچەیەك هۆنراوەی بە ناوی شاعیرێکەوە بڵاوبکردایەتەوە، بەربەستێکی نەدەبینی و پێودانگی دروست نەبوو بۆ هەڵسەنگاندن و ڕەتکردنەوەی.

٢ ـ تۆمەتباربوونی ڕاوییەکانی شیعر بەوەی دەسکاریی قەسیدە و پارچە شیعرەکانیان کردووە و زۆرێکیان مەرجی متمانەیان تێدا نەبووە، تەنانەت هەندێکیان لەکاتی گێڕانەوەی شیعری شاعیراندا کاتێك شیعریان لێبڕاوە لەوەی لەبەریان بووە، کەوتوونەتە دروستکردنی بەیتی شیعری تر و بەردەوامبوون لە درێژەدان بە قەسیدەکە، تا خەڵکی هەستیان کردووە کە ئەمە هی خۆیانە و ئەوە نییە کە لەبەریان کردووە. یاخود کەسانێکیان تێدا بووە کە پێش ئەوەی ببنە ڕاویی شیعر، خەریکی جەردەیی و ڕێگریی بوون، کاتێك بینیوویانە خەریکبوون بە شیعرەوە کاریکی پڕ داهاتە، دەستیان کردووە بە گێڕانەوە و لەبەرکردنی، یاخود هەیان بووە تەنها بۆئەوەی بیسەلمێنێت کە شیعرێکی زۆری لەبەرە و لەوانی تر بیرەوەریی بەهێزترە، تا بۆیکراوە پانتایی شیعرەکانی زیادکردووە لە ڕاست و ناڕاست و دروستکراوی خۆی.

٣ ـ مێژوونووسانی ئەدەب و ڕاوییەکان لە نێوان خۆیاندا یەکدەنگ نین سەبارەت بە شیعری جاهیلی و یەکتری بەدرۆ دەخەنەوە لە گێڕانەوەکانیاندا، تەنانەت لە گێڕانەوەی (قەسیدە هەڵواسراوەکان)یشدا ـ کە لە هەموو شیعری جاهیلیدا بە ناوبانگن ـ کۆدەنگییەك نییە لەسەر بوون و ژمارەیان، یان ژمارەی بەیت و درێژی و کورتییان، بۆیە دەبینین هەندێکجار قەسیدەیەك بەناوی دوو شاعیر یان زیاترەوە تۆمارکراوە، ژمارەی بەیتەکانی لە ڕاوییەکەوە بۆ یەکێکی تر

دەگۆڕێت، ئەمەش لەوەوە دێت کە هیچ بەندوبارێك بۆ وەرگرتنی شیعر نەبووە، هەرکەسێك هاتبێت و وتبێتی فلان شاعیر ئەمەی وتووە، لێیان وەرگرتووە.

٤ ـ سەرەتاکانی ئەم شیعرە و قۆناغەکانی بەرەوپێشچوونی نادیارە و تەمومژاوییە، بە شێوەیەك نە مێژوویەکی دیار بۆ سەرهەڵدان و نە شاعیرانێکی بێ مشتومڕ لەم سەردەمەدا نین، نازانرێت کێ یەکەمجار شیعری وتووە؟ چی وتووە؟ یان کام بابەتی شیعری لە پێش کامیانەوە سەریهەڵداوە؟ تەنانەت کاتێك دەوترێت (امرؤ القیس) کۆنترین شاعیری جاهیلییە، کۆك نین لەسەری کە کێیە؟ کەی ژیاوە؟ بەشێوەیەك زیاتر لە (١٥) شاعیر بەناوی (امرؤ القیس)ەوە بە مێژووی ژیان و تایبەتمەندیی جیاوازەوە دروستکراون، تەنانەت لە ئەزموونی تەنها شاعیرێکیشدا قۆناغبەندی هەست پێناکرێت، هەموو شیعرەکانی لە یەك ئاستدان و سەرەتا و کۆتایی ژیانی هەروەکو ئەوە وایە یەك ئەزموونی شیعریی هەبووبێت، نازانرێت کام قەسیدەیەی لە سەرەتای ژیانیدا نووسیوە و کامەی هی کۆتاییەتی، ئەمە بە پێچەوانەی هەموو سەردەمەکانی ترەوە کە ئەزموونی شیعریی سەردەمی لاویی شاعیر و کۆتایی ژیانی تایبەتمەندیی خۆیانیان هەیە و هەر دەبێت واشبێت، بەڵام ئەمە بە نیسبەت شاعیرانی جاهیلییەوە وانییە، ئەمەش دوو هۆی هەیە: یان ئەوەتا شیعرە بێهێزەکانیان دەسکاری کردووە و چاکیان کردوون، یاخود کاتێك بەدەمیانەوە هەڵیان بەستوون، ویستوویانە لەوپەڕی هونەریی و جوانیدا بن.

٥ ـ مۆسیقای شیعریی ئەو شیعرەی بەناوی جاهیلییەکانەوە تۆمارکراوە، زۆر تۆکمە و ڕێکوپێك و بێ هەڵەیە، بە جۆرێك ئەگەر شیعری شاعیرێکی وەکو (امرؤ القیس) ـ کە لە سەرەتای سەدەی شەشەمی زاییندا ـ ژیاوە، بەراوورد بکەین بە شاعیرانێك کە لە سەرەتای سەدەی حەوتەمدا ژیاون، وەك (الحطیئة)، ئەوا جیاوازی نابینین لە نێوانیاندا، هەروەکو ئەوەی هیچ ئیشارەتێك نییە بۆ مێژوو و قۆناغە جیاوازەکانی پێشکەوتنی (کێش و سەروا)، هەروەکو ئەوەی ئەو شیعرانە هەمووی لە یەك سەردەمدا نووسرابن. بۆیە توێژەران دەڵێن دەبووایە لانیکەم

ئاماژە هەبووایە بۆ قۆناغی سەرەتا و کرچوکاڵی (کێش و سەروا)، هەروەها دەبووایە جیاوازییەکانی سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر لە مۆسیقای ئەو شیعرەدا ڕەنگی بدایەتەوە، چونکە گومانی تێدا نییە ئەم مۆسیقا بەهێزە یەکسەر و لەو چەند ساڵەدا نەهاتووەتە ئاراوە کە تێیدا شیعری جاهیلی ڕیوایەت کراوە، لەبەر ئەوە ئەگەری دەسکاریکردنی ئەم شیعرە لە ڕووی مۆسیقییەوە، هیچ گومانی تێدا نامێنێت[7].

لەلایەکی ترەوە، دۆزینەوەی (بەحرەکانی عەروز) کە هەموو شیعری جاهیلیی پێدەپێورێت و سیستمێکی زۆر ورد و بەیەکداچووە، لە سەردەمی ئومەوییەکاندا دۆزراوەتەوە، ڕێك لەو سەردەمەدا کە ئەم شیعرە نووسراوەتەوە، چ عەجەب بە هەموو وردەکاریەکانیەوە بەسەر شیعری جاهیلیدا دەچەسپێت؟ لەگەڵ ئەوەدا توێژەران و مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن و هیچ جیاوازییەك نییە، کە شاعیری جاهیلی عەروزی نەزانیوە و لە سەردەمی جاهیلیدا شتێك بەناوی کێشی عەروزەوە نەبووە، ئەی ئەم وردەکارییە لە کێشی شیعردا لە کوێوە هات، ئەگەر ئەوە نەبێت کە لەو سەردەمەدا ڕێکخرابێت؟

لە ئەنجامی ئەم ڕوونکردنەوەیەوە بۆمان دەردەکەوێت:

١ ـ ئەو شیعرەی بەناوی جاهیلییەکانەوە تۆمارکراوە، دوای نزیکەی (دوو سەد ساڵ) نووسراوەتەوە، لەو ماوە دوور و درێژەشدا لەسەر زاری خەڵك و لای ڕاوییەکان ماوەتەوە. بێگومان ئەدەبی نەنووسراو گۆڕانکاری و زیاد و کەمی تێدا دەکرێت، چونکە هیچ پرەنسیپێك نییە بۆ جڵەوگیری، ئەمەش نەك تەنها لای عەرەب، بەڵکو هەموو ئەدەبێکی نەنووسراو وایە.

---

٧ . بڕوانە: طبقات فحول الشعراء/١١، قراءة جديدة لقضية الشك/٦٢-٦٣ و ٧٧-٧٨ و ١١٩و دواتر.

٢ ـ هۆزەکان بۆ زیادکردنی سەروەریی خۆیان و دەوڵەمەندکردنی مێژوویان، پەنایان بۆ شیعر هەڵبەستن بە دەمی شاعیرەکانیانەوە بردووە، تەنانەت هەندێکیان بۆ ئەوەی سەروەریی زیاتریان لە ئیسلامدا هەبێت، هاتوون بە ناوی شاعیرەکانیانەوە لە جاهیلیەتدا شیعریان هەڵبەستووە، تێیدا باسی هاتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و سیفەت و پلە و پایەی بنەماڵەکەیان کردووە، زۆرێك لە چەمکە ئیسلامییەکان بەکارهاتوون تێیاندا کە لە جاهیلیەتدا بەو مانا و دەلالەتە نەبوون و دوای هاتنی ئیسلام ئەو مانایانەیان وەرگرتووە، ئەمە جگە لەوەی مێژوو سەلماندوویەتی کە عەرەب هیچی لەبارەی هاتنی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) نەزانیووە و ناکۆکە لەگەڵ ئەو هەموو دژایەتییەی ئیسلام و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)دا لە سەرەتای هاتنیەوە.

٣ ـ ڕاوییەکانی شیعر بۆ پارە پەیداکردن شیعریان هەڵبەستووە بۆ هۆزەکان.

٤ ـ ئەو شیعرەی بە ناوی جاهیلییەکانەوە نووسراوە، بە تەواوی ڕۆحی شیعری ئومەویی هەڵگرتووە، واتە لەڕووی فۆڕم و مانا و ستراکتۆر و وێنەی شیعری و کێش و سەرواوە، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵیدا.

لەمەوە توێژەران و مێژوونووسان دوو بەشن: هەندێکیان پێیانوایە سەرتاپای شیعری جاهیلی دەسکاری کراوە، یاخود هەڵبەستراوە، هەندێکیشیان بڕوایان بە هەبوونی شیعری جاهیلیی ڕاستەقینە هەیە لەگەڵ بەشێك هەڵبەستراودا، بەڵام هەردوو دەستەکە لەسەر ئەوە کۆکن کە هەر شیعرێك بەناوی جاهیلییەکانەوە بگێڕدرێتەوە و باسی ئیسلام و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و قورئان بکات، یاخود ئەو بەیتانەی لەیەکچوونیان هەیە لەگەڵ ئایەتەکانی قورئان و چەمك و واتا ئیسلامییەکان، دروستکراو و هەڵبەستراون و هیچ ڕاستییەك لە خۆیان ناگرن. ئەمە لە ئەنجامی هەوڵی ئەو توێژەر و نووسەرانەوە دێت کە بڕوایان بە بوونی شیعری جاهیلی هەیە و دەیانەوێ شیعری ڕاست و درووستی جاهیلی لەو

هەڵبەستراوانە جیابکەنەوە. هەروەها دەڵێن ئەو شیعرانەی باس لە (عاد و ثمود و عملیق) دەکەن بە هەمان شێوە هەڵبەستراون، چونکە عەرەب هیچیان لەبارەی ئەم هۆزانەوە نەزانیوە کە پێش سەردەمی وتنی ئەم شیعرە لەناوچوون و پاشماوەشیان نەماوە، هەتا قورئانیش باسی نەکردوون زانیاریی ڕاست و دروستیان لەبارەوە نەبووە. ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە لە سەرەتادا کردمان سەبارەت بە هۆکاری لەیەکچوونی هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان و بەشێك لە شیعری جاهیلی.

ئەمە هێشتا بەس نییە، هەرچەندە هیچ جێگایەك بۆ ئەو گومانەی پێشوو ناهێڵێتەوە، بەڵکو ئەمە تەنها ڕای ئەوانە بوو کە بڕوایان بە بوونی شیعری جاهیلی هەیە و نکوڵیی لێناکەن، لەگەڵ ئەوەشدا دان بە بوونی تەزویر و هەڵبەستندا دەنێن، بەڵام هێشتا ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە بەشێکی ئەم شیعرە لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ بووبێت.

لە بەرامبەر ئەمانەدا، کەسانێك هەن قەناعەتیان بە شیعرێکی ڕاست و دروستی گێڕدراوە نییە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جاهیلی، گرنگە ڕای ئەمانیش بزانرێت تا زیاتر فشەڵی و بێ بنچینەیی ئەو گومانە دەرکەوێت کە شیعری جاهیلی لە قورئاندا ڕەنگی دابێتەوە. با تاوێك بوەستین لەسەر ڕاکانی دکتۆر تەها حسێن.

## ڕای دکتۆر تەها حسێن لەسەر شیعری جاهیلی

تەها حسێن ئەدیب و نووسەرێکی دیاری عەرەبە و بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی (سۆربۆن) لە فەرەنسا بەدەستهێناوە. لەگەڵ ئەوەدا کە هەردوو چاوی کوێر بووە، ماوەیەك بووە بە ڕاگری کۆلێژی ئەدەبیات لە زانکۆی قاهیرە و دواتر وەزیری مەعاریف بووە لە میسر. چەندین بەرهەمی ئەدەبی و ڕەخنەیی و لێکۆڵینەوەی هەیە. یەکێك لە گرنگترین کتێبەکانی (في الأدب الجاهلي – ١٩٢٧)یە و زۆرترین مشتومڕی لە ناوەندە ئەدەبییەکاندا دروستکرد.

تەها حسێن دوای گەڕانەوەی لە فەڕەنسا، ئەو کتێبەی نووسی. یەکەمجار بە ناوی (في الشعر الجاهلي) و لە ساڵی (١٩٢٦)دا چاپی کرد، بەڵام دوای ئەو هەراوهوریا گەورەیەی لەسەری درووستبوو و درا بە دادگا، دووبارە لە ساڵی (١٩٢٧)دا و بە ناوی (في الأدب الجاهلي) چاپی کردەوە.

پوختەی ڕاوبۆچوونی ئەو سەبارەت بە شیعری جاهیلی لە چەند خاڵێکدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام گرنگترین شت ئەو ئەنجامەیە کە پێی گەیشتووە و لە سەرەتای کتێبەکەیدا ڕایدەگەیەنێت، ئەویش ئەمەیە:

((یەکەم شت کە کتوپڕ پێتی ڕادەگەیەنم لەم قسە و باسەدا، ئەوەیە من گومانێکی زۆرم لە بەهای شیعری جاهیلی کرد، یاخود بڵێ گومان زۆری بۆهێنام، بۆیە کەوتمە توێژینەوە و بیرکردنەوە و خوێندنەوە و ڕامان، هەتا هەموو ئەمانە گەیاندمیانە شتێك ئەگەر دڵنیایی تەواویش نەبێت، ئەوا نزیکە لە دڵنیابوون، ئەویش ئەوەیە ئەو زۆرینە ڕەهایەی ناومانناوە شیعری جاهیلی، هیچی بەسەر جاهیلییەکانەوە نییە، بەڵکو هەڵبەستراو و درووستکراوە دوای هاتنی ئیسلام. ئەوە ئیسلامییە و گوزارشت لە ژیان و ئارەزوو و ویستی مسوڵمانان دەکات زیاتر لەوەی گوزارشت لە ژیانی جاهیلییەکان بکات، خەریکە هیچ گومانم نامێنێت لەوەی دەمێنێتەوە لە شیعری ڕاستەقینەی جاهیلی زۆر کەمە و هیچ نابەخشێ، ناتوانرێت پشتی پێببەسترێ لە نەخشاندنی وێنەی ئەدەبی ڕاستەقینەی ئەو سەردەمی جاهیلییە))[8].

لەمەوە تێدەگەین هەرچەندە تەها حسێن دان دەنێ بە بوونی هەندێکی کەم لە شیعری جاهیلیی ڕاستەقینەدا، بەڵام دواتر دەڵێ ناتوانرێت ئەو بڕە کەمە لەناو ئەو زۆر و زەبەندە هەڵبەستراوەدا دەربهێنرێت و جیابکرێتەوە، خۆ ئەگەریش جیابکرێتەوە، ئەوا ئەوەندە نییە بتوانین پشتی پێببەستین، یاخود شەقڵ و

---

٨ . في الشعر الجاهلي، طه حسين، دار المدى للثقافة والنشر، طبعة خاصة، ٢٠٠١، ص١٥-١٦.

تایبەتمەندیی شیعری جاهیلیی پێ دیاری بکەین. کەواتە دەکرێ بڵێین تەها حسێن بڕوای بە بوونی ئەدەبێکی ڕاستەقینە نییە کە هی جاهیلییەکان بێت و گوزارشت لە ژیان و کلتووری ئەوان بکات.

بۆ ئەمەش لێکدانەوەیەکی ورد و فراوانی کردووە و چەندین بەڵگە دەهێنێتەوە لە قسەی مێژوونووسان و ڕاوییەکانی شیعر و ئەوانەی گرنگییان بەو ئەدەبە داوە، لە عەرەب و ڕۆژهەڵاتناسان. بە کورتی لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم:

**یەکەم: ئاوێنەی ژیانی جاهیلی، قورئانە نەك شیعری جاهیلی[9].**

مەبەستی لەم قسەیە ئەوەیە کە هەر کەسێك بیەوێ لە ژیان و گوزەران و بیروبۆچوونی عەرەبەکانی پێش ئیسلام شارەزابێت، ئەوا با سەیری قورئان بکات، چونکە لەوێدا چەندین ڕاستیی حاشا هەڵنەگر سەبارەت بە ژیانیان تۆمارکراوە کە لەو شیعرانەدا نایانبینین کە بەناوی ئەوانەوە نووسراونەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو شیعرانە زادە و هەڵقوڵاوی ژیانی ئەوان نین، چونکە ئەگەر وابووایە، دەبووایە ژیان و گوزەران و کلتووریان تێیدا ڕەنگی بدایەتەوە.

لەو بابەتانەی کە لە قورئاندا وەك بەشێکی گرنگی ژیانی جاهیلی باسکراون، مەسەلەی (زیندەبەچاڵکردن)ی کچانە، لە چەندین ئایەتی قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لە هیچ هۆنراوەیەکی جاهیلیدا نایبینین، خۆ دەبوایە شاعیران بەرگرییان لە مافی ئەو منداڵە بێگوناهانە بکردایە و سەرکۆنەی کۆمەڵگایان بکردایە لە بەرامبەر بڵاوبوونەوەی ئەو دیاردەیەدا، یان وەکو ئەوەشیان نەکردووە وەکو شاعیرێکی هەڵگری کلتووری جاهیلی، بۆچی نابینین شانازی بکەن بەو زیندەبەچاڵکردنەوە، خۆ شاعیرەکان شانازییان بە زۆر شتی ترەوە کردووە کە دابونەریتی خراپی جاهیلی بوون، ئەمەش بەشێك بووە لەو شانازییەی باوکی

---

٩ . سەیری هەمان سەرچاوە بکە، لاپەڕە ٢٣ و دواتر.

سەردەمی جاهیلی کردوویەتی، کە کچەکەی خۆی کوشتووە، بۆچی شاعیران نە وەکو باوك نە وەکو نوێنەری کلتووری خێڵ و کۆمەڵگای جاهیلی، وێنای ئەو دیاردەیەیان نەکردووە؟ ئەمەو زۆر شتی تر لە قورئاندا هاتوون، بەڵام لەو شیعرە بەناو جاهیلییەدا نایبینین، وەکو بتپەرستی و هاتوچۆی بازرگانی و ململانێی نێوان یەهودی و نەسرانییەکان. ئاخر عەرەب کە تاکو سەر ئێسقان بتپەرست بوون، چۆن دەکرێ لە شیعرەکانیاندا باسی نەکەن؟ یاخود شیعر بۆ بتەکانیان نەنووسن؟ دەکرێ شاعیر گەورەترین بیروباوەڕی خۆی لەبیر بکات؟ نەك هەر ئەوە، بەڵکو هەندێك بەیت دەگێڕدرێتەوە کە تێیدا شاعیر زەمی بتەکان دەکات و بە خراپ ناویان دەبا، وەکو ئەمەی بە ناوی (الأعشی)ەوە وتراوە:

**وذا النصب المنصوب لاتنسكنّه ... ولا تعبد الأوثان والله فاعبدا**
**وصل على حين العشيات والضحى ... ولا تحمد الشيطان والله فاحمدا**[١٠]

ئاخر چۆن دەکرێ شاعیرێك بەو شێوەیە سووکایەتی بە خواکانی عەرەب بکات و بڵێ ئەوانە تەنها بتی تاشراون و مەیان پەرستن، بەڵکو خوا بپەرستن و بەیانی و ئێوارە نوێژ بکەن و شوکر و سوپاسی شەیتان مەکەن، بەڵکو هی خوا بکەن؟ خۆ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) هەر ئەمەی دەوت وا شاربەدەریان کرد و ئازار و ئەشکەنجەیان دا. بۆیە تەها حسێن پێیوایە ئەگەر ئەم شیعرە هی ئەو سەردەمە بووایە، دەبووایە زۆر لە قورئان زیاتر باسی ئەو مەسەلانەی بکردایە و بە ڕاستی و درووستی وێنای ژیانی جاهیلیی بکردایە.

---

١٠ . دیوانی ئەعشا/٢٥.

### دووەم: شیعری جاهیلی و زمانی عەرەبی[11].

مێژوونووسان و لێکۆڵەران کۆکن لەسەر ئەوەی عەرەب پێش ئیسلام دابەش دەبێت بەسەر دوو بەشدا، ئەوانیش عەرەبی قەحتانی و عەرەبی عەدنانین. عەرەبە قەحتانییەکان ئەوانەن کە هەر خوا بە عەرەبێتی درووستی کردوون و لە خوارووی دوورگەی عەرەبی ژیاون کە یەمەنی ئێستا دەکات، بەڵام عەدنانییەکان ئەو هۆزە عەرەبانەن کە لە حیجاز، واتە وڵاتی عەرەبستانی سعودیەی ئێستا، ژیاون، ئەمانە لە بنەڕەتدا عەرەب نەبوون، بەڵکو بە زمانی (عیبری) یاخود (کلدانی) قسەیان کردووە و دواتر دوای نیشتەجێ بوونیان لە دوورگەی عەرەبی و تێکەڵاوبوونیان بە قەحتانییەکان ـ کە ئەوانیش دوای هەرەسهێنانی (بەنداوی مەئرەب) کۆچیان بۆ باکوور کردووە ـ فێری عەرەبی بوون و زمانی خۆیان وازلێهێناوە و بە عەرەبی قسەیان کردووە. ئەم عەدنانییانە نەوەی (ئیسماعیل) بوون و لەگەڵ هۆزی (جورهوم) ژن و ژنخوازییان کردووە.

هەروەها لەسەر شتێکی تریش کۆکن، ئەویش ئەوەیە کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان زمانی قسەکردنی ئەم دوو بەشەدا هەبووە، لە ڕووی مانا و ستراکتۆر و یاسا و ڕێساکانی زمانەوە، چونکە زمانی عەرەبی زمانی دایکیی عەدنانییەکان نەبووە، بێگومان گونجاندوویانە لەگەڵ شێوازی قسەکردنی خۆیاندا، هەر وەکو لە هەموو کاتێکدا دەبینین کەسێك کە فێری زمانی دووەم دەبێت، بێگومان وەکو ئەو کەسە نییە کە لە بنچینەوە بەو زمانە قسەی کردبێت.

ئەمە جگە لەوەی ئەو پاشماوە کۆنانەی لە یەمەن دۆزراونەتەوە، ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە زمانی قەحتانییەکان جیاوازبووە لەو عەرەبانەی بەناوی نەوەی عەدنانەوە ماونەتەوە. هەروەها (ئەبو عەمری کوڕی عەلا) کە زانایەکی زمانناسی سەدەی سێیەمی زایینییە و لەو کەسانەیە بناغەی (نحو) و ڕێساکانی

---

١١ . في الشعر الجاهلي، لاپەڕە ٣١.

زمانی عەرەبیی چەسپاندووە، دەڵێت: زمانی حیمیەر ـ هۆزێکی قەحتانییە ـ بە هیچ جۆرێك لە زمانی ئێمە ناچێت و قسەکردنیشیان وەك قسەکردنی ئێمە نییە. بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە: شیعرێکی زۆر دراوەتە پاڵ شاعیرانی قەحتانی و بە زمانی ئەوانەوە هەڵبەستراوە کە بە هیچ جۆرێك بەو زمانە نە نووسراوە کە ئەوان قسەیان پێکردووە، بەڵکو جیاوازیی نییە لەگەڵ شیعری ئەو شاعیرانەی لەبەرەی عەدنان بوون، ئەگەر بەراووردی شیعری (امرؤ القیس) بکەین کە قەحتانییە و لە هۆزی (کیندە)ی یەمەنییە، نە زۆر و نە کەم، جیاوازیی نییە لەگەڵ شیعری شاعیرانێکی وەکو (زوهەیر و عەنتەرە) کە لە بەرەی عەدنان بوون، نەك هەر ئەوە، بەڵکو شیعری هەموویان بە قەحتانی و عەدنانییەوە هەمان زمانە کە قورئانی پێ دابەزیوە. نهێنیی ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دوای هاتنەخوارەوەی قورئان و چەسپانی وەك زمانی قسەکردن، ئەم شیعرانە هەڵبەستراون، ئەمەش دوای ماوەیەکی دوور و درێژ ڕوویداوە، چونکە هەر وا ئاسان نەبووە هەموو عەرەب لەسەر یەك شێوە قسەکردن کۆببنەوە، ئەگەرنا ئەم جیاوازیی زمانە بۆ لە شیعری شاعیرەکاندا ڕەنگی نەداوەتەوە؟

**سێیەم: شیعری جاهیلی و دیالێکتە جیاوازەکان[١٢].**

سرووشتی زمان وایە کە لە دیالێکتی جیاواز و هەمەجۆر پێکدێت، هیچ زمانێك نییە بە تەنها یەك دیالێکت قسەی پێبکرێت، چونکە جیاوازیی شوێن و کەس و ئاستی ڕۆشنبیری و بیرکردنەوە و زۆر هۆکاری تر، دەبنە هۆی درووستبوونی جیاوازی لە قسەکردندا. تەنانەت دیالێکتێکی دیاریکراویش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت و شێوازی هەر یەکێکیان جیایە، هەر ئەم جیاوازییەشە لە ئەدەبدا شێوازی نووسینی ئەدیب و شاعیرەکان دیاری دەکات.

١٢ . هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٧.

بێگومان لە سەردەمی جاهیلیدا دیالێکتی جیاوازی قسەکردن هەبوون و شاعیرانیش سەر بەو دیالێکتە جیاوازانە بوون، تەنانەت دەتوانین بڵێین بۆ هەر هۆزێك دیالێکتی تایبەتی هەبووە، ئەم جیاوازییە کاریگەریی زۆری لەسەر زمانی عەرەبی درووست کردووە، لە ڕووی فراوانیی مانا و بەهێزیی ڕەوانبێژی و دەوڵەمەندی لە ڕووی وشە و زاراوەوە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە، ئەو جیاوازییە لە شێوازی قسەکردندا هیچ کاریگەرییەکی نییە لەسەر ئەو شیعرەی پێی دەوترێت شیعری جاهیلی، لە کاتێکدا شاعیران لە سەردەمی خۆیاندا بە دیالێکتی هۆزەکانیان شیعریان وتووە، لەوەش گرنگتر، ئەو جیاوازییە کاری کردووەتە خوێندنەوەی قورئان و چەندین جۆر خوێندنەوە هەیە کە زانستێکی تایبەتیان بۆ دانراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە قورئان ئەو مەکانەت و شوێنە بڵندەی هەبووە و کتێبی ئاسمانی بووە، خۆ دەکرا هۆزە عەرەبەکان زۆر لە خۆیان بکەن و قورئان وەکو خۆی و بە لەهجەی قوڕەیش بخوێننەوە، بەڵام هەریەکەیان بەپێی سیستمی فۆنەتیکی خۆیان و ڕاهاتنی قوڕگ و زمانیان بە قسەکردن، قورئانیان خوێندووەتەوە. تۆ بڵێی شیعری جاهیلی زیاتر گرنگیی هەبووبێت تا ئەو جیاوازییەی تێدا دەرنەکەوتبێت؟

لەلایەکی ترەوە، هۆزە عەرەبەکان لە سەردەمی جاهیلیدا ئەوەندە دەمارگیریی خێڵایەتییان بەهێز بووە، هیچ کامیان وازی لە دیالێکتی قسەکردنی خۆی نەهێناوە بۆ ئەوی تر، چ بگات بەوەی شاعیرەکانیان وازیان هێنابێت و بە لەهجەیەکی تر شیعریان وتبێت، چونکە شیعر و شێوازی قسەکردن بەشێك بوون لە تایبەتمەندی و سەروەرییەکانی هۆز و پاراستوویانن، تەنانەت هەموو شتێکی گرنگیان لە شیعردا تۆمارکردووە تا بمێنێتەوە.

جا ئەم شیعرەی ئێستا لەبەردەستدایە و پێی دەوترێت شیعری جاهیلی، هەموو بە یەك دیالێکت نووسراوە، ئەویش دیالێکت و لەهجەی قسەکردنی (قوڕەیش)ە و هی قورئانە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دوای دابەزینی

قورئان لەهجە و شێوازی قسەکردنی قوڕەیش بووە بە ستاندەر لەناو هەموو هۆزە عەرەبەکاندا و هەموویان بەو شێوەیە قسەیان کردووە، لەبەر گەورەیی قورئان و بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەهجەی قورەیش بووە بە زمانی ڕەسمی، ئینجا ئەم شیعرانە نووسراون، ئەگەرنا دەبووایە ئەو جیاوازییە ڕەنگدانەوەی هەبووایە تێیدا. خۆ ئەگەر گریمانەی ئەوانە وەرگرین کە دەڵێن ڕاستە هۆزەکان شێوازی جیاجیایان هەبووە بۆ قسەکردن، بەڵام لە شیعر وتندا هەموویان بە یەك لەهجە شیعریان وتووە، دەپرسین بۆچی ئەو لەهجە یەکگرتووە هەمان لەهجەی قوڕەیشە کە شێوەزاری قورئانیشە؟ بۆچی شێوەزارێکی تر نەبوو بە ستاندەر؟ خۆ هۆزە عەرەبەکان کەسیان کوێخایەتیی ئەوی تری قبووڵ نەبوو، هەموویان خۆیان بە زل زانیوە، چی وایلێکردن شێوەزاری قوڕەیش قبووڵ بکەن؟ ئەوانە تەنانەت لە ڕووی سیاسیشەوە گەورە و بچووکیان نەبووە، بۆیە دەوڵەتێکی یەکگرتوو و بەهێزیان نەبووە، ئەوە چ موعجیزەیەك بووە ڕوویداوە کە هەموویانی لە ڕووی کلتوورییەوە کۆکردووەتەوە تا یەك بەرهەمی شیعرییان هەبێت؟

بۆیە تەها حسێن دەڵێ لەم حاڵەدا لە نێوان دوو هەڵبژاردنداین: یان ئەوەتا قەناعەت بکەین بەوەی کە عەرەب هەمووی بە یەك زمان و یەك دیالێکت قسەی کردووە، هیچ جیاوازیەك نەبووە لەنێوانیاندا، یاخود ئەوەتا دەبێ بڕوا بکەین کە ئەو شیعرە هی ئەوان نییە. بێگومان گریمانەی یەکەم ڕەتدەکرێتەوە، چونکە پێچەوانەی واقیع و مێژووە.

## ئەم بابەتە لە ڕووی کلتوورییەوە

ئەوەی کە باسکرا، بۆچوونی مێژوونووسان و توێژەران بوو لەسەر ئەم شیعرە، بەڵام با بزانین بە پێوەرەکانی ڕەخنەی نوێش بەو ئەنجامە دەگەین یان نا؟ بۆ ئەم مەبەستەش گرنگترین و نوێترین ڕێبازی ڕەخنەیی ئێستا لە ئارادابێت، ڕەخنەی کولتوورییە، بۆیە لەو ڕوانگەیەوە تیشکێك دەخەمە سەری.

ئەگەر کلتوور بریتی بێت لە شێوازی ژیان بە گشتی بە هەردوو ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە، ئەوا شیعر پێکهێنەرێکی سەرەکییەتی. بە واتایەکی تر، هەموو هەڵسوکەوت و چالاکیی ماددی و مەعنەوی و بیرکردنەوە و بەرهەمێنان، لە چوارچێوەی ڕێسا و دابونەریتی تایبەتیدا ئەنجامدەدرێن لە کۆمەڵگادا، هەموو کۆمەڵگایەکیش خاوەنی بنچینەیەکی دیاریکراوی خۆیەتی کە لە چوارچێوەیاندا تاکەکان هەڵسوکەوت دەکەن، ئەو چوارچێوە داڕێژراوە کلتوورە.

بەو پێیە شیعر وەکو چالاکییەکی مرۆڤ، بەشێکی زیندووی کولتووری کۆمەڵگایە و لەبەرئەوەی شاعیر هەر لە منداڵییەوە لەسەر چەمکە کولتوورییەکان و دابونەریتەکان گەورە دەبێت، بەرهەمە شیعرییەکەی دەبێتە بەشێکی دانەبڕاو لە ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەکەی. ئەگەر کلتوور خاك بێت، ئەوا هەموو تاکەکان ڕووەکە جۆربەجۆرەکانی سەوزبووی ناو ئەو خاکەن، هەرچەند لە ڕواڵەتدا لە یەکتری جیابن، لە کۆتاییدا هەموویان تایبەتمەندی و خەسڵەتی ئەو خاکە وەردەگرن و جیاوازن لە ڕووەکەکانی خاکی تر و شوینێکی تر.

زۆر وتراوە لەبارەی پەیوەندیی نێوان شیعر و کلتوورەوە، بەڵام ئەوەی بۆ ئەم باسە گرنگە ئەوەیە: ئاخۆ ئەو شیعرەی بە ناوی جاهیلییەکانەوە ڕیوایەت کراوە، بەرهەمی کولتووری ئەوانە؟ یان لە کلتووری ئیسلامی و بەدیاریکراوی، سەردەمی ئومەوییەکان، نزیکترە؟

بە وردبوونەوە لە چەند لایەنێکی شیعری جاهیلی، ڕاستیی بابەتەکەمان بۆ دەردەکەوێت، ئەوانیش ئەمانەن:

**یەکەم:** لە ڕووی فۆڕمەوە، ئەو فۆڕمەی شیعری جاهیلی تێیدا بەرجەستە بووە، بەرهەمی کلتوورێکی پێشکەوتوو و فراوان و دەوڵەمەندە، چونکە بە شێوەیەکی سیستماتیکی و زۆر ڕێکوپێك داڕێژراوە و وردەکاریی زۆری تێدایە، نەك تەنها لە ڕووی کێشەوە، بەڵکو سەرواش هیچی لەو کەمتر نییە لە سیستمی پێکهاتنیدا، ئاخر ناکرێ کولتوورێکی هەژار و لاوازی وەکو سەردەمی جاهیلی،

بەرهەمهێنەری بێت، چونکە لەو سەردەمەدا، نە لە ڕووی بیر و زانستی ئەقڵی و نە لە ڕووی ئیدارە و وردەکاریی بەڕێوەبردنی ژیانەوە، ئەو سیستمە نابینین. عەرەب کە هەتا پێش هاتنی ئیسلام دەوڵەتداری و ڕێکخستن و کارکردنی پێکەوەییان لە سیستمێکدا نەدەزانی، بەڵکو کۆمەڵێك هۆزی دژبەیەك و یەکترکوژ و خاوەن دەمارگیریی بێ بنەما بوون، چۆن گەیشتنە ئەو وردەکارییە لە هونەری شیعر هۆنینەوەدا، کە دوای نزیکەی دوو سەدە یاساکانی بدۆزرێنەوە؟ ڕەخنەی نوێش ئەوەی سەلماندووە کە کلتوور بەشێوەیەکی نادیار و دەرکەوتەی جۆراوجۆر، ئامادەیی لە شیعردا هەیە، بۆیە هونەری شیعرهۆنینەوە بەو شێوە تۆکمەیە، دەبێت بەرهەمی کولتوورێك بێ کە لە لایەنەکانی تری ژیانیشدا هاوشانی ئەو وردەکاری و پێشکەوتنی بەرهەمهێنابێت، هەروەك چۆن لە سەردەمی ئومەوییەکاندا یاساکانی عەروز دۆزرانەوە، سیستمی بنیاتنانی شیعر لە ڕووی فۆڕمەوە گەشەی کرد، ئاوەهاش ئیدارە و دەوڵەتداری و ڕێکخستنی سوپا و زانستی جۆربەجۆر دەرکەوتن.

**دووەم:** لە ڕووی ناوەرۆکەوە، ناوەرۆکی ئەو شیعرەی پێی دەوترێت جاهیلی، هەڵگری کۆمەڵێك مانا و چەمك و زاراوەیە کە جێگایەکیان دەستناکەوێ لە کلتووری جاهیلیدا، لەوانە (الدعاء و الزكاة و الصلاة)، هەروەها چەمکانێکی وەکو (لێبوردەیی و دژایەتیی ستەم و دادگەریی کۆمەڵایەتی) لەناو شیعری شاعیرانی جاهیلی، بەتایبەتی (صعاليك)دا، هەن، وەك ڕەنگدانەوەی دابونەریت و ژیانی کۆمەڵگا لە شیعردا، بەڵام دژیەکن لەگەڵ کلتووری پڕ ستەم و نادادگەریی لە نێوان چینە جیاوازەکاندا، کوا دادگەریی لەنێوان بەندە و گەورەکانیاندا؟ یان لەنێوان ئەوانەی پێیان دەوترا (موالي) و (أبناء القبيلة)دا؟ هەروەها بە مرۆڤ نەزانینی ئافرەت و بێبەشکردنی لە هەموو مافێکی سروشتی و کۆمەڵایەتی، تەنانەت وەك شمەك و کاڵا بە میرات دەگیرا و دەفرۆشرا. ناکرێ کلتوور دوولایەن بێت، لە ڕووی بابەتە تیۆری و مەعنەوییەکانەوە بەرهەمێکی نموونەیی و میسالی پێشکەش بکات،

بەڵام لە مەیدانی پڕاکتیزەکردندا مومارەسەی دابونەریتێکی ناشرین و پێچەوانە بکرێت. ئەمە سەرەڕای ئەو چەمکە باو و دابونەریتە جاهیلییانەی کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد لە واقیعدا هەبوون، بەڵام ناوەرۆکی ئەم شیعرە لێیانەوە دوورە.

هەر لە ڕووی ناوەرۆکەوە، ئەم شیعرە بێدەنگە لە ئاست زۆر بابەتی هەستیاردا کە لە کلتووری جاهیلیدا بەربەستێك نەبووە لەبەردەمیاندا، واتە هیچ پاساوێك نییە بۆ نەبوونیان، لە بنەڕەتیشدا دەبووایە حوزوریان هەبێت، چونکە واقیع و کلتووری ئەوکاتە وای خواستووە، بەڵام ئەوەی ڕێگربووە لەبەردەم گێڕانەوە و تۆمارکردنیاندا، کولتووری ئیسلامیی سەردەمی ئومەوی بووە. بە کورتی ڕاوییەکان ویستوویانە بە جۆرێك شیعری جاهیلی وێنا بکەن و دارێژنەوە، کە کۆمەڵگا لێیان قبووڵ بکات و فڕێ نەدرێتە دەرەوەی کلتوور و گرنگیپێدانی خەڵکییەوە، هەم ویستووشیانە جۆرێك لە ڕۆحی جاهلیی هەڵگرێت، تا وا گومان ببرێت کە هی ئەو سەردەمەیە، بەڵام تەنها ڕواڵەت بووە.

لە گرنگترین ئەو ناوەرۆکە شیعرییانەی کە دەبووایە حوزورێکی بەرچاوی هەبووایە لە شیعری جاهیلیدا، داشۆرینە (هجو)، داشۆرینێك کە ئاوێنەی ژیان و کلتووری مرۆڤی ئەو سەردەمە بێت و پڕبێت لەو شەڕ و ناکۆکییانەی هۆزەکان بەرپایان کردووە لەوکاتەدا، لێوانلێو بێت لە قسە و گوفتارێك کە تایبەت بووە بە ژیانی جیاوازی ئەوان لە هی سەردەمی ئومەوی. دەکرێ بپرسین کوا هیجای موشریکەکان بۆ مسوڵمانان و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)؟ بەتایبەتی لەکاتی شەڕەکاندا، خۆ شاعیر زمانحاڵی هۆزەکەی بووە. واقیع پێمان دەڵێ دەبێ شاعیرەکان لە کاتی جەنگدا یارمەتیی جەنگاوەرەکانیان دابێت بە زمان. ئاخر ئەوان خوێنی یەکتریان ڕشتووە، دەبێ قسەوتن بە یەکتری ساناتر بووبێت، چونکە خوێن لە ڕەوشت بەبەهاتر بووە، بەڵام جگە لە چەند نموونەیەکی کەم، شتێکی لەو بابەتە نییە لەم شیعرەی ئێستادا، بێگومان هەبووە، بەڵام چونکە ئەم شیعرە لە ژینگەیەکی ئیسلامی و لەناو کلتووری مسوڵماناندا نووسراوەتەوە و

داڕێژراوەتەوە، ئەم جۆرە ناوەرۆکە نەیتوانیوە دەربازبێت بۆ سەر ڕووپەڕی کاغەز و نووسراو.

**سێیەم:** لە ڕووی وێنەی شیعرییەوە، سەرەڕای ئەوەی باسکرا، ئەگەر لە وێنەی شیعری سەردەمی جاهیلی وردبینەوە، دەبینین هەندێك وێنە یەکانگیر نییە لەگەڵ سروشت و شێوەی ژیانی ئەو سەردەمەدا، تەنانەت لەناو قەسیدەکاندا وەکو خزێنرابنە ناو بەیتە شیعرییەکانەوە وایە، هەر لە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانیەوە تا چۆنیەتی پێکهاتنی وێنەکان و وردەکاری لە هونەری بنیاتنانیدا، هەموو ئەمانە نزیکن لەو کولتووره هونەرییەی کە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا باوبووە، نەك لە سەردەمی جاهیلیدا. بۆ نموونە وێنەگەلێك دەبینین دوورن لە سروشتی دوورگەی عەرەبی، وەکو بەکارهێنانی دەریای فراوان و گەورە و کۆشك و تەلاری بەرز و ڕازاوە، ئاشکرایە کە دوورگەی عەرەبی وشك و بێروون بووە، هەروەها ڕواڵەتەکانی شارستانی و تەلارسازی لە سەردەمی جاهیلیدا نەبووە، بەڵکو زۆرینەی عەرەب ڕەوەند و دەوارنشین بوون و ئەوانەشی لەشارەکاندا نیشتەجێ بوون، لە خانووی سادەدا ژیانیان بەسەر بردووە، بەڵام دوای فتوحاتی ئیسلامی، عەرەب لە نیوەدوورگەی خیان چوونەتە دەرەوە و دەریایان بڕیوە و سروشتێکی جیاواز لە دەوروبەری خۆیانیان بینیوە، هەروەها لە سەردەمی ئومەوی بەدواوە کۆشك و تەلاری گەورە پەیدابوون و هونەری بیناسازی پێشکەوتووە.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەرەستەکانی بنیاتنانی وێنە، سادەبوون لە سەردەمی جاهیلیدا، وەك ژیانی ئەوکاتە، وێنەی شیعری ساکاربووە نزیك لە زەین و بیری خەڵکی، پێویستی بە لێکدانەوەی زۆر نەبووە، بەڵام لەناو ئەم شیعرەدا زۆرجار وێنەی زۆر جوان و چڕوپڕ دەبینرێ کە دوورە لە هونەری ئەوکاتە، کەمیش نین ئەو وێنانەی ڕەخنەگران گومان دەکەن لەوەی کە هی شاعیرانی ئەو کاتە بن.

# ئــەنجام

له كۆتايى ئەم باسەدا:

بۆمان دەردەكەوێت كە شيعرى جاهيلى هيچ بنچينەيەكى ڕاست و درووستى نييە و شيعرى ڕاستەقينەى پێش ئيسلام نەگەيشتووەتە دەستمان و فەوتاوە، دواتر و لە ماوەيەكى دوور و درێژى دواى هاتنى ئيسلام و بڵاوبوونەوەى قورئان و چەسپانى زمانى قورئان وەك زمانى ستاندەرى قسەكردن لەناو عەرەب و نەتەوە مسوڵمانەكاندا، ئەم شيعرانە دروستكراون و هەڵبەستراون، بۆيە نەك تەنها چەند بەيتێك و قەسيدەيەك، بەڵكو سەرتاپاى شيعرى بەناو جاهيلى لە ڕووى شێواز و زمان و وشە و ماناوە لە قورئان دەچێت، ئەمەش بە تەواوى ئەو گومانە پووچ و بێ بنەما دەكات كە پێشتر ئاماژەمان پێكرد و پێچەوانەى ئەوە دەسەلمێنێت، كە ئەويش ئەوەيە كە قورئان كاريگەريى لەسەر چۆنيەتى داڕشتنەوە و هۆنينەوەى ئەم شيعرە هەبووە، ئەمەش ئاساييە، چونكە قورئان بە زمانێكى پاراو و ئيحا بەخش هاتووە و كاريگەريى زۆرى نەك تەنها لەسەر شيعر و ئەدەب درووست كردووە، بەڵكو لەسەر زمانى قسەكردن و تەواوى كلتوورى عەرەب شوێنى داناوە. بۆيە ئەوانەى ويستوويانە شيعر بە ناوى جاهيلييەكانەوە درووست بكەن، هەرچەند هەوڵيان دابێت وێناى ئەو سەردەمە بكەن و نزيك بكەونەوە لە ژيانى پێش ئيسلام، نەيانتوانيوە لەژێر كاريگەريى كلتوورێك دەربچن كە بەهۆى قورئانەوە درووست بووە و زياد لە سەدە و نيوێك بووە بەرهەمهاتووە، چونكە سروشتى كلتوور وايە زۆر بە شێنەيى و فراوانى هەموو ژيان داگير دەكات و ئاراستەى دەكات، دەربازبوون لێى كارێكى زۆر ئەستەمە، دەتوانين خۆمان لە بەشێكى كلتوور داڕنين، بەڵام دەرچوون لێى بە تەواوى هەرگيز نابێت، بۆيە كەسانێك هەستاون بە درووستكرن و سەرلەنوێ داڕشتنەوەى ئەم شيعرە بەناوى جاهيلييەكانەوە كە لەو سەردەمەدا نەژياون و شێوەى ژيانيان زۆر جياواز بووە لە هەموو ڕووەكانەوە لە هى ئەوان.

شیعرێك ئەمە حاڵی بێت و هیچ ڕاستەقینەیەك لەخۆی نەگرێت، چۆن دەكرێ شایستەی ئەوە بێت ئەو گومانەی لێبكرێ كە كاریگەریی لەسەر قورئان هەبووبێت و تێیدا ڕەنگی دابێتەوە؟!

# سەرچاوەکان


- قورئانی پیرۆز.

١. تأريخ الأدب العربي، العصر الجاهلي، د. شوقي ضيف، دار المعارف – القاهرة، ط٨، ١٩٧٧.

٢. دراسات المستشرقين حول صحة الشعر الجاهلي، عبدالرحمن بدوي، دار العلم للملايين – بيروت، ١٩٧٩.

٣. طبقات فحول الشعراء، محمد ابن سلّام الجمحي، تحقيق: محمود شاكر، القاهرة، ١٩٧٤.

٤. في الشعر الجاهلي، طه حسين، دار المدى للثقافة والنشر، طبعة خاصة، ٢٠٠١.

٥. قراءة جديدة لقضية الشك في أدب الجاهلية، د. مصطفى الجوزو، دار الطليعة – بيروت، ٢٠٠١.

# پێشەکی

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله..

گرنگیی ئاین لە ژیانی مرۆڤدا، ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، جا ئەو ئایینە ئاسمانی بێت، بەو واتایەی پەیوەندی لە نێوان زەوی و ئاسماندا، پەیوەندی لە نێوان مرۆڤی دروستکراو و خولقێنەری بەتوانا، ئەوە گرنگترەو سروشتی مرۆڤ ئەوە دەخوازێت. جا بۆیە ئەو حەلەقەیەی کە زنجیرەی ئاسمان دەگەیەنێت بە زەوی، زۆر هەستیار و گرنگە، هەر خەوشێك ڕووی تێ بکات، کەموکووڕی دەکەوێتە هەموو پەیوەندییەکە، بەو واتایەی ئەو ئایینە متمانە لەدەست دەدات. هەرکەس بیەوێت، دەستکاریی دەکات و دەیشێوێنێت. ئەو حەلەقەیەش بریتییە لە نیگا (الوحي).

پاراستنی نیگا و وتەکانی خوا و مانەوەیان بە پارێزراوی، نیشانەی زیندووێتیی ئەو ئایینەیە، شێوان و تێکچوونی نیگا و دەستکاریکردنی، نیشانەی گۆڕانی ئەو ئایینەیە. تا دەگاتە ئاستێك کەس متمانەی پێی نامێنێت، هیچ بەربەستێك نامێنێت لە تێکچوونی زیاتر و زیاتری ئەو بەرنامەیە. وەك بەدی دەکرێت لە هەندێ پەیامی ئاسمانیدا. لەبەر ئەو هۆیەشە خودای گەورە پەیمانی داوە کە خۆی پەیامەکەی و دوا وتەکانی بۆ مرۆڤایەتی، بپارێزێت (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُون). لەگەڵ بوونی نەیارانی قورئان هەر لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلامییەوە، بەڵام بە پارێزراوی ماوەتەوە بە پێچەوانەی کتێبە ئاسمانییەکانی تر.

دوژمنانی ئیسلام چاك دەزانن کە لێدانی نیگا و قورئان و گومان خستنە ڕاستی و دروستی و سەرچاوەی قورئان، بەهێزترین گورزە لە ئیسلام دەدرێت. جا هەرجارەو بە ناوێك و هەرجارەو بە شێوەیەك. لەو هێرشانەش: بانگەشەی

زیادکردن و کەمکردن لە قورئاندا. هەندێك لەو لایەنانەش بە بیانووی بەرگریکردن لە قورئان و گەیشتن بە ڕاستییەکان، ئەو بانگەشانە دەکەن!

بە دیقەتگرتن لە دەعوا و بەڵگەکانیان، دەردەکەوێت کە ئەمە فیلمێکە، یان شانۆگەرییەکە چەند بەشێکی هەیەو چەند ساڵێك جارێك دووبارەدەبێتەوە. هەر لە سەرەتای هاتنە خوارەوەی قورئاندا، نەیارانی قورئان هەوڵیان داوە کە گومان بخەنە سەرچاوەی قورئانەوە، وا لە خەڵکی بگەیەنن کە لە لایەنی خواوە نەهاتووە. لەم دواییەشدا تێبینی دەکرێت کە چەند لایەن و پێگەی ئەنتەرنێت و چەند کتێبێك، تەنانەت بە زمانی کوردیش، دەرکراوە و بڵاوکراوەتەوە، بانگەشەی زیادکردن و کەمکردن دەکەن لە قورئاندا. بەڵکو هەندێکیشیان چەند هەوڵێکی گاڵتەئامێزیان داوە لە نووسینەوەی چەند وشەیەك گوایە وەك قورئان وایە!

لەم لێکۆڵینەوەیەدا وەڵامی هەندێك لەو گومانانە دەدەینەوە کە بانگەشەی (تحریف)ی قورئان دەکەن. لە سەرەتاوە باسی چۆنێتیی پاراستنی قورئان دەکەین، کە خوای گەورە خۆی پەیمانی داوە بیپارێزێت. هەروەها بە کورتی باسی نەسخ دەکەین لە قورئاندا، کە پێویستە بۆ تێگەیشتن لە وەڵامی زانایان بۆ گومانەکان. پاشان باسی کۆکردنەوە و نووسینەوەی قورئان دەکەین، کە بەردی بناغەیە لە بەرگریکردن لە نەگۆڕانی قورئان و سەلماندنی ئەوەی کە ئەو موصحەفەی لەبەردەستماندایە، هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتووە لە سەردەمی پێغەمبەرەوە تا ئێستا. لە کۆتایی بابەتەکەدا ئاماژە بە هەندێك لەو لایەنانە دەدەین کە بانگەشەی (تحریف) دەکەن لە قورئاندا و هەندێك لە بەناو بەڵگەکانیان دێنینەوە و وەڵامیان دەدەینەوە.

بابەتەکە، دوای پێشەکی، دەکەین بەم بەشانەوە:

**بەشی یەکەم:** پاراستنی قورئان: **تەوەرەی یەکەم:** پاراستنی قورئان بە ڕێگەی لەبەرکردن.

**تەوەرەی دووەم:** پاراستنی قورئان بە ڕێگەی نووسینەوە.

**تەوەرەی سـێیەم:** نەسخ لە قورئاندا.

**بەشی دووەم:** کۆکردنەوەی قورئان:

**تەوەرەی یەکەم:** کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ.

**تەوەرەی دووەم:** کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی ئەبوبەکردا.

**تەوەرەی سـێیەم:** کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی عوسماندا.

**بەشی سێیەم:** بانگەشەکردنی زیادکردن و کەمکردن لە قورئاندا.

**تەوەرەی یەکەم:** ئەو لایەنانەی گۆڕینی قورئان دەوروژێنن.

**تەوەرەی دووەم:** ئەو دەقانەی کە کراونەتە بەڵگە لەسەر زیادکردن و کەمکردن لە قورئاندا.

**تەوەرەی سـێیەم:** شیکردنەوەی بەڵگەکان.

ئەنجامەکان و ڕاسپاردەکان.

# بەشی یەکەم:
# پاراستنی قورئان

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُون) (الحجر-٩). نەسەفی دەڵێت: (خوای گەورە لە هەموو کاتێکدا دەیپارێزێت، لە زیادکردن و کەمکردن و (تحريف) و گۆڕین (تبديل)، بە پێچەوانەی کتێبە ئاسمانییەکانی تر. لەواندا خوای گەورە خۆی کەفیلیی پاراستنی نەکردووە، بەڵکو ئەوەی سپاردووە بە زاناکانیان (الربانيون والأحبار)، ئەوانیش جیاوازی کەوتە ناویانەوە بە هۆی ستەمی خۆیان، تەحریف ڕووی کردە کتێبەکانیان. کاتێك دەڵێت: (وإِنَّا لَهُ لَحَافِظُون) نیشانەیە لەسەر ئەوەی لەلایەن خۆیەوە هاتووە و موعجیزەیە، چونکە ئەگەر قسەی غەیری خوا بوایە، یان موعجیزە نەبووایە، ئەوا زیاد و کەم ڕووی تێدەکرد وەك هەموو نووسراوە دەستکردەکان[١]).

خوای گەورە قورئانی پاراستووە لە دڵەکاندا و پاشانیش بە ڕێنموونیکردنی هاوەڵان بۆ نووسینەوەی و پاراستنی لە دووتوێی کتێبێکدا.

## تەوەرەی یەکەم:
## پاراستنی قورئان بە ڕێگەی لەبەرکردن

هەر لە سەرەتای دابەزینی نیگاوە، پێغەمبەر ﷺ زۆر مەبەستی بووە کە چی وەردەگرێت لە جبریل لە بیری نەچێتەوە، بۆیە جاری وا هەبووە پەلەی کردووە و لە کاتی دابەزینی نیگادا دەمی جوڵاندووە، بۆیە خوای گەورەی پێی فەرموو: (لَاتُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنا جَمْعَهُ وَقُرءانَهُ، فإذا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْءانَهُ..

[١] تفسير النسفي، مدارك التنزيل وحقائق التأويل، عبدالله بن أحمد بن محمود النّسفي، إعتنى به: عبدالمجيد طعمة حليي، دار المعرفة، بيروت، ط٢، ١٤٢٩هـ، ٢٠٠٨م: ٥٧٨. هەروەها سەيری (تفسير الكشاف)ی زومەخشەری بكە، ٥٥٨-٥٥٩.

القيامة ١٦–١٨). واتە: (زوبانت مەجولێنە بە خوێندنی قورئانەکەت لەگەڵ (جوبرەئیل)دا بۆ ئەوەی پەلەی پێ بکەیت و بە پەلە وەری بگری نەوەك هەندێکت لەبیر بچێ، پەلە مەکە و خەمی لەبیرچوونت نەبێت، چونکە لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سنگتدا و دامەزراندنی لە زوبانتا. کەواتە بوەستە و کاتێك ئێمە خوێندمانەوە، ئینجا تۆ شوێنی بکەوە و بەدوای ئەودا بیخوێنەوە[2]).

هەر لە سەرەتای هاتنە خوارەوەی قورئاندا، پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتانەی دابەزیبوون دەیگەیاندە هاوەڵەکانی و ئەوانیش لەبەریان دەکرد و یەکتریان فێردەکرد.

هاوەڵان لە دەمی پێغەمبەرەوە قورئانیان وەرگرتووە، ئەوەتا عوبادەی کوڕی صامیت دەڵێت: (كان الرجل إذا هاجر دفعه النبي ﷺ إلى رجل منّا يعلمه القرآن، وكان يُسمَعُ لِمسجدِ رسول الله ﷺ ضجةً بتلاوة القرآن حتى أمرهم رسول الله أن يخفضوا أصواتهم لِئَلا يَتَغالطوا[3]). واتە: (هەرکاتێك پیاوێك کۆچی بکردایە بۆ مەدینە، پێغەمبەر ﷺ دەیدایە دەست یەکێکمان تا قورئانی فێربکات، تا کار بە ئەندازەیەك گەیشت، لەبەر زۆریی ئەوانەی قورئانیان دەخوێندەوە، دەنگەدەنگێکی زۆر دروست بووبوو لە مزگەوت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن کە دەنگیان نزمبکەنەوە تا لێیان تێك نەچێت) ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە هاوەڵان گرنگییەکی زۆریان داوە بە قورئان خوێندنەوە و لەبەرکردنی و ژمارەشیان زۆر بووە.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: (والله لقد أخذتُ مِن فِيّ رسولِ الله ﷺ بضعاً وسبعين سورة). واتە: (سوێند بە خوا حەفتا و ئەوەندە

[2] تەفسیری قورئانی پیرۆز، عثمان عبدالعزیز، ط٢، بیروت، لبنان، ٢٠١٠: ١٠/٤٠٣.

[3] ذكره الزرقاني في مناهل العرفان، ١/ ١٧٤.

سورەتم لە دەمی پێغەمبەرەوە وەرگرتووە[٤]). هەروەها دەڵێت: (كنا مع رسول الله ﷺ وأُنْزِلتْ عليه والمرسلات، وإنا لنتلقَّاها من فِيه[٥]). واتە: (لەگەڵ پێغەمبەردا بووین کە سورەتی (والمرسلات) هاتەخوارەوە، ئێمەش لە دەمی ئەوەوە وەرمانگرت). هەروەها ئەحمەد لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (كان رسول الله ﷺ يعلمنا القرآن، فإذا مَرّ بسجود القرآن سجد وسجدنا معه[٦]). واتە: (پێغەمبەر ﷺ خۆی قورئانی فێردەکردین، ئەگەر بگەیشتایەتە ئایەتێك سوجدەی تیلاوەی تێدابوایە، سوجدەی دەبرد و ئێمەش سوجدەمان دەبرد).

بەڵکو لەوەش زیاتر، پێغەمبەر ﷺ دێت بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب، پێی دەڵێت: (إني أمرتُ أن أقرأ عليك سورة كذا وكذا). واتە: (فەرمانم پێ کراوە فلانە سورەت و فلانە سورەتت بۆ بخوێنمەوە). لە ڕیوایەتێکدا دەڵێت: (إني أقرئك القرآن، قال: آللهُ سمّاني لك؟ قال : نعم، فبكى أُبي[٧]). واتە: (من قورئانت بۆ دەخوێنمەوە. ئوبەیش وتی: بەڕاستی خوای گەورە ناوی منی لات هێناوە؟ فەرمووی بەڵێ. جا ئوبەی دەستیکرد بە گریان).

ئیبن جەزەری دەڵێت: (پاشان پشتبەستن لە گواستنەوەی قورئاندا بە لەبەرکردنی بووە لە دڵەکاندا، نەك بە نووسینی موصحەفەکان. ئەمەش بەرزترین تایبەتمەندیی ئەم ئوممەتەیە کە خوا پێی بەخشیوە. لە فەرمودەی دروست (صحیح)ی پێغەمبەردا ﷺ کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە، هاتووە: (إنَّ رَبّي قالَ لي قم في قريشٍ فأنذِرهُم، فَقُلتُ لهُ أي ربِّ إذن يثلغوا رأسي حتى يدعوهُ خبزَةً، فَقالَ: إنّي

---

[٤] البخاري في كتاب فضائل القرآن، باب القراء من أصحاب النبي.

[٥] البخاري: تفسير القرآن (٤٦٤٦)، مسلم: السلام (٢٢٣٤)، أحمد (٤٥٨/١).

[٦] البخاري: الجمعة (١٠٢٥)، مسلم: المساجد ومواضع الصلاة (٥٧٥)، أبو داود: الصلاة (١٤١٢)، أحمد (١٥٧/٢).

[٧] البخاري: ٤٩٦١، ومسلم: ٧٩٩.

مبتليكَ ومبتلٍ بكَ، ومنزلٌ عليكَ كِتاباً لا يغسله المَاء، تقرَؤه نائماً ويقظانَ، فابعثْ جنداً أبعث مثلهمْ، وقاتلْ بمنْ أطاعكَ منْ عصاكَ، وأنْفِقْ يُنفقْ عليكَ). خوای گەورە ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە قورئان بۆ پاراستنی پێویستی بەوە نییە لە پەڕەیەکدا بنووسرێتەوە کە بە ئاو بشۆردرێتەوە، بەڵکو لە هەموو حاڵەتێکدا بخوێنرێتەوە، وەك لە وەسفی ئوممەتەکەیدا هاتووە (أناجيلُهم صدورهم) ئەوەش بە پێچەوانەی ئەهلی کتێبەکانەوەیە کە ناتوانن کتێبەکانیان بپارێزن ئەگەر نەنووسرابێتەوە لە کتێبدا. ناتوانن لەبەر بیخوێننەوە بە تەماشاکردن نەبێت[٨]).

## تەوەرەی دووەم:

## پاراستنی قورئان بە ڕێگەی نووسینەوەی

جگە لە لەبەرکردنی لە لایەن هاوەڵان و دەماودەمکردنی و گرنگیدانیان پێی. پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە سەرەتای دابەزینی نیگاوە، ئەو ئایەتانەی کە دادەبەزین، داوای لە هاوەڵان دەکرد کە بیاننووسنەوە، بۆ ئەو مەبەستەش نووسەرانی نیگای هەبوون، کە لەبەردەستی پێغەمبەردا ﷺ قورئانیان بۆ دەنووسییەوە. ئەمە جگە لەوەی هاوەڵان خۆیان –ئەوەی نووسین و خوێندنەوەی دەزانی– موصحەفیان بۆ خۆیان دەنووسی. بەم شێوەیە هیچ ئایەتێك دانەبەزیبوو کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خۆیدا بە نووسراوی نەپارێزرابێت.

نووسەرەکانی نیگا: ئەو هاوەڵانەن کە بە فەرمی لەبەردەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ قورئانیان دەنووسییەوە کە ژمارەیان دەگەیشتە نزیکی ٦٠ کەس، لەوانەش: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان و عەلی،... هتد، لە کۆچکردووەکان، زەیدی کوڕی سابت، ئوبەیی و... هتد، لە پشتیوانان.

---

[٨] مناهل العرفان في علوم القرآن، محمد عبدالعظيم الزرقاني، دار إحياء التراث العربي، بيروت، لبنان، ط٢: ١/ ١٧٥.

* قەتادە لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە: (جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ أَرْبَعَةٌ كُلُّهُمْ مِنْ الْأَنْصَارِ أُبَيٌّ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأَبُو زَيْدٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ. قُلْتُ: لِأَنَسٍ مَنْ أَبُو زَيْدٍ قَالَ أَحَدُ عُمُومَتِي[9]). واتە: (لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ٤ کەس هەموو قورئانیان کۆکردبووەوە هەموویان لە پشتیوانان بوون: ئوبەی و مەعازی کوڕی جەبەل و ئەبو زەید و زەیدی کوڕی سابت. بە ئەنەسم وت: ئەبو زەید کێیە؟ وتی: لە مامانمە).

* لە ریوایەتێکی تردا لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (مَاتَ النَّبِيُّ ﷺ وَلَمْ يَجْمَعْ الْقُرْآنَ غَيْرُ أَرْبَعَةٍ أَبُو الدَّرْدَاءِ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو زَيْدٍ، قَالَ: وَنَحْنُ وَرِثْنَاهُ[10]). واتە: (پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، لە ٤ کەس زیاتر، کەس هەموو قورئانی کۆنەکردبووەوە، ئەبو دەردا و مەعازی کوڕی جەبەل و زەیدی کوڕی سابت و ئەبو زەید، ئێمەش لەوانەوە بۆمان ماوەتەوە).

کەواتە دەردەکەوێت ناوبردنی ئەو ٤ کەسە ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها ئەوان هەموو قورئانیان لەبەربووبێت، وەك وا دەردەکەوێت لە ڕیوایەتی دووەمدا، لەجیاتی ئوبەی ئەبودەرداو هاتووە. هەروەها ئەنەسیش دەڵێت: ئێمەش لەوانەوە وەرمانگرتووە. ئەنەس لە هەردوو ڕیوایەتەکەدا ڕاستگۆیە، چونکە ناچێتە عەقڵەوە کە خۆی بەدرۆبخاتەوە، کەواتە دەردەکەوێت کە ئەم (حصر)ەی ئەنەس بۆ (إضافة)یە، نەك حەقیقی[11]. کەواتە نابێت ئەم فەرموودانە وا وەربگیرێن کە تەنها ٤ هاوەڵ هەموو قورئانیان لەبەربووە، بەڵکو چەندین هاوەڵ قورئانیان لەبەربووە، لە کۆچکەران: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، تەڵحە، سەعد، ئیبن مەسعود، حوزەیفە، سالم، ئەبوهورەیرە، ئیبن عومەر، ئیبن عەبباس، عەمری

---

[9] البخاري ٣٥٢٦. هەروەها: أحمد: ١٢٩٥٩.

[10] البخاري، ٥٠٠٤.

[11] مناهل العرفان، ١/ ١٧٥.

کوڕی عاس، عەبدوڵڵای کوڕی، معاویە، ئیبن زوبەیر، عەبدوڵڵای کوڕی سائیب، عائیشە، حەفسە، ئوم سەلەمە و ئوم وەرەقە. لە پشتیوانانیش: زەیدی کوڕی سابت، موعازی کوڕی جەبەل، ئوبەی کوڕی کەعب، ئەبو دەردا، موجەممەعی کوڕی حاریسە، ئەنەسی کوڕی مالیك و ئەبو زەیدی ئەنساری[١٢].

پێدەچێت ئەم ناونانەی ئەنەس لە میانەی شانازیکردنەوە بوو بێت بە کارەکانی قەومەکەیەوە، بەو کارانەی کە بۆ ئیسلامیان کردووە. قەتادە لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: (افْتَخَرَ أعْيانُ الأوْسِ وَالخَزرَجِ، فَقَال الأوسُ: منّا أربَعَةٌ: مَنْ اهْتَّزَ لَهُ العَرْشُ: سَعدُ بنُ مُعاذٍ، وَمَنْ عَدلَتْ شَهادَتُهُ شَهادَةَ رَجُلين: خُزَيمةُ بنُ ثابتٍ، وَمَنْ غَسَلتْهُ الملائكَةُ: حَنظَلَةُ بنُ أَبي عَامرٍ، وَمَنْ حَمَلتْهُ الدُّبُرُ: عَاصِمُ بنُ ثابِتٍ. فَقَالَ الخَزرَجُ: منّا أرْبَعَةٌ جمَعُوا القُرآنَ لمَ يَجْمَعْهُ غَيرُهُم، فَذَكَرَهُم..)[١٣].

ماوەردی دەڵێت: وتەکەی ئەنەس ئەوە ناگەیەنێت کە جگە لەوان کەس هەموو قورئانی لەبەرنەبووبێت، لەبەر ئەوەی ئەنەس ناتوانێت تەئکیدی ئەوە بکات، لەبەر زۆریی هاوەڵان و بڵاوبوونەوەیان بە وڵاتاندا، ئەوەش ناکرێت مەگەر یەك بە یەك پێیان بگات و پرسیاریان لێبکات کە ئایا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەموو قورئانیان لەبەر بووە؟ ئەمەش زۆر دوورە لە عادەتییەوە. چۆن دەبێت واقیع وابێت و لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ڕێگەی حەفسی کوڕی عومەر کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خُذوا القُرآنَ عَنْ أرْبَعَةٍ: عَنْ عَبدِالله بنِ مَسْعودٍ، وَسالِمٍ، وَمُعاذِ بنِ جَبَلٍ، وَأُبَيٍّ ابْنِ كَعْبٍ) ئەم چوارەش دوانی یەکەمیان لە کۆچکەرانن و دوانەکەی تریش لە پشتیوانانن.. کەواتە مەبەستی (ماوەردی) ئەوەیە ئەنەس

---

[١٢] تأريخ القرآن وغرائب رسمه وحكمه، محمد طاهر بن عبدالقادر الكردي المكي الخطاط: ٦٩- ٧٠. هەروەها: مناهل العرفان، ١/ ١٧٤.

[١٣] رواه الطبراني في المعجم الكبير (٣٤١٠)، وأبو يعلى (٢٨٨٤)، وذكره الهيثمي في كتاب مجمع الزوائد (١/ ٤١)، وقال: رواه أبو يعلى والبزار والطبراني ورجالهم رجال الصحيح. لە کتێبی: إتقان البرهان في علوم القرآن، د. فضل حسن عباس، دار النفائس، الأردن، ط٢، ٢٠١٠م،١٤٣٠هـ: ١/ ٢٨٧.

مەبەستی (الحصر الإضافي)ە، نەك (الحصر الحقيقي). هەروەها لە سونەنی نەسائیدا بە سەنەدێكی دروست (صحيح) هاتووە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە كە وتوویەتی: (جَمَعْتُ القُرآنَ فَقَرأتُ بِهِ كُلَّ لَيلَةٍ، فَبَلغَ النَّبيَ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: اقْرَأْهُ في شَهْرٍ... تا دوایی). واتە: (هەموو قورئانم لەبەربوو، هەموویم لە شەوێكدا دەخوێندەوە. ئەمە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە، پێی وتم: لە مانگێكدا بیخوێنەرەوە...). هەروەها ئەبو داوود بە سەنەدێكی حەسەن لە موحەممەدی كوڕی كەعبی قەرەزییەوە دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: (جمَعَ القُرآنَ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ خَمْسَةٌ مِنَ الأنْصارِ: مُعاذُ بنُ جَبلٍ، وعُبادَةُ بنُ الصامِتِ، وَأَبَيُّ بنُ كَعْبٍ، وَأبو الدَرْداءِ، وأبو أيّوبٍ الأنْصاري). واتە: (لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پێنج لە پشتیوانان هەموو قورئانیان لەبەربووە، ئەوانیش: موعاز و عوبادە و ئوبەی و ئەبودەرداو و ئەبوئەییوب بوون). هەندێك لە زانایان بۆ ئەوە چوون كە مەبەستی كۆكردنەوە —لەبەركردن— لە فەرموودەكەی ئەنەسدا —كە باسكرا— نووسینەوە بێت نەك لەبەركردن. هەندێكیش بۆ ئەوە چوون كە مەبەست پێی كۆكردنەوەی هەموو شێوەكانی (قراءات) بێت، یان مەبەست وەرگرتنی قورئان بێت —هەمووی— لە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ، بەش بەش تا هەموو قورئان دابەزیوە[١٤]..

هەروەها زەركەشی دەڵێت: ئەوەی كە لەم ڕیوایەتانەوە وەردەگیرێت كە ئاڕاستەیەكی تایبەتمەندە، ئەویش ئەوەیە ئەمانە قورئانیان لەبەربووە و لەبەركردنەكەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ خوێندووەتەوە و ئەویش ئیقراری بۆ كردوون[١٥]، نەك مانای وابێت كە تەنها ئەوان قورئانیان لەبەربووبێت[١٦].

---

[١٤] مناهل العرفان، ١ / ١٧٥ - ١٧٦.

[١٥] واتە: بە ریوایەت وەریانگرتووە بە ڕاستەوخۆ.

[١٦] البرهان في علوم القرآن، الإمام بدرالدين محمد بن عبدالله الزّركشي، تحقيق: محمد أبو الفضل ابراهيم، دار المعرفة، بيروت، لبنان، ١٩٧٢م، ١٣٩١هـ: ١/ ٢٤١- ٢٤٣.

ژمارەی ئەوانەی کە قورئانیان لەبەربووە، زۆر بوون. بۆ نموونە ئەوانەی لە هەردوو ڕووداوی بیری مەعونە و شەڕی یەمامە گەیشتبووە ١٤٠ لە هاوەڵان.

ئەو شتانەی کە قورئانیان لەسەر دەنووسییەوە بریتیبوون لە:

١- پێستی ئاژەڵ (الرِّقاع): زەید دەڵێت: (كُنّا عِنْدَ رَسولِ اللهِ ﷺ نُؤَلِفُ القُرآنَ مِنَ الرِّقاعِ)[١٧]. واتە: لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، قورئانمان لەسەر پێستەی خۆشکراو دەنووسییەوە.

٢- پەلی پانی دارخورما (العُسُب).

٣- تەنکە بەرد (اللِّخاف): زەید دەڵێت: (فَتَتَبعْتُ القُرآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ العُسُبِ واللِّخافِ)[١٨] . واتە: (بەدوای پارچە قورئانە نووسراوەکاندا گەڕام کە لەسەر پەلی دارخورما و تەنکە بەرد نووسرابوونەوە).

٤- پارچە تەختە (الأقتاب): زەید دەڵێت: (فَجَمَعْتُ القُرآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الاكْتافِ وَالاقْتابِ وَالعُسُبِ وَصُدُورِ الرِّجالِ)[١٩]. واتە: قورئانم کۆکردەوە لەسەر ئێسکی دەفەی شان، پارچە تەختە، پەلی پانی دارخورما و سنگی پیاوان - واتە لەبەریانبوو - نووسرابووەوە.[٢٠]

---

[١٧] أحمد في مسنده ج٥ - ص١٨٥.

[١٨] البخاري في كتاب فضائل القرآن، باب جمع القرآن.

[١٩] كتاب المصاحف، ابن أبي داود، ل ٨- ٩. لە كتێبی: الإتقان في علوم القرآن، جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي، حققه وعلّق عليه وخرّج أحاديثه: فوّاز أحمد زمرلي، دار الكتاب العربي، بيروت، لبنان، ١٤٢٧هـ، ٢٠٠٧م.

[٢٠] الإتقان، السيوطي، ١٥٦- ١٥٧.

## تەوەرەی سێیەم:

## نەسخ لە قورئاندا:

بۆ تێگەیشتن لە کۆکردنەوەی قورئان و نووسینەوە و خوێندنەوەی، پێویستە توێژەر زانستی هەبێت لەسەر نەسخ لە قورئاندا، جۆرەکانی و تا چ ڕادەیەك پشتی پێ دەبەسترێت؟ ئەویش بە کورتی –چونکە بابەتەکە باسی نەسخ نییە– لەبەر ئەوە دەڵێین باشترین پێناسە بۆ نەسخ وەك د. سوبحی صالح[21] دەڵێت: (رفع الحكم الشرعي بدليل شرعي) واتە لابردنی فەرمانێکی شەرعی بە بەڵگەیەکی شەرعی.

قورتوبیش لە تەفسیری ئایەتی (مَا نَنْسَخْ مِنْ آيَةٍ أَو نُنْسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَو مِثْلِهَا.. البقرة ١٠٦)دا دەڵێت: (نەسخ جیاوازە لە (البداء)، بەڵکو نەسخ بریتییە لە گواستنەوەی بەندەکان لە پەرستشێکەوە بۆ پەرستشێکی تر، هەروەها فەرمانێك بۆ فەرمانێکی تر، لەبەر بەرژەوەندییەکی تایبەت، کە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی حیکمەتی خوای گەورە و کامڵبوونی شەریعەتەکەی. خاوەن عەقڵەکان کۆکن لەسەر ئەوەی مەبەست لە شەریعەتی پێغەمبەران مەصلەحەتی دین و دونیای خەڵکییە، بەڵام لە (البداء)دا وا پێویست دەکات کە –مەبەست خوای گەورە– پێشتر عیلمی نەبووبێت بە ئایندە (مآل)ی کارەکان، بەڵام زانا بەوانە – دیارە خوای گەورە زانایە بە ئایندەی هەموو شتەکان– ئەوە وتارەکانی دەگۆڕێت بە پێی گۆڕانی مەسلەحەت)[22].. ئەمە وەڵامی ئەوانەیە کە ڕەدی نەسخ دەکەنەوە بە شێوەیەکی گشتی، گوایە ناگونجێت لەگەڵ گەورەیی و زانایی خوای گەورە.

---

[21] مباحث في علوم القرآن، د. صبحي صالح، دار العلم للملايين، بيروت، لبنان، ط١٠، ١٩٧٧: ٢٦١.

[22] الجامع لأحكام القرآن، محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي، تحقيق: د. عبدالحميد هنداوي، المكتبة العصرية، صيدا، بيروت، لبنان، ٢٠١١م، ١٤٣٢هـ: ١/ ٣٧٨.

هەروەها دەبێت بزانین کە نەسخ دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ وەستاوە و ئەو دەرگایە داخراوە. قورتوبی دەڵێت: (ئەمما دوای مردنی –پێغەمبەر ﷺ– و چەسپاندنی شەریعەت، ئەوا ئوممەتی ئیسلام کۆکن لەسەر تەواوبوونی نەسخ، کەواتە کۆکبوون (اجماع) ناتوانێت نەسخی دەقێك بکات کە جێگیر بووبێت دوای پچڕانی نیگا. ئەگەر بینیمان (اجماع)ێك پێچەوانەی دەقێکە، ئەوە ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە ئەو (اجماع)ە پشتی بەستووە بە دەقێکی ناسخکەر کە ئێمە درکمان پێنەکردووە و ئەو دەقەی کە نەسخ کراوە –بەو اجماعە– کاری پێ ناکرێت، ناوەڕۆکەکەی نەسخ بووە و تەنها خوێندنەوەی ماوە، وەك سوننەت دەخوێنرێتەوە و دەگێڕدرێتەوە (ڕیوایەت دەکرێت) وەکو ئایەتی (عدة السنة[٢٣])کە لە قورئاندا دەخوێنرێتەوە. یان دەبێت حوکمەکەی نەسخکرابێتەوە نەك خوێندنەوەی وەك (صدقة النجوى[٢٤]). لەوانەیە خوێندنەوەی نەسخکرابێت نەك حوکمەکەی، وەك (ئایەتی ڕەجم). لەوانەشە هەردوو خوێندنەوە و حوکمەکەشی نەسخکرابێت، لەوانەش وتەی ئەبوبەکر کە دەڵێت: (كنا نقرأ: لاترغبوا عن آبائكم فإنه كفر[٢٥]) و نموونەی ئەوانەش زۆرن)[٢٦].

زەڵمی دەڵێت: جیاوازیی (خلاف) لەوەدا نییە کە ڕەنگە هەندێك ئایەت لە قورئاندا نەسخکرابێتەوە پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام لەناو ئەو موصحەفەی کە لەبەردەستی موسڵماناندایە، تەسبیت نەکراوە[٢٧].

بە لای زانایانەوە نەسخ لە قورئاندا دەکرێت بە ٣ بەشەوە[٢٨]:

---

[٢٣] ئایەتی ٢٤٠ لە سورەتی (البقرة).

[٢٤] ئایەتی ١٢ لە سورەتی (المجادلة).

[٢٥] البخاري، ٦٨٣٠ ومسلم،١٦٩١.

[٢٦] الجامع لأحكام القرآن، ١ / ٣٨٠.

[٢٧] التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن، د. مصطفى ابراهيم الزلمي، مكتب التفسير، أربيل، ط١، ٢٠٠٠م: ٢٤.

١- ئەو ئایەتانەی حوکم و خوێندنەوەی نەسخ کراوە: بۆ نموونە: ئەو فەرمودەیەی عائیشە دەیگێڕێتەوە: (کان فیما اُنزل من القرآن: عشرُ رَضعاتٍ مَعْلُوماتٍ يُحَرِّمْنَ ثم نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلومَاتٍ، فتُوُفِّيَ رسولُ اللهِ ﷺ وهُنَّ فيما يُقْرأ مِنَ القُرآنِ)[29].

مەککی دەڵێت: ئەم نموونەیە هەردوو جۆری نەسخی تێدایە: نەسخی حوکم و نەسخی خوێندنەوە. جگە لەم نموونەیەش نازانم هەبێت[30].

٢- ئەو ئایەتانەی حوکمەکەی نەسخکراوە نەك خوێندنەوەی: لەم بەشەیاندا زیادەڕەوی زۆر کراوە، بەو مانایەی کە چەندین ئایەت بە نەسخکەر و نەسخکراو دانراوە و واش نییە -وەك سیوتی و زەڵمی و صالح و غەیری ئەوانیش ئاماژەیان بۆ کردووە- بۆ نموونە: ئایەتی (إِذا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِمُوا بَينَ يَدَي نَجْواكُمْ صَدَقَةَ) لە سورەتی (المجادلة) نەسخ کراوە بە ئایەتی دوای ئەو لە هەمان سورەتدا.

٣- ئەو ئایەتانەی خوێندنەوەیان نەسخکراوە نەك حوکمەکەیان: بۆ نموونە: ئەو ڕیوایەتەی کە ئەنەس دەیگێڕێتەوە لە چیرۆکی کوژراوانی بیری مەعوونە، کە پێغەمبەر ﷺ لە قنووتدا دوعای لێ کردوون: (وَنَزَلَ فيهم قُرآنٌ قَرَأْناهُ حتى رُفِعَ: أَنْ بَلِّغُوا عَنَّا قَوْمَنَا أَنَّا لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا)[31].

---

[28] بۆ زانیاریی زیاتر بنواڕە: الإتقان في علوم القرآن، السيوطي، ٥١٧- ٥٣٣.. التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن، د. مصطفى الزلمي، ٧٤- ٨٥.. مباحث في علوم القرآن، د. منّاع القطان، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١٩، ١٩٨٣م، ١٤٠٦هـ: ٢٣٨- ٢٣٩. مناهل العرفان، ٢/ ٤٨٧- ٤٨٨.

[29] مسلم ١٤٠٢، وأبو داود ٢٠٦٢، والترمذي ١١٥٠، والنسائي ٦/ ١٠٠، وابن ماجة ١٩٤٢، ومالك ٢/ ٦٠٨، وغيرهم (هامش الإتقان ٥٢٠).

[30] الإتقان، ٥٢١.

[31] البخاري ٢٨١٤، ومسلم ٦٧٧.

# بەشی دووەم:
# کۆکردنەوەی قورئان

کۆکردنەوە و نووسینەوەی قورئان بە سێ قۆناغدا تێپەڕیووە:

## تەوەرەی یەکەم: کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ

واتە لە کاتی هاتنەخوارەوەی قورئاندا. کە ئایەتەکان دادەبەزین پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد بە نووسینەوەی ئایەتەکان لەلایەن نووسەرەکانی نیگا (کتاب الوحي)ەوە، پاشانیش پێغەمبەر ﷺ داوای لێدەکردن کە ئەوەی نووسیویانە پیشانی بدەن و لەوانەیە هەندێ هەڵەشی بۆ چاککردبن و پاشان نووسراوەکان دەپارێزران لە لای هاوەڵ و خێزانەکانی. کە چەند ئایەتێك دادەبەزی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەم ئایەتانە بخەنە فلانە شوێن لە فلانە سورەت دوای فلانە ئایەت. بەڵگەش لەسەر ئەمانە:

* عوسمانی کوڕی ئەبی عاس دەڵێت: (كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَالِسًا إِذْ شَخَصَ بِبَصَرِهِ ثُمَّ صَوَّبَهُ حَتَّى كَادَ أَنْ يُلْزِقَهُ بِالارْضِ، قَالَ: ثُمَّ شَخَصَ بِبَصَرِهِ، فَقَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ –عَلَيْهِ السَّلَام– فَأَمَرَنِي أَنْ أَضَعَ هَذِهِ الْآيَةَ بِهَذَا الْمَوْضِعِ مِنْ هَذِهِ السُّورَةِ (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ) – أحمد ١٧٣٤٠–[٣٢]. واتە: جارێکیان لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم، لەناکاو چاوی بڕییە سەرەوە و پاشان هێنایە خوارەوە تا خەریکبوو بە زەویدا بینووسێنێت، جارێکی تر چاوی بەرزکردەوە و فەرمووی: جبریل هات بۆ لام و فەرمانی پێکردم کە ئەم ئایەتە بخەمە ئەم شوێنەوە لەم سوورەتەدا (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ.. تا.. لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ).. دیارە جبریل لەلایەن خۆیەوە ئەمە ناکات گەر فەرمانی خوا نەبێت.

---

[٣٢] هەروەها: سنن أبي داوود، ٢/٤٤٠: ٦٦٨، سنن الترمذي، ١٠/ ٣٥٢: ٣٠١١.

* بەڕاء دەڵێت: (لَمَّا نَزَلَتْ: لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ.. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ادْعُ لِي زَيْدًا وَلْيَجِئْ بِاللَّوْحِ وَالدَّوَاةِ وَالْكَتِفِ، أَوْ الْكَتِفِ وَالدَّوَاةِ، ثُمَّ قَالَ: اكْتُبْ لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ.. وَخَلْفَ ظَهْرِ النَّبِيِّ ﷺ عَمْرُو بْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا تَأْمُرُنِي فَإِنِّي رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ. فَنَزَلَتْ مَكَانَهَا: لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ..)[٣٣]. واتە: کاتێ کە ئەم ئایەتە دابەزی (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ..) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زەیدم بۆ بانگبکەن با (لەوح) و مرەکەب و دەفەی شانی ئاژەڵ، یان شان و مرەکەب بهێنێت. پاشان فەرمووی بنووسە: (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ..) و لەو کاتەدا عەمری کوڕی ئوم مەکتومی کوێر لە پشتیەوە وەستابوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی فەرمانی چی بە من دەکەیت کە من پیاوێکی نابینام؟ جا ئەو ئایەتەی تر هاتەخوارەوە: (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ.. تا: غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ).

بەڵگەی تر لەسەر ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قورئان نووسراوەتەوە:

* ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە: (أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالقُرآنِ إلى أَرْضِ العَدُوِّ)[٣٤]. واتە: (پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لێمان بە قورئانەوە بچینە ناو زەویی دوژمن) دیارە قورئانی نووسراوەیە، چونکە مەبەستی فەرموودەکە قورئانی ناو سنگ نییە.

---

[٣٣] البخاري ٤٦٠٦. هەروەها لە ریوایەتی: أحمد ١٧٨٢١.

[٣٤] البخاري: الجهاد والسير (٢٨٢٨)، مسلم: الإمارة (١٨٦٩)، أبو داود: الجهاد (٢٦١٠)، ابن ماجه: الجهاد (٢٨٨٠)، أحمد (٧/٢)، مالك: الجهاد (٩٧٩). هەروەها: السراج المنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، الحافظ جلال الدين السيوطي والعلامة محمد ناصر الدين الألباني، ترتيب وتعليق: عصام موسى هادي، مؤسسة الريّان، بيروت، لبنان، ط٣، ٢٠٠٩م، ١٤٣٠هـ: ٢/ ٧٨٠.

* ئەبوسەعیدی خودری دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تَكْتُبُوا عَنِّي، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ القُرآنِ فَلْيَمْحُهُ)[٣٥]. واتە: (هیچ مەنووسنەوە لەوەی کە دەیڵێم تەنها قورئان نەبێت، ئەگەر شتی ترتان نووسیوە، بیسڕنەوە). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خۆی فەرمانی کردووە بە نووسینەوەی قورئان.

* هەروەها ئەبوبەکر ـ لە کاتی نووسینەوەی قورئاندا ـ بە زەیدی وت: (كُنْتَ تَكْتُبُ الوَحْيَ لَرَسولِ اللهِ ﷺ). واتە: (تۆ کاتی خۆی قورئانت بۆ پێغەمبەر دەنووسییەوە).

* لە عوسمانەوە دەگێڕنەوە: (كان رسولُ الله ﷺ مِمَّا يَأْتي عَلَيه الزَمانُ، يَنْزِلُ عَلَيه مِنَ السُوَرِ ذَواتِ العَدَد، فَكانَ إذا نَزَلَ عليه الشَيءُ يَدعُو بَعضَ مَنْ يَكْتُبُ عِنْدَهُ فَيَقُولُ: ضَعُوا هذهِ في السُّورَةِ التي يُذْكَرُ فيها كَذا وكَذا. وَيَنْـزِلُ عَلَيـه الآيةُ فَيَقُولُ: ضَعُوا هَذه الآيَةَ في السُّورَةِ الّتي يُذْكَرُ فيها كَذا وكَذا، وَيَنْزِلُ عَليه الآياتُ فَيَقُولُ: ضَعُوا هَذهِ الآياتِ في السورةِ التي يُذْكَرُ فيها كذا وكذا)[٣٦]. واتە: (قورئان لە کاتی جیاجیادا دەهاتە خوارەوە، کاتێك شتێك دادەبەزی، بانگی هەندێك لەوانەی قورئانیان بۆ دەنووسییەوە، دەکرد و دەیفەرموو: ئەمە بخەنە ئەو سورەتەی کە باسی فلانە شت دەکات، کاتێك ئایەتێك دادەبەزی، دەیفەرموو: ئەم ئایەتە بخەنە ئەو سورەتەی کە باسی فلانە شت دەکات، کاتێك چەند ئایەتێك دادەبەزی، دەیفەرموو: بیخەنە ئەو سورەتەی کە باسی فلانە شت دەکات).

* زەیدی کوڕی سابت دەڵێت: (كُنْتُ أَكْتُبُ الوَحْيَ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ وَهُوَ يُمْلي عَلَيَّ، فَإذا فَرَغْتُ، قَالَ: اقْرَأْهُ، فَأَقْرَأُهُ، فَإِنْ كَانَ فِيهِ سَقَطٌ أَقَامَهُ)[٣٧]. واتە: (قورئانم

---

[٣٥] مسلم: الزهد والرقائق (٣٠٠٤)، الترمذي: العلم (٢٦٦٥)، الدارمي: المقدمة (٤٥٠).

[٣٦] الترمذي: تفسير القرآن (٣٠٨٦)، أبو داود: الصلاة (٧٨٦)، أحمد (٥٧/١).

[٣٧] الطبراني في الأوسط، ٢/ ٥٤٤.

بۆ پێغەمبەر دەنووسییەوە و ئەویش پێی دەوتمەوە، کە تەواو دەبووم لە نووسینەوە، دەیفەرموو: بۆم بخوێنەوە، ئەگەر هەڵەیەکی تێدابووایە، بۆی ڕاستدەکردمەوە).

* لە چیرۆکی موسڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتتابدا هاتووە: (كَانُوا يَقْرَؤُونَ فِي بَيْتِ فَاطِمَةَ بِنْتِ الخَطَّابِ، وَكان خَبَّابُ بنُ الأَرَتِ يُقْرِئُهُم القُرآنَ في صَحيفَةٍ)[٣٨]. واتە: (لە ماڵی فاتمەی کچی خەتتابدا قورئانیان دەخوێندەوە. خەبابی کوڕی ئەرەت قورئانی بۆ دەخوێندنەوە کە لە پەڕەیەکدا نووسرابووەوە). دیارە ئەم ڕووداوەش لە مەککە، پێش کۆچکردن ڕوویداوە. کەواتە هەر لە سەرەتای دابەزینی قورئانەوە مۆڵەت دراوە بە موسڵمانان کە قورئان بنووسنەوە.

لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ قورئان هەمووی لە دووتوێی پەرتووکێکدا کۆنەکرابووەوە، بەڵکو پەرتوبڵاو بوو. لە هەمان کاتدا هەندێك لە هاوەڵان هەندێك لە قورئانیان لای خۆیان نووسیبووەوە. مەککی ئەبوتالب دەڵێت: (هەندێك لە هاوەڵان موصحەف تایبەتی خۆیان هەبووە، هەندێکیان لە لێواری پەڕەکانی چەند وشەیەکی تەفسیریان لەسەر دەنووسی)[٣٩].

حارسی موحاسبی لە کتێبی (فهم السنن)دا دەڵێت: نووسینەوەی قورئان شتێکی داهێنراو نەبوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی فەرمانی دەکرد بە نووسینەوەی، بەڵام ئەو سەردەمە پەرتوبڵاو بووە. لەسەر پارچە پێست و ئێسکی باڵی ئاژەڵان و گەڵای دارخورما...تا دوایی.

---

[٣٨] البزار ٢٧٩.

[٣٩] الإبانة عن معاني القراءات، أبي محمد مكي بن أبي طالب القيسي القيرواني ثمّ الأندلسي القرطبى، تحقيق: فرغلي سيد عرباوي، لبنان، ط١، ٢٠١١: ٣١.

* زەیدی کوڕی سابت دەڵێت: (قُبض النَّبيُ ﷺ وَلَمْ يَكُنْ القُرآنُ جُمِعَ في شَيءٍ)[٤٠]. واتە: (پێغەمبەر وەفاتی کرد و قورئان هێشتا لە شتێکی تایبەتدا کۆنەکرابووەوە).

هۆی کۆنەکردنەوەی لە دووتوێی پەرتووکێکدا لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ، دەگەڕێتەوە بۆ:

**یەکەم:** نەبوونی ترسی دروستبوونی جیاوازی لە نێوان هاوەڵان لە قورئاندا، ئەویش لەبەر بوونی پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا و زۆر هاوەڵ قورئانیان لەبەر بووە.

زەرقانی دەڵێت: موسڵمانان لەسەر خەیر بوون، قورئانخوێنان زۆربوون، تا ئەو کاتەش ئیسلام زۆر بڵاونەبووبووەوە، بواری فیتنەش نەبوو، زیاتریش پشت دەبەسترا بە لەبەرکردن نەك نووسین، پێداویستیی نووسین زۆر ئاسان دەستنەدەکەوت[٤١]..

**دووەم:** لەترسی ئەوەی نەوەك لە ژیانی پێغەمبەرەدا ﷺ ئایەت هەبێت نەسخ بکرێت. وەك لە کتێبی (الإتقان)دا هاتووە کە خەتتابی دەڵێت: (کۆنەکردنەوەی قورئان لەناو پەرتووکێك لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، لەبەر ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ چاوەڕێی ئەوەی کردووە کە لەوانەیە ئایەت هەبێت نەسخبکرێتەوە —حوکمەکەی یان خوێندنەوەکەی— جا کاتێك دابەزینی قورئان وەستا بە کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ، خوای گەورە ئیلهامی جێنشینەکانی پێغەمبەری کرد کە ئەو کارە بکەن تا وەعدی خوای گەورە بێتە جێ، کە پەیمانی داوە قورئانەکەی بپارێزێت[٤٢].

زەرقانی دوو خاڵی تریش زیاد دەکات:

---

[٤٠] الإتقان، ١/ ١٦٤.

[٤١] مناهل العرفان، ١/ ١٧٩.

[٤٢] تأريخ القرآن، الكردي، ص٤٠.

- قورئان بە یەك جار نەهاتەخوارەوە، بەڵكو بەشبەش لە ماوەی زیاد لە بیستساڵدا هاتە خوارەوە.

- ڕیزبەندیی ئایەت و سورەتەكان بەپێی هاتنەخوارەوە نەبوو، بەڵكو بەپێی هۆكارەكانی دابەزین (أسباب النزول) بووە[٤٣].

زەركەشی دەڵێت: كە قورئان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە دووتوێی كتێبێكدا نەنووسراوەتەوە، لەبەر ئەوە بووە، تا ناچار نەبن زووزوو بیگۆڕن، لەبەر ئەوە دواكەوت تا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد[٤٤]. دیارە ڕیزبەندیی ئایەتەكان بەپێی هاتنەخوارەوە نەبووە، بەڵكو بەپێی ئەوە بووە كە لە (اللوح المحفوظ)دا هەیە. ئەگەر بەدوای یەكدا بەپێی هاتنەخوارەوە بنووسرایە، ئایەت و سوورەتەكان تێكەڵ دەبوون. بۆیە دواخرا و ماوەی نێوان دوائایەت كە دابەزیوە و كۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ، زۆر كورت بووە، نەتوانراوە قورئان لە دووتوێی پەرتووكێكدا بنووسرێت[٤٥].

ڕووخساری نووسینەوەی قورئان لەم قۆناغەدا بریتییە لە:

١- هەموو قورئان نووسراوەتەوە.

٢- بەپێی هەموو قیرائاتەكان نووسراوەتەوە.

٣- لەسەر شتی زۆر سادە نووسراوەتەوە.

٤- ئایەت و سوورەتەكان كە نووسراونەتەوە، بڵاوبوونەتەوە بە ناو هاوەڵان و خێزانەكانی پێغەمبەردا ﷺ.

٥- لە دووتوێی پەرتووكێكدا كۆنەكراوەتەوە.

---

[٤٣] مناهل العرفان، ١/ ١٧٩.

[٤٤] البرهان في علوم القرآن، ١/ ٢٣٥.

[٤٥] جمع القرآن الكريم حفظاً وكتابةً، أ. د. علي بن سليمان العبيد، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، ٢٨.

٦- جگە لەوانەی بە ئامادەبوونی پێغەمبەر ﷺ خۆی نووسراونەتەوە، هەندێ لە هاوەڵان چەند ئایەت یان سوورەتیان بۆ خۆیان نووسیوەتەوە و هەندێکیان تێبینیی خۆیانیان لەسەر نووسیوەتەوە.

## تەوەرەی دووەم: کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی ئەبوبەکردا

دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، قورئانخوێنەکان بەردەوامبوون لەسەر فێرکردنی ئەوانەی دوای خۆیان. هەندێك لە هاوەڵان دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ توانیویانە هەموو قورئان لەبەربکەن. پشتبەستن لە ڕیوایەتکردنی قورئاندا هەر لەسەر ئەوە بووە کە لەناو سنگی قورئانخوێناندا پارێزراوبووە و هەروەها هەندێك لەو نووسراوانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نووسرابوونەوە، بەڵام دوای کوژرانی نزیکی (٧٠) کەس لە قورئانخوێنەکان (الحفاظ) لە شەڕی یەمامەدا لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا، عومەری کوڕی خەتتاب داوا دەکات لە ئەبوبەکر کە فەرمان بدات بە کۆکردنەوەی قورئان لە دووتوێی پەرتووکێکدا و قایم بکرێت و بپارێزرێت لە ونبوون، نەکا قورئانخوێنی زیاتر بکوژرێن و بڕۆن، کە سەرچاوەی پارێزگاریکردنی ئەم قورئانەن. دوای گفتوگۆیەکی زۆر، پاشان ئەبوبەکر قەناعەتیهێنا و داوایان لە زەیدی کوڕی سابت کرد کە هەستێت بەو کارە.

* حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ السَّبَّاقِ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ الانْصَارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَكَانَ مِمَّنْ يَكْتُبُ الْوَحْيَ، قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ، مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ، وَعِنْدَهُ عُمَرُ، فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ الْقَتْلَ قَدْ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِالنَّاسِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ فِي الْمَوَاطِنِ فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنْ الْقُرْآنِ إِلَّا أَنْ تَجْمَعُوهُ، وَإِنِّي لارَى أَنْ تَجْمَعَ الْقُرْآنَ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قُلْتُ لِعُمَرَ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِيهِ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ لِذَلِكَ صَدْرِي، وَرَأَيْتُ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ:

وَعُمَرُ عِنْدَهُ جَالِسٌ لَا يَتَكَلَّمُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ وَلَا نَتَّهِمُكَ، كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَتَبَّعْ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ.. فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفَنِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنْ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلَانِ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ النَّبِيُّ ﷺ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ أَزَلْ أُرَاجِعُهُ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ اللَّهُ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقُمْتُ فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنْ الرِّقَاعِ وَالأَكْتَافِ وَالْعُسُبِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ، حَتَّى وَجَدْتُ مِنْ سُورَةِ التَّوْبَةِ آيَتَيْنِ مَعَ خُزَيْمَةَ الانْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهُمَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهِ –لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ.. إِلَى آخِرِهِمَا– وَكَانَتْ الصُّحُفُ الَّتِي جُمِعَ فِيهَا الْقُرْآنُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ[٤٦].. واته: (زەید دەڵێت: لە دوای کوژراوەکانی شەڕی یەمامە، ئەبوبەکر ناردی بەشوێنمدا و عومەری لابوو، وتی: عومەر هاتووە بۆ لام و وتوویەتی: کوشتن زۆر بووە لە شەڕی یەمامەداو لەوە دەترسم قورئانخوێنەکان لە شوێنەکانی تریش بکوژرێن و ببێتە هۆی ونبوونی قورئان، پێم باشە قورئان کۆبکرێتەوە. ئەبوبەکر پێی وتووە: چۆن شتێك بکەم کە پێغەمبەر ﷺ نەیکردووە؟ عومەر وتوویەتی: سوێند بە خوا ئەوە کارێکی خەیرە. عومەر وازی لێ نەهێنام و چەند جار هاتووە بۆ لام تا خوای گەورە دڵی خستمە سەر و منیش ڕای عومەرم هەیە. زەید دەڵێت: عومەریش لای ئەبوبەکر دانیشتبوو و قسەی نەدەکرد. ئەبوبەکر وتی: تۆ پیاوێکی گەنج و ژیریت و هیچ گومانێکمان لەسەرت نییە، کاتی خۆیشی قورئانت بۆ پێغەمبەر نووسیوەتەوە. بەدوای قورئانە نووسراوەکاندا بگەڕێ و کۆیانبکەرەوە. زەید وتی: سوێند بە خوا ئەگەر داوای گواستنەوەی شاخێکی لێ بکردمایە لەوە لەلام قورستر نەبوو کە فەرمانی پێکردبووم قورئان کۆبکەمەوە. وتم: چۆن شتێك دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ نەیکردووە؟ ئەبوبەکر وتی: سوێند بە خوا ئەوە کارێکی خەیرە. جا هەر

[٤٦] البخاري: ٤٣١١. هەروەها: أحمد: ٧٢ و ٢٠٦٥٧.

دەچوومەوە بۆ لای —بۆ بیانو هێنانەوە— تا خوای گەورە ئەوەی خستبووە دڵی ئەبوبەکر و عومەرەوە، خستیە دڵمەوە و هەستام بە گەڕان و ئەو پارچە قورئانانەی کە نووسرابوونەوە لەسەر پێستەی خۆشکراو و دەفەی شان و گەڵای پانی دارخورما و ئەوەی کە لە سنگی پیاواندا لەبەریانکردبوو، کۆمکردنەوە، تا ئەوەبوو دوو ئایەتم لە سورەتی (التوبة) لای خوزەیمەی ئەنصاری دیتەوە کە لەلای کەسی تر نەبوو (لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ..) تا کۆتایی ئایەتەکە. جا ئەو پەڕانەی کە نووسیمانەوە، لای ئەبوبەکر مانەوە تا وەفاتی کرد، پاشان لای عەمەر بوو تا وەفاتی کرد، پاشان لای حەفصەی کچی عومەر مانەوە).

زەرقانی دەڵێت: کاتێك دابەزینی قورئان تەواو بوو و جێگیر بوو، بە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بواری نەسخ نەما و ڕیزبەندیی جێگیر بوو، زەڕورەتی نووسینەوەی هاتە کایەوە لە دووتوێی کتێبێك یان زیاتر. خوای گەورە خەلیفەکانی موەفەق کرد بۆ ئەو کارە[٤٧].

کۆکردنەوەی قورئان لە دووتوێی پەرتووکێکدا، لە دوای شەڕی یەمامەوە بوو —کە ساڵی ١٢ی کۆچی بوو— و ماوەی نزیکی ساڵێکی خایاند[٤٨].

بۆ چەسپاندن و وەرگرتنی ئایەت و سورەتەکان، دەبوایە لەسەر هەموو پارچەیەك دوو شایەت، شایەتییان بدایە لە سەری. ئیبن ئەبوداوود لە ڕێگەی هیشامی کوڕی عوروەوە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە،: (أَنَّ أبابَكْرٍ قَالَ لِعُمَرَ وَزَيدٍ: اقْعُدُوا عَلى بابِ المَسْجِدِ، فَمَنْ جاءَكُمَا بِشَاهِدينِ عَلى شَيءٍ مِنْ كِتابِ اللهِ فَاكْتُباهُ)[٤٩].
واتە: ئەبوبەکر بە عومەر و زەیدی وت: لای دەرگای مزگەوت دانیشن —واتە بیکەن بە شوێنی کۆبوونەوەکانتان— هەرکەس هات و دوو شایەتی هەبوو لەسەر ئەوەی

[٤٧] مناهل العرفان، ١/ ١٧٩.

[٤٨] تأريخ القرآن، الكردي، ٤٤.

[٤٩] الإتقان، ١٥٦: لة (فتح الباري، ٩/ ١٤): ئیبن حەجەر دەڵێت: لەگەڵ ئەوەی فەرمودەیەکی (مقطوع)ە بەڵام ڕاوییەکانی خاوەن متمانەن.

کە قورئانە، لێی وەرگرن و بینووسن. جا عومەر ڕایگەیاند: (مَنْ كَانَ تَلَقَى مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ شَيئاً مِن القرآنِ فَلْيَأْتنا بِهِ، وَكَانُوا كَتَبُوا ذلك في الصُحُفِ وَالالْواحِ وَالعُسُبِ، وَكانَ لا يَقْبَلُ مِنْ أَحَدٍ شَيئاً حَتى يَشْهَدَ شَهيدانِ)[50]. واتە: (هەر کەسێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ شتێکی لە قورئان وەرگرتووە با بۆمان بهێنێت. ئەوانیش ئەو ئایەتانەیان لەسەر پەڕە و پارچە تەختە و گەڵای پانی دارخورما نووسیبووەوە. جا هیچیان لەو نووسراوانە وەرنەدەگرت تا دوو شایەت، شایەتییان نەدایە لەسەری).

مەبەستیش لە شایەتی، شایەتیدان نییە لەسەر ئەوەی کە نووسراوەکە قورئان بێت یان نا، چونکە بەڵگە لەسەر قورئانییەتی هەر نووسراوێك، چەندین هاوەڵ شایەت بوون لەسەری، چونکە لەبەریان بووە (واتە گەیشتووەتە ڕاددەی تەواتور[51])، بەڵکو شایەتییەکە بۆ ئەوە بووە کە شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی کە نووسراوەکە لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ نووسراوە و بە ئاگاداریی ئەو بووە. چونکە هاوەڵەکان خۆیان چەندین پەڕەیان هەبووە (یان موصحەف) کە قورئانیان لەسەر فۆتۆکۆپی کردووە –وەك باسمان کرد– و لە ماڵەکانی خۆیاندا پاراستبوویان.

* ئەبو شامە ئەوە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: شایەتی لەسەر ئەصلی قورئان نەبووە، چونکە ئەوە ئاشکرا بووە لایان، بەڵکو شایەتی لەسەر ئەو پارچە پێست و نووسراوانە بووە کە هێنابوویان و داوایان لێ کراوە بیسەلمێنن کە لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ نووسراونەتەوە و بە ئاگاداریی ئەو بووە. بەپێی ئەو لەفزانە بووە

---

[50] أخرجه ابن أبي داود في كتاب المصاحف ص١٠.

[51] المتواتر: عبارة عن الخبر الذي ينقله من يحصل العلم بصدقه ضرورة ولابد في إسناده من استمرار هذا الشرط في رواته من أوله الى منتهاه: التقييد والإيضاح شرح مقدمة ابن صلاح للحافظ زين الدين عبدالرحيم العراقي. لە کتێبی: علوم الحديث، د. عبدالكريم زيدان ود. عبدالقهّار داود عبدالله، مطبعة عصام، بغداد، ط٢، ١٩٩٠م.

کە گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ خۆی بووە. چونکە ئەگەر نووسراوەکان لە (حفظ)ی خۆیانەوە بووبێت، زەید پێویستی پێی نەبووە[٥٢].

* سەخخاوی لە (جمال القراء)دا دەڵێت: مەبەست لەو دوو شایەتە لەسەر ئەوەیە کە ئەو نووسراوە لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ نووسراوەتەوە[٥٣].

* ئیبن ئەبو داوود لە (المصاحف)دا بە سەنەدێکی (حسن) لە عەبد خەیرەوە دەگێڕێتەوە: لە عەلیی کوڕی ئەبو تالیبەوە، کە وتوویەتی: (أعظمُ النَّاسِ في المَصاحِفِ أجْراً أبو بَكرٍ، رَحْمَةُ اللهِ على أبي بَكرٍ، هُو أَوَّلُ مَنْ جَمَعَ كِتابَ اللهِ)[٥٤]. واتە: (گەورەترین پاداشت شایەنی ئەبوبەکرە لە پرسی کۆکردنەوەی قورئاندا، خوا لێی خۆشبێت). ئەمەش پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیە کە باسی جیاوازیی نێوان عەلی و هاوەڵەکان دەکەن لە پرسی کۆکردنەوەی قورئان و کەمکردن و زیادکردن تێیدا. هەر لەم باسەدا ڕووداوێك لە عەلییەوە دەگێڕنەوە کە گوایە ئەو یەکەم کەس بووبێت هەوڵی کۆکردنەوەی قورئانی دابێت: ئیبن ئەبی داوود لە کتێبی (المصاحف)دا لە ئیبن سیرینەوە دەگێڕێتەوە، کە عەلی وتوویەتی: (لَمَّا مَاتَ رَسولُ اللهِ ﷺ آلَيتُ ألاّ آخُذَ عَلَيَّ رِدائي إلاّ لِصَلاةِ جُمْعَةٍ حتى أجْمَعَ القُرآنَ. فَجَمَعَهُ). واتە: (دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، بڕیارمدا لە ماڵەوە نەچمە دەرەوە تەنها بۆ نوێژەکان نەبێت، تا هەموو قورئان کۆنەکەمەوە. ڕاوییەکە دەڵێت: کۆیشی کردەوە). ئیبن حەجەر لە (فتح الباري ١٣/٩)دا دەڵێت: ئەم گێڕانەوەیە لاواز (ضعيف)ە، چونکە پچڕان (انقطاع)ی تێدایە، ئەگەر ڕاستیش بێت —لە

---

[٥٢] المرشد الوجيز، ل٥٩- ٦٠. لة كتێبي: جمع القرآن الكريم حفظاً وكتابةً، أ. د. علي بن سليمان العبيد.

[٥٣] مناهل العرفان، ١/ ١٨٢. هەروەها: الإتقان في علوم القرآن، ١٥٦: دەڵێت: لە (فتح الباري)دا هاتووە ٩/ ١٥، هەروەها: المرشد الوجيز، ٥٧.

[٥٤] رواه أبو عبيد في فضائل القرآن ص١٥٥- ١٥٦، وعزاه ابن حجر في الفتح ٩/ ١٢ لابن أبي داود في المصاحف، ثم قال: سنده حسن. وانظر المرشد الوجيز ص٥٤- ٥٥. وەرگیراوە لە: الإتقان، ١٥٤.

حاڵەتێکدا– مەبەستی کۆکردنەوەی لەبەرکردنەکەیەتی (واتە پێداچوونەوەی ئەوەی لەبەرێتی) و ڕیوایەتەکەی عەبد خەیر –پێشتر باسکرا– ڕاستترە و پشت بەو دەبەسترێت.

نووسینەوەی قورئان ئەم جارەیان لەسەر کاغەز بووە: ئیبن شەهاب دەڵێت: (لمّا أُصيبَ المُسلمُونَ باليَمَامَةِ، فَزِعَ أبو بَكْرٍ، وَخَافَ أَنْ يَذْهَبَ مِنَ القُرآنِ طَائِفَةٌ، فَأَقْبَلَ النَّاسُ بِما كانَ مَعَهُمْ وَعِنْدَهُمْ، حتى جُمع عَلى عَهْدِ أَبي بَكْرٍ في الوَرَقِ، فَكانَ أَبو بَكرٍ أولَ مَنْ جَمَعَ القرآنَ في الصُحُف)[٥٥]. واتە: (دوای ئەوەی بەسەر موسڵماناندا هات لە شەڕی یەمامەدا و ئەبوبەکر ترسا لەوەی هەندێك لە قورئان ون بێت، خەڵکی هاتن و ئەوەی نووسیبوویان و لەبەریان بوو، هێنایان. تا لە سەردەمی ئەبوبەکردا هەموو قورئان نووسرایەوە لەسەر پەڕە –کاغەز– و ئەبوبەکر یەکەم کەس بوو کە قورئانی کۆکردەوە لە پەڕەدا).

کەواتە کۆکردنەوەی قورئان لەم سەردەمەدا بۆ پاراستنی ئەو بەڵگەنامانە بووە کە ئەصلەن لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نووسرابوونەوە و کۆکردنەوەیان لە شوێنێکدا.

دیاریکردنی زەیدیش بۆ ئەو کارە، لەبەر ئەوە بووە، چونکە زەید گەنجێکی زیرەك و متمانەپێکراو بووە، پێشتر قورئانی بۆ پێغەمبەر ﷺ نووسیوە[٥٦] و ئامادەی دواپێداچوونەوەی قورئان بووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کە بۆ جبریلی خوێندووەتەوە، کە دوای ئەو جارە ئیتر هیچ ئایەتێك نەسخنەکراوەتەوە لە خوێندنەوەدا.

---

[٥٥] فتح الباري ٩/ ١٦، ولطائف الإشارات ١/ ٥٧: الإتقان: ١٥٧.

[٥٦] لە فەرمودەکەی بوخاریدا: (..إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ وَلَا نَتَّهِمُكَ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ..). هەروەها: أحمد ٥٤: (حَدَّثَنَا أَبُو كَامِلٍ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِ بْنِ السَّبَّاقِ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ يَا زَيْدُ بْنَ ثَابِتٍ أَنْتَ غُلَامٌ شَابٌّ عَاقِلٌ لَا نَتَّهِمُكَ قَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَتَبَّعْ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ).

موحەممەد تاهیر کوردی دەڵێت: لە کتێبی (نهاية القول المفيد)دا هاتووە: زەید خۆی هەموو قورئانی لەبەربووە، باشە بۆ بەدوای نووسراوەکاندا گەڕاوە؟ وەڵام: چونکە ئەوە بۆ تەئکید بووە و تا بزانێت نەوەك شێوەیەکی (قراءة) هەبێت لەو نووسراوانەدا کە ئەم نەیزانێت، با ئەگەر لەبەریشی بووبێت، پێویستە ئەوەی (حافظ)ە هەمیشە سەرچاوەیەکی هەبێت بۆی بگەڕێتەوە، تا زیاتر تەئکید بێت[٥٧].

هەروەها دەڵێت: لە کتێبی (دائرة المعارف الإسلامية)دا نووسراوە: بۆچی دوای مردنی عومەر قورئانە کۆکراوەکە لای حەفصە دانراوە و نەخراوەتە لای خەلیفەی نوێ کە عوسمانە؟ ئێمەش دەڵێین: ئەو قورئانە کە لای حەفصە دانراوە، بە وەسیەتی عومەری باوکی بووە. حەفصەش هەموو قورئانی لەبەربووە، نووسین و خوێندنەوەی زانیوە، خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووە و دایکی موسڵمانانە و کچی عومەری کوڕی خەتتابە کە خەلیفەی موسڵمانانە. هەروەها لە کاتی وەفاتی عومەردا جارێ خەلیفەی تازە دیارینەکرابوو تا قورئانەکەی تەسلیم بکرێت، چونکە کە عومەر مرد، کەسی لە شوێنی خۆی دانەنا، بەڵکو خستیە شوراوە تا موسڵمانان خۆیان خەلیفەی نوێ هەڵبژێرن[٥٨].

ئەو ڕیوایەتەی کە لە عومەرەوە دەیگێڕنەوە، کە وتوویەتی: (لَوْ كانَ ثَلاثَ آياتٍ لَجَعَلْتُهَا سُورةً على حِدَةٍ، فَانظُروا سورةً مِنَ القرآنِ فَضَعُوهَا فِيها. فَوَضَعُوها في آخرِ بَرَاءَة). واتە: (ئەگەر ببوایە بە سێ ئایەت —مەبەستی (لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ.. تا کۆتایی ئایەتەکە)— دەمکرد بە سورەتێکی سەربەخۆ. بزانن لە سورەتێکدا جێی بکەنەوە. جا خستیانە کۆتایی سورەتی (براءة)ەوە): ڕیوایەتێکی لاوازە[٥٩].

---

[٥٧] تأريخ القرآن، ٤٣.

[٥٨] تأريخ القرآن، ٤٢.

[٥٩] أخرجه أحمد في مسنده، ٣/ ٢٤٠، الحديث: ١٧١٥، طبعة الشيخ شعيب وضعّف إسناده: بنوارە ڕای شێخ شوعەیب ئەرنائوت و شێخ ئەحمەد شاکر لە: إتقان البرهان، ١/ ٢٧٥: ويقول شعيب الأرنؤوط:

ڕووخسارەکانی کۆکردنەوەی قورئان لەم قۆناغەدا:

١- نووسینەوەی بە وردترین شێوە بووە، تەنها ئەو ئایەت و سوورەتە نووسراوانە وەرگیراون و تەسبیت کراون کە شایەتیی لەسەر دراوە و گەیشتووەتە ڕاددەی تەواتور.

٢- تەنها ئەو ئایەتانەی تێدا نووسراوە کە خوێندنەوەی (نسخ) نەکراوە.

٣- یەکدەنگی (إجماع)ی هاوەڵانی لەسەر بووە[٦٠].

٤- لە دووتوێی یەك پەرتووکدا نووسراوەتەوە و ڕیزبەندیی ئایەت و سورەتەکانی تێدا ڕەچاو کراوە.

٥- هەر ٧ حەرفەکەی تێدا بووە کە لە دوا پێداچوونەوە لەگەڵ جبریلدا جێگیر بووە[٦١].

بۆمان دەردەکەوێت کە کۆکردنەوەی قورئان لە هەردوو قۆناغی یەکەم و دووەمدا، زۆر پشتدەبەستێت بە توانای لەبەرکردنی هاوەڵەکان — دوای دۆکیۆمێنتکردنی بە نووسراوی- و بەردەوام پێداچوونەوەی لە لایەن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانەوە. پێغەمبەر ﷺ هەموو ساڵێك لە مانگی ڕەمەزاندا موڕاجەعەی قورئانی دەکردەوە لەگەڵ جبریلی ئەمیندا و هەموو قورئانی بۆ دەخوێندەوە و لە دوا ساڵی تەمەنیدا دوو جار ئەو موڕاجەعەیە کرایەوە.

* ئیبن عەبباس دەڵێت: (كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ، وكانَ أَجْوَدَ مَا يَكونُ في رَمَضانَ، حِينَ يَلْقاهُ جِبريلُ، وكانَ يَلْقاهُ في كُلِّ لَيلَةٍ مِنْ رَمَضانَ، فَيُدارِسُهُ القُرآنَ،

---

فهذا الحديث ضعيف الإسناد منكر المتن، وهو أحد الأحاديث التي يلعب بها المستشرقون وعبيدهم، يزعمون أنها تطعن في ثبوت القرآن، ويفترون على أصحاب رسول الله ما يفترون. من: مسند أحمد بن حنبل، تحقيق: شعيب الأرنؤوط وآخرون، ٣/ ٢٤٠- ٢٤١، الحديث (١٧١٥): إتقان البرهان، ١/ ٢٧٦.

[٦٠] مناهل العرفان، ١/ ١٨٢.

[٦١] جمع القرآن حفظاً وكتابة، أ. د. علي بن سليمان العبيد، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، ٢٧.

فَلَرَسولُ اللهِ أَجْوَدُ بِالخَيرِ مِنَ الرِّيحِ المُرسَلَةِ)[٦٢]. واته: (پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس بەخشندەتر بووە، بە تایبەتی لە ڕەمەزاندا کە لەگەڵ جبریل بەیەك دەگەیشتن. هەموو شەوێك بەیەك دەگەیشتن لە ڕەمەزاندا و قورئانی لەگەڵ موراجەعە دەکردەوە..).

* ئەبو هورەیرە دەڵێت: (كَانَ يَعْرِضُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ الْقُرْآنَ كُلَّ عَامٍ مَرَّةً فَعَرَضَ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ..)[٦٣]. واته: (هەموو ساڵێك جبریل جارێك موراجەعەی هەموو قورئانی دەکردەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، بەڵام لەو ساڵەی کە کۆچی دوایی کرد، دوو جار قورئانی لەگەڵ دەورکرایەوە).

## تەوەرەی سێیەم: کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی عوسماندا

دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام بە وڵاتاندا بە شێوەیەکی خێرا، ملیۆنان کەس هاتنە ناو ئایینی نوێوە. قورئانخوێنان بڵاوبوونەوە و موسڵمانانیان فێری قورئان دەکرد. هەر وڵاتە و قورئانیان لەو هاوەڵە قورئانخوێنانەوە وەردەگرت کە بۆیان ڕەوانە کرابوون. هاوەڵانیش قورئانیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ یان لە هاوەڵانەوە وەرگرتبوو، هەریەکە و بەپێی ئەو ڕیوایەتە دەیخوێندەوە کە وەریگرتبوو، ئەوەشی فێری خەڵکی دەکرد، بۆ نموونە:

– خەڵکی وڵاتی شام بە (قراءة)ی ئوبەی قورئانیان دەخوێندەوە.

– خەڵکی عێراق بە (قراءة)ی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود قورئانیان دەخوێندەوە.

---

[٦٢] البخاري: ٦، ومسلم: ٢٣٠٨.

[٦٣] البخاري: ٤٦١٤.

- خەڵكی وڵاتانی تر بە (قراءة)ی ئەبو موسای ئەشعەری قورئانیان دەخوێندەوە[٦٤].

کاتێك قورئانخوێنی شوێنە جیاکان بگەیشتنایە بە یەك -وەك لە فەتحی ئەرمینیادا ڕوویدا- و قورئانیان بخوێندایە بە ئامادەبوونی یەکتر، هەندێك جار دەبووە دەنگەدەنگ و ناکۆکییان لە نێواندا دروستدەبوو، چونکە هەریەکەیان خوێندنەوە (قراءة)کەی خۆی بە ڕاستتر دەزانی لەوی تر. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کەمشارەزاییان لە شێوازەکانی خوێندنەوە (القراءات) کە هەرهەموویان ڕاستن و مامۆستاکانیان (کە ئەو هاوەڵە قورئانخوێنانە بوون کە بە وڵاتاندا بڵاوبووبوونەوە) لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە. لە کاتێکدا هاوەڵان خۆیان ئاشنابوون بە جیاوازیی شێوازی خوێندنەوەکان، دەیانزانی کە قورئان بە ٧ پیت دابەزیوە، وەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕابوویانەوە، کە دەفەرموێت: (إنَّ هذا القرآنَ أُنزِلَ عَلى سَبعَةِ أحرفٍ، فاقْرَأوا ما تيسرَ منهُ)[٦٥]. واتە: (ئەم قورئانە بە حەوت پیت دابەزیوە، ئەوەی پێتان دەکرێت بیخوێننەوە). بۆ بنەبڕکردنی جیاوازی و دووبەرەکی لە خوێندنەوەی قورئاندا و ئاشناکردنی موسڵمانان -کە ئەو کاتە زۆر بووبوون- ئەمە جگە لە زەرورەتی بوونی سەرچاوەیەکی ڕاست و متمانەپێکراو، خەلیفە عوسمان -بە ڕاوێژ و ڕەزامەندیی گەورە هاوەڵان- فەرمانیدا بە نووسینەوەی چەند نوسخەیەك لەو قورئانەی کە لە سەردەمی ئەبوبەکردا کۆکرابووەوە، پاش پێداچوونەوەیەکی کۆتایی، کە ڕەچاوی هەموو شێوازی خوێندنەوەکانی تێدا بکرێت، پاشان ئەم نوسخانە بنێردرێت بۆ شارە سەرەکییەکان و بکرێتە تاکە سەرچاوە بۆ قورئانخوێنان و مامۆستایان،

---

[٦٤] جمع القرآن الكريم حفظاُ وكتابة، ٣٩.

[٦٥] البخاري ومسلم. هەروەها: السراج المنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، السيوطي والألباني، ٢/ ٧٧٠.

سووتاندنی هەر نووسراوێکی تر کە لای خەڵکە، هەر کەسێك بێت، چونکە —وەك باس کرا— هەندێك لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان موصحەڤ خۆیانیان هەبووە و تێبینیی خۆیانیان لەسەر تۆمارکردبوو.

بوخاری لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە: (أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ قَدِمَ عَلَى عُثْمَانَ، وَكَانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّأْمِ فِي فَتْحِ إِرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَأَفْزَعَ حُذَيْفَةَ اخْتِلَافُهُمْ فِي الْقِرَاءَةِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لِعُثْمَانَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَدْرِكْ هَذِهِ الْأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتِلَافَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى. فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ: أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي الْمَصَاحِفِ، ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ. فَأَرْسَلَتْ بِهَا حَفْصَةُ إِلَى عُثْمَانَ. فَأَمَرَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَنَسَخُوهَا فِي الْمَصَاحِفِ.. وَقَالَ عُثْمَانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلَاثَةِ: إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيْءٍ مِنْ الْقُرْآنِ، فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ فَإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ، فَفَعَلُوا. حَتَّى إِذَا نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ، رَدَّ عُثْمَانُ الصُّحُفَ إِلَى حَفْصَةَ، وَأَرْسَلَ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِمَّا نَسَخُوا، وَأَمَرَ بِمَا سِوَاهُ مِنْ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ أَوْ مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَقَ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ سَمِعَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ قَالَ: فَقَدْتُ آيَةً مِنْ الْأَحْزَابِ حِينَ نَسَخْنَا الْمُصْحَفَ، قَدْ كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهَا، فَالْتَمَسْنَاهَا، فَوَجَدْنَاهَا مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ الْأَنْصَارِيِّ (مِنْ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ..) فَأَلْحَقْنَاهَا فِي سُورَتِهَا فِي الْمُصْحَفِ)[٦٦]. واتە: (حوزەیفەی کوڕی یەمان، کە لەگەڵ خەڵکی شامدا چووبوو بۆ فەتحی ئەرمینیا و ئازەربەیجان لەگەڵ خەڵکی عێراقدا، بە پەلە گەیشتە لای عوسمان و ئەوەی بینیبوو لە جیاوازیی سەربازەکان لە قورئانخوێندنەوەدا، کاری تێکردبوو، بە عوسمانی وت: ئەی ئەمیری موسڵمانان، فریای ئەم ئوممەتە بکەوە تا وەکو جولەکە و گاوران جیاوازییان تێنەکەوتووە لە کتێبەکەیاندا. ئینجا عوسمان ناردی بۆ لای حەفصە و

[٦٦] البخاري ٤٦٠٤، الترمذي ٣٠٢٩.

داوای لێکرد ئەو پەڕانەی قورئانیان لەسەر نووسراوە و لایەتی، بۆی بنێرێت، تا لەسەری بگرنەوە لە چەند موصحەفێکدا و پاشان بۆی دەگێڕنەوە. ئەوەبوو حەفصە قورئانەکەی نارد بۆ عوسمان و ئەویش فەرمانیدا بە زەیدی کوڕی سابت و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی عاص و عەبدولڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام، کە بینووسنەوە لە چەند موصحەفێکدا. هەروەها عوسمان بە سێ نەفەرە قورەیشییەکەی وت: گەر جیاوازییەکتان هاتە پێش لە قورئاندا لەگەڵ زەیدی کوڕی سابت، ئەوا بە زمان (لەهجە)ی قورەیش بینووسنەوە، چونکە قورئان بە زمانی ئەوان دابەزیوە. ئەوانیش کارەکەیان ئەنجام دا و چەند موصحەفێکیان لێ گرتەوە. عوسمان پەڕەکانی گەڕانەوە بۆ حەفصە و هەر یەك لەو موصحەفە نووسراوانەی نارد بۆ ناوچەیەك و فەرمانی دا بە سووتاندنی هەر پەڕەیەك یان موصحەفێکی تر کە هەبووە. ئیبن شەهاب –ئەوەی لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە– دەڵێت: خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابت پێی وتم: لە زەیدی کوڕی سابتی بیستووە وتوویەتی: کە موصحەفەکەمان دەنووسییەوە ئایەتێکم لە سورەتی (أحزاب) تێدا نەبینییەوە کە لە پێغەمبەرم بیستبوو و دەیخوێندەوە، بە دوایدا گەڕاین، لای خوزەیمەی کوڕی سابتی ئەنساری دۆزیمانەوە، ئایەتەکەش ئەوەیە (مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ) جا خستمانەوە سورەتەکەی خۆی لە موصحەفەکەدا).

زەرقانی دەڵێت: جیاوازی لە شێوازی خوێندنەوەی قورئاندا، بووە هۆی کردنەوەی دەرگای ناکۆکی و دووبەرەکی، نزیك بوو لەوەی کە خەریکبوو لە نێوان هاوەڵاندا دروست بێت پێش ئەوەی بزانن کە قورئان لەسەر حەوت پیت دابەزیوە، بەڵام جیاوازییەکە ئەم جارە زۆرتر بوو. هەروەها لەبەر نەبوونی خودی پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا، تا بگەڕێنەوە بۆ لای و هەموو لایەك ڕازی بێت بە حوکمەکەی. کارەکە توندتربوو، تا وای لێهات هەندێك هەندێکی کافر کرد، نزیك بوو فیتنەیەکی گەورە لەسەر زەویدا بخولقێت. ئەم زیادەڕەوییە بەوەوە نەوەستا، بەڵکو

خەریکبوو گڕەکە هەموو وڵاتانی ئیسلام بگرێتەوە، تەنانەت حیجاز و مەدینەش، هەمووی گرتبووەوە بە گەورە و بچووکەوە. ئیبن ئەبی داوود لە کتێبی (المصاحف)دا، لە ڕێگەی ئەبو قەللابەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: لە کاتی خیلافەتی عوسماندا، هەر مامۆستایەی ئەو شێوازی خوێندنەوەی کە دەیزانی، فێری خوار خۆی دەکرد، ئەوی تریش بە هەمان شێوە، تا وای لێهات قوتابییە گەنجەکان بە یەك دەگەیشتن، جیاوازی دەکەوتە نێوانیانەوە، هەتا وای لێدەهات جیاوازییەکە دەگەیشتە مامۆستاکانیان، تا ڕادەی ئەوەی کە هەندێکیان هەندێکیانی کافر دەکرد. ئەمە گەیشتەوە عوسمان[٦٧].

کۆکردنەوەی قورئان لەم قۆناغەدا کارێکی تاکڕەویی عوسمان نەبوو، بەڵکو ڕەزامەندیی گەورەهاوەڵانی لەسەر بووە، نەك وەك ئەوەی کە هەندێك بڵاویدەکەنەوە. ئەبوبەکری ئەنباری لە سوەیدەوە، لە غەفلەوە، دەگێڕێتەوە وتوویەتی: (سَمِعْتُ عَلِيَّ بنَ أبي طالبٍ –كرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ– يَقولُ: اتَّقُوا اللهَ وَإيّاكُمْ وَالغُلوَّ في عُثمانَ، وَقَولَكُمْ: حُرّاقُ المَصاحِفِ، فَوَاللهِ مَاحَرَقَها إلاّ عَنْ مَلَإٍ مِنّا أَصْحابِ رَسولِ اللهِ). واتە: (گوێم لە عەلیی کوڕی ئەبو تالیب بووە، دەیوت: خەڵکینە لە خوا بترسن و زیادەڕەوی مەکەن لە عوسماندا، پێی مەڵێن قورئانی سووتاندووە، سوێند بە خوا ئەو کارەی کردووە بە ئامادەبوونی گەورەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ). عومەری کوڕی سەعید دەڵێت: (قَال عَلِّيُ بنُ أبي طالِبٍ –رَضيَ اللهُ عَنْهُ–: لَوْ كُنْتُ الوَالِيَ وَقْتَ عُثْمَانَ، لَفَعَلْتُ في المصَاحِفِ مِثْلَ الذي فَعَلَ عُثمانُ). واتە: (عەلی وتوویەتی: ئەگەر والی بوومایە لە کاتی عوسماندا، منیش هەر ئەوەم لە موصحەفە زیادەکان دەکرد کە عوسمان کردی)[٦٨].

---

[٦٧] مناهل العرفان، ١/ ١٨٤.

[٦٨] مناهل العرفان، ١/ ١٨٨.

زەرقانی دەڵێت: لەفزێك کە شێوازی خوێندنەوە تێیدا جیاوازنەبوایە، بە یەك شێوە دەیاننووسی، بەڵام ئەوەی کە شێوازی خوێندنەوە تێیدا جیاوازە، ئەگەر بکرایە بە شێوەیەك دەیاننوسی کە هەموو شێوازەکان لە خۆی بگرێت، ئەگینا لە موصحەفێکدا بە شێوەیەك دەیاننوسی کە لەگەڵ یەك شێوازی خوێندنەوە بگونجێت و لە موصحەفێکی تردا بە شێوەیەکی تر کە لەگەڵ شێوازێکی تری خوێندنەوەدا بگونجێت، بەڵام نەدەچوون لە هەمان موصحەفدا بە هەردوو شێوە بینووسنەوە، ترسی ئەوەیان هەبوو وا بزانرێت کە ئەو لەفزە دووبارەبووەتەوە بە دوو شێواز لە یەك (قراءة)دا، خۆیشی وا نییە[٦٩].

عوسمان زۆر تاوانبار دەکرێت بە زیادکردن، یان کەمکردن، یان گۆڕینی هەندێك ئایەت لە کاتی کۆکردنەوەی قورئاندا، یان دەمارگیریی کردبێت بەوەی وتوویەتی بە لەهجەی قورەیش بینووسنەوە، یان دەستکاریی خەتی نووسینەوەکەی کردبێت. بەڵام دوای خوێندنەوەی ئەم ڕیوایەتانە، دەردەکەوێت کە عوسمان و –ئەوانەشی کە لەگەڵی بوون– زۆر بە ئەمانەتەوە قورئانیان کۆکردووەتەوە:

* عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بە عوسمانی وتووە: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا.. قَالَ: قَدْ نَسَخَتْهَا الْآيَةُ الْأُخْرَى، فَلِمَ تَكْتُبُهَا أَوْ تَدَعُهَا؟ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي لَا أُغَيِّرُ شَيْئًا مِنْهُ مِنْ مَكَانِهِ[٧٠]). واتە: (ئایەتی (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا...) ئایەتەکەی دوای خۆی نەسخی کردووەتەوە، بۆ دەینووسیت لە موصحەفەکەتدا؟ وتی: هیچ شتێك لە شوێنی خۆی ناگۆڕم).

* عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بە عوسمانی وتووە: (مَا حَمَلَكُمْ أَنْ عَمَدْتُمْ إِلَى الْأَنْفَالِ وَهِيَ مِنَ الْمَثَانِي، وَإِلَى بَرَاءَةٌ وَهِيَ مِنْ الْمِئِينَ، فَقَرَنْتُمْ بَيْنَهُمَا، وَلَمْ تَكْتُبُوا بَيْنَهُمَا

[٦٩] مناهل العرفان، ١/ ١٨٦.

[٧٠] البخاري ٤١٦٦.

سَطْرَ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، وَوَضَعْتُمُوهَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ. مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ؟ فَقَالَ عُثْمَانُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِمَّا يَأْتِي عَلَيْهِ الزَّمَانُ وَهُوَ تَنْزِلُ عَلَيْهِ السُّوَرُ ذَوَاتُ الْعَدَدِ، فَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الشَّيْءُ دَعَا بَعْضَ مَنْ كَانَ يَكْتُبُ، فَيَقُولُ: ضَعُوا هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا.. وَإِذَا نَزَلَتْ عَلَيْهِ الْآيَةَ، فَيَقُولُ: ضَعُوا هَذِهِ الْآيَةَ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا.. وَكَانَتْ الأَنْفَالُ مِنْ أَوَائِلِ مَا أُنْزِلَتْ بِالْمَدِينَةِ، وَكَانَتْ بَرَاءَةٌ مِنْ آخِرِ الْقُرْآنِ، وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهَةً بِقِصَّتِهَا، فَظَنَنْتُ أَنَّهَا مِنْهَا فَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَنَا أَنَّهَا مِنْهَا، فَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ قَرَنْتُ بَيْنَهُمَا، وَلَمْ أَكْتُبْ بَيْنَهُمَا سَطْرَ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، فَوَضَعْتُهَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ[٧١]). واته: (بۆچی سورەتی (الأنفال)تان خستووەتە پێش سورەتی (براءة) لە کاتێکدا (براءة) درێژترە و (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)تان لە نێواندا نەنووسیوە؟ عوسمان وتی: کە قورئان لە کاتی جیاجیادا دەهاتە خوارەوە، کاتێك شتێك دادەبەزی، پێغەمبەر ﷺ بانگی هەندێك لەوانەی قورئانیان بۆ دەنووسییەوە، دەکرد و دەیفەرموو: ئەمە بخەنە ئەو سورەتەی کە باسی فڵانە شت دەکات. کاتێك ئایەتێك دادەبەزی دەیفەرموو: ئەم ئایەتە بخەنە ئەو سورەتەی کە باسی فڵانە شت دەکات، کاتێك چەند ئایەتێك دادەبەزی، دەیفەرموو: بیخەنە ئەو سورەتەی کە باسی فڵانە شت دەکات. سورەتی (الأنفال)یش لەو سورەتانە بوو کە هەر زوو لە مەدینە هاتەخوارەوە، سورەتی (براءة)ش لە دواییدا هاتەخوارەوە، چیرۆکەکانیشیان لەیەك دەچوون، وامزانی هەر یەك سورەتن. پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد و بۆی ڕووننەکردینەوە کە یەك سورەت نین. لەبەر ئەوەش لای یەکەوە دامنان و ڕستەی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)م لە نێوانیاندا نەنووسی).

* سەبارەت بەوەی کە عوسمان بە زەید و هاوەڵەکانی وتووە بە لەهجەی قوڕەیش بینووسن: ئەنەس دەگێڕێتەوە: (أَنَّ عُثْمَانَ دَعَا زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ

[٧١] الترمذي ٣٠١١، أحمد ٤٦٧- ٤٦٨، أبو داود ٦٦٨.

الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَنَسَخُوهَا فِي الْمَصَاحِفِ. وَقَالَ عُثْمَانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلَاثَةِ: إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيْءٍ مِنْ الْقُرْآنِ، فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ، فَإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ فَفَعَلُوا ذَلِكَ)[٧٢]. واته: (عوسمان بانگی زەیدی کوڕی سابت و عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی عاس و عەبدولڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشامی کرد و موصحەفیان نووسییەوە، بە سیانەکەی تری وت: ئەگەر جیاوازیتان لە شتێکدا بۆ دروست بوو لە قورئاندا لەگەڵ زەید، ئەوا بە زمانی قورەیش بینووسن، چونکە بە زمانی ئەوان دابەزیوە. ئەوانیش وایان کرد). لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي عَرَبِيَّةٍ مِنْ عَرَبِيَّةِ الْقُرْآنِ فَاكْتُبُوهَا بِلِسَانِ قُرَيْشٍ)[٧٣]. واتە: (ئەگەر جیاوازیتان لە شتێکدا بۆ دروستبوو لە عەرەبییەتی قورئاندا لەگەڵ زەید، ئەوا بە زمانی قورەیش بینووسن). زەرقانی دەڵێت: (ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها بە زمانی قورەیش نووسرابێتەوە —چەند بەڵگەیەك دەهێنێتەوە— لەوانە: قورئان وشەی زۆری تێدایە لە زمانی هۆزەکانی تری عەرەب و لە زمانی قورەیشیشدا نییە، وەکو سیوتی باسی دەکات لە (الاتقان) لە جۆری سیوحەوتەم. هەروەها پێمان نەگەیشتووە بە نەقڵێکی موتەواتیر کە لە کاتی نووسینەوەیدا هیچ کام لە حەوت پیتەکەی قورئانیان وازلێهێنابێت، ئەگەر وایان بکردایە ئەوا بە تەواتور پێمان دەگەیشت، لەبەر ئەوەی ئەمە ڕووداوێکی زۆر گرنگە، کە پێویست دەکات بگوێزرێتەوە بە تەواتور. تەنها ئەوەی پێمان گەیشتووە لە هەندێ ڕێگاوە ئەوەیە کە جیاوازییان تێکەوت لە نووسینی وشەی (التابوت) لە ئایەتی (وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ.. البقرة ٢٤٨) ئایە بە تای درێژ بینووسن یان تای خڕ، ئەوەبوو عوسمان فەرمانی پێدان بە تای درێژ بینووسن،

---

[٧٢] البخاري ٣٢٤٤.

[٧٣] البخاري ٤٦٠٦.

چونکە بەو شێوەیە دەنووسرێت لە زمانی قورەیشدا. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە عوسمان مەبەستی —لە ڕیوایەتەکەدا— جیاوازی بووە لە شێوازی نووسینەوە و ڕەسمدا، نەك لەفز و لەهجە و حەرفدا)[٧٤].

کوردی دەڵێت: (ئەگەر یەکێك بڵێت: باشە چی دەڵێن دەربارەی ئەو هەواڵەی کە ڕیوایەتی دەکەن لە یەحیای کوڕی یەعمور و عەکریمەی خزمەتکاری ئیبن عەبباس لە عوسمانەوە: گوایە کاتێك کە موصحەفەکان نووسرانەوە و پیشانیان دا، هەندێ هەڵەی تێدا بوو —لە نەحو و ئیعرابدا— وتی: (اتركُوها فإنَّ العربَ ستُقيمُها أو ستُعْرِبُها بلِسانها). لەم ڕیوایەتەوە ئەوە دەردەکەوێت کە هەڵە لە نووسینەوەی قورئاندا ڕووی داوە. دەڵێم: ئەم هەواڵە لای ئێمە نابێتە هۆی بەڵگە لە دوو ڕێگەوە: یەکەمیان لەگەڵ بوونی تێکەڵی لە سەنەدەکەیدا و ناڕێکی (اضطراب) لە لەفزەکانیدا، ڕیوایەتێکی (مرسل[٧٥])ە، چونکە یەعمور و عەکریمە هیچیان لە عوسمانیان نەبیستووە و نەشیان بینیوە. هەروەها ڕووکەش (ظاهر)ی لەفزەکانی نەفیی ئەوە دەکەن کە لە عوسمانەوە بێت، لەبەر بوونی تانە (الطعن) لەسەر عوسمان و لەگەڵ بوونی شوێنەوار و بەرزیی عوسمان لە ئیسلامدا و هەوڵدانی زۆری لە گەیاندنی ئامۆژگاری و هەوڵدانی و کارکردنی بۆ چاکسازیی ئوممەت. مومکین نییە شتی وای وتبێت، لە کاتێکدا هەستاوە بە کۆکردنەوەی قورئان لەگەڵ تێکڕای هاوەڵە خاوەن تەقواکان، بۆ نەهێشتنی جیاوازی لە خوێندنەوەی قورئاندا، ئینجا بێت ئەم هەڵانە بەجێ بهێڵێت تێیدا بۆ دوای خۆی، کە گومانی تێدا نییە ئەوانەی کە لەدوای خۆی دێن، لەم شارەزاتر نین و شایەت نەبوون بە سەریەوە. دەردەکەوێت کە ئەمە گوتارێکە نابێت کەس بڕوای پێی

[٧٤] مناهل العرفان، ١ / ٢٨١.

[٧٥] هو ما رواه التابعي كبيراً كان صغيراً عن رسول الله ﷺ. لە کتێبی: معجم مصطلحات الحديث النبوي، أ. د. رشيد عبدالرحمن العبيدي، ديوان الوقف السني، بغداد، ٢٠٠٦م، ١٤٢٧هـ: ٢٨٦.

هەبێت. جا ئەگەر وتیان: باشە دەڵێیت چی ئەگەر ئەم ڕیوایەتە ڕاست بێت و عوسمان وای وتبێت؟ دەڵێم: دەبێت مەبەستی عوسمان هەڵەی خوێندنەوە بێت نەك نووسینەوەی (رسم المصحف)، چونکە ئەگەر تەنها بەپێی نووسراوەکە بخوێنرێتەوە – واتە بەبێ ڕیوایەت– ئەوا مەعنا و لەفزەکان دەگۆڕدرێت، نابینیت (أَوْ لاأذْبَحَنَّهُ)، (لااوْضَعُوا)، (مِنْ نَبَأَئْ المُرْسلَينَ)، (سَأُوْرِيكُم) و (الرِّبَوا) و نموونەکانیان کە ئەلیف و یا و واویان بۆ زیاد کراوە لە نووسینەوەکەیاندا، ئەگەر یەکێك بیانخوێنێتەوە و ئاگاداری ڕاستی (رسم المصحف) نەبێت، ئەوا ئیجاب دەبوو بە نەفی و لەفزی زیادە دەچووە سەر وشەکان، کەواتە هەڵەیان دەکرد لە شتێکدا کە شاردراوە نییە لەوانەی کە گوێیان لە قورئان بووە، لەگەڵ ئەوەی (رسم)ەکە ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە. کەواتە بزانە عوسمان کە لەسەر ئەو بەناو هەڵانە قسەی نەکردووە، مەبەستی پێی خوێندنەوەی بووە، کە عەرەب خۆیان دەزانن بیخوێننەوە، چونکە بە زمانی خۆیان هاتووەتە خوارەوە. والله أعلم)[٧٦].

ڕووخسارەکانی کۆکردنەوەی قورئان لەم قۆناغەدا:

١– تەنها ئەو ڕیوایەتە نووسراوەتەوە کە گەیشتبێتە ڕادەی تەواتور و (آحاد[٧٧])یان وەرنەدەگرت.

٢– پشتگوێخستنی ئەوەی کە خوێندنەوەکەی نەسخبووەتەوە و لە دواپێداچوونەوەدا جێگیر بووە.

٣– ڕیزبەندیی سورەت و ئایەتەکان بەو شێوەیە بووە ئێستا لەبەردەستماندایە.

---

[٧٦] المقنع للإمام الدّاني. لة كتيَبي: تأريخ القرآن، الكردي، ٦٦- ٦٧. هةروةها: إتقان البرهان، ٢/ ١٧٠.

[٧٧] هو ما لم يجمع شروط المتواتر وقد يتفرد به واحد ثقة فيكون (غريباً)، فإذا عزّز باثنين فأكثر، كان (عزيزاً) فإذا استفاض أي: رواه ما لا يقل عن ثلاثة في كل طبقة كان (مشهوراً): شرح الخبة، ٦. له كتێبی: معجم مصطلحات الحديث النبوي، د. رشيد العبيدي، ٣٥.

٤- نووسینەوەی بە شێوەیەك بووە كە هەموو شێوازەكانی خوێندنەوە لەخۆ بگرێ، ئەگەر نەكرایە، ئەوا لە موصحەفە جیاكاندا شێوازە جیاكانیان دەنووسی.

٥- نەبوونی خاڵ و نیشانەكانی (إعراب) تێیدا.

٦- لابردنی هەر وشەیەك كە بۆ تەفسیر و ڕوونكردنەوە لەسەر موصحەفەكان نووسرابوونەوە لەلایەن هاوەڵانەوە[78].

## هەندێك گومان لەسەر كۆكردنەوەی قورئان:

* پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رَحِمَ اللّهُ فلاناً لَقَدْ أَذْكَرَني كَذا وكَذا آيةً كُنْتُ أَسْقَطتُهنَّ - ويُرْوى: أُنسيتُهُنَّ)[79]. واتە: (ڕەحمەت لە فلان، بەڕاستی فلانە ئایەت و فلانە ئایەتی بیرخستمەوە كە لێم ونبووبوون -لە ڕیوایەتێكدا: بیرم چووبوونەوە). كە ئەمە دانپێدانانی موحەممەدە بەوەی هەندێك لە قورئانی وازلێهێناوە و بیریچووەتەوە!

وەلام:

- ئەم ڕووداوە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە قورئانی كەمكردبێتەوە بە ویستی خۆی، چونكە ئەم ئایەتەی كە ئەو هاوەڵە (عوببادی كوڕی بیشر) بیری پێغەمبەری خستووەتەوە، خۆی لە پێغەمبەری بیستووە و پێشتر پێغەمبەر ﷺ فێری كردوون و نووسەرانی نیگا لە پەڕاوەكاندا نووسیویانەتەوە و لەبەریانكردووە.

- وشەی (أسقطتُهنَّ) مەبەست پێی لەبیرچوونەوەیە، وەك لەڕیوایەتەكەی تردا ئاشكرایە (أُنسيتهُنّ).

---

[78] مناهل العرفان، ١/ ١٨٧- ١٨٨.

[79] دەقی فەرموودەكە: (عن هشام بن عروة، عن عائشة -رضي الله عنهما- قالت: سمع النبي ﷺ رجلاً يقرأ في المسجد، فقال يرحمه الله، لقد أذكرني كذا وكذا آية من سورة كذا -البخاري ومسلم- وفي رواية" وقال: أسقطتُهنّ من سورة كذا وكذا). مناهل العرفان، ١/ ١٨٩- ١٩٢.

- بیرچوونەوە ئەوە ناگەیەنێت کە بە ویستی خۆی وازی لێهێنابێت، یان لە قورئانی کەمکردبێتەوە.

* ئایەتی (سَنُقرِئُكَ فَلا تَنْسَى * إِلاَّ مَا شَاءَ اللهُ) -الأعلى ٦- گوایە موحەممەد بە ویستی خۆی هەندێ ئایەتی کەمکردووەتەوە و لەوانەیە کەسیش نەبووبێت بیری بخاتەوە!

وەڵام:

- عوسمان عەبدولعەزیز لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (ئێمە بە سرووش قورئانت بۆ دەنێرین و دەتکەین بە خوێنەری و لەبەری دەکەیت، ئینجا تۆش لەبیرت ناچێتەوە، مەگەر ئەوەی کە خوا ویستبێتی و حەزی کردبێت. ئەمەش موژدەیەکی زۆر گەورە بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ دڵنیا و دڵئارامی کرد لەبارەی ئەم قورئانەوە کە شیرین و خۆشەویست بوو لە دڵی بەفەڕیا و زۆر بە سۆز و پەرۆشەوە خەریکی دەبوو. زۆر خەمی لەبیرچوونەوەی بوو، تا ئەو ڕادەیە نەدەوەستا تا جوبرەئیل لێ بێتەوە و بە پەلە لەگەڵی دەیوت. وەك لە سورەتی (القيامة)دا باسی کرد. تا خوا موژدەی دایە و ئەرکی ئەوەی لە کۆڵ خست و مەترسیی لەبیرچوونی لە دڵ دەرکرد. لە پاش ئەوە موژدەیەکی گەورە بوو بۆ ئوممەتەکەی[٨٠]..

- موحەممەد عەبدە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: گەر خوای گەورە ویستی بووایە کە شتێکت لەبیر بباتەوە، هیچ شتێك بەرگریی نەدەکرد، کەواتە مەبەست پێی نەفیی بیرچوونەوەیە لە بنەڕەتدا[٨١]. کەواتە (استثناء)ەکە لێرەدا (صوري)ە نەك (حقيقي).

---

[٨٠] تەفسیری قورئانی پیرۆز، عثمان عبدالعزیز، ١٠/ ٥٤٢- ٥٤٣.

[٨١] مناهل العرفان، ١/ ١٩٣.

– ئەگەر (استثناء)ەکە حەقیقیش بێت، ئەوە مەبەست پێی ئەو ئایەتانەیە کە خوێندنەوەکەی نەسخ بووەتەوە[82].

* دەڵێن: کۆتایی سورەتی (براءة) ونبووبوو، تەنها لای خوزەیمەی کوڕی سابت دۆزرایەوە، کەواتە کێ ناڵێت چەندین ئایەتی تر وننەبووە و نەشدۆزراوەتە؟ بەتایبەتی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەسەر شتی زۆر سەرەتایی نووسرابوو.

وەڵام: ئەم ئایەتە لای زۆر لە هاوەڵان نووسرابوو، هەروەها هاوەڵان لەبەریانبوو و دەشیانخوێندەوە و دەیانزانی، بە بەڵگەی ئەوەی کە لە فەرموودەکەدا هاتووە: (کە ئایەتێکیان لێ ونبووە و دواتر لای خوزەیمە دۆزییانەوە) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆریان لەبەریان بووە، بەڵام گەڕاون بەدوای نوسخە ئەسڵییەکەدا[83].

---

[82] مناهل العرفان، ١/ ١٩٣.

[83] بۆ زانیاریی زیاتر سەیری مناهل العرفان، ١/ ١٩٦ بکە.

## بەشی سێیەم:
## بانگەشەکردنی زیادکردن و کەمکردن لە قورئاندا

یەکێك لەو گومانانە ئەوەیە کە شێواندن (تحریف) خراوەتە ناو قورئان، دوای مردنی خاوەنەکەی -واتە موحەممەد- بە ڕاستی و دروستی نەپارێزراوە، کەمی و زیادی ڕووی تێکردووە و ئەویش وەك کتێبە ئاسمانییەکانی تر خراپتر نەبێت، حاڵی لەوان باشتر نییە. بۆ بەهێزکردنی بەڵگەکانیان -بە حیسابی خۆیان- دێن چەند دەقێك دەگێڕنەوە لە گەورەهاوەڵان و زانا پێشینەکان، کە گوایە هاوەڵان بە ویست و ئارەزووی خۆیان دەستکاریی قورئانیان کردووە.

لەم بەشەدا باسی ئەو لایەن و گرووپانە دەکەین -بە کورتی- کە ئەم گومانانە دەوروژێنن. پاشان ئەو دەقانەی کە کردوویانە بە بەڵگە لەسەر بانگەشەکانیان، دواتریش گفتوگۆ کردن لەسەر بەڵگەکانیان.

### تەوەرەی یەکەم: ئەو لایەنانەی گۆڕینی قورئان دەورووژێنن:

**١- مەسیحییەکان و جولەکەکان:** بۆ نموونە:

* هەندێ پێگەی ئەنتەرنێت:

- (مسیحیو الشرق لأجل المسیح).

- (الرد علی الاسلام - الحوار المسیحي الاسلامي).

.http://www.answering-islam.org/Arabic/index.html

* کتێبی: (الاسرائیلیات في القرآن) نووسینی: هارب من حد الردة (راضي). لە سایتی الرد علی الاسلام - الحوار المسیحي الاسلامي- بڵاوکراوەتەوە.

* کتێبی (القرآن بین العصمة والتحریف) نووسینی (ئەندرواس).

هەر لە کۆنەوە چەندین کۆمەڵ و کەسایەتیی مەسیحی بە ئاشکرا و بە نهێنی، دژایەتیی ئیسلامیان بە گشتی و قورئانیان بە تایبەتی کردووە. هەندێکیان دەریشیان بڕیوە. بۆ نموونە:

* ولیەم جیفۆرد بالکراف، کە پیاوێکی مژدەدەری مەسیحییە، دەڵێت: هەرکاتێك قورئان و مەککە لە وڵاتی عەرەبەکان نەما، ئەو کاتە مرۆڤی عەرەبی دەتوانێت بە پلەکانی شارستانیدا سەربکەوێت، ئەو شارستانیەتەی کە تەنها موحەممەد و کتێبەکەیەتی لێی دوورخستونەتەوە[٨٤].

* مژدەدەر ولیام مویر دەڵێت: تەنها شمشێرەکەی موحەممەد و قورئانەکەیەتی کە گەورەترین دوژمنی شارستانیەت و ئازادی و ڕاستییەکانن[٨٥].

* گلاد ستۆن، یەکێك بوو لە دیارترین ڕێگەخۆشکەری ئیمپراتۆرییەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، دەڵێت: تا ئەم قورئانە بمێنێت، ئەوروپا ناتوانێت دەستبگرێت بەسەر ڕۆژهەڵاتدا، بەڵکو خۆشی لە ئاسایشدا ناژی[٨٦].

* جۆن تاکلی، مژدەدەری مەسیحی، دەڵێت: پێویستە کتێبەکەی خۆیان –قورئان– بەکاربهێنن لە دژایەتیی ئیسلامدا، چونکە ئەوە باشترین چەکە لە ئیسلامدا دژی ئیسلامەکەیان. دەبێت خەڵکی ببینن کە ڕاستییەکانی قورئان هیچیان تازە نین و شتە نوێکانیشی هیچی ڕاست نین[٨٧].

---

[٨٤] دَمِّرُوا الإسلام وأبيدوا أهله، ٦٣، مكتبة الصحابة، جدة ـ مكتبة التابعين، القاهرة، ١٩٩٤م. لە کتێبی: الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د. عبد الراضي محمد عبد المحسن: ١٢.

[٨٥] الاستشراق، ص١٦٨. لە کتێبی: الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د. عبد الراضي محمد عبد المحسن: ١٢.

[٨٦] الإسلام على مفترق الطرق، ص٤١. لە کتێبی: الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د. عبد الراضي محمد عبد المحسن: ١٣.

[٨٧] التبشير والاستعمار في البلاد الإسلامية، ص٤٠. لە کتێبی: الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د. عبد الراضي محمد عبد المحسن: ١٦.

* لۆرد کرۆمەری نوێنەری باڵای بەریتانی لە میسر، دەڵێت: هاتووم تا سێ شت بسڕمەوە: قورئان و کەعبە و ئەزهەر[88].

* حاکمی فەرەنسی لە کاتی داگیرکردنی جەزائیردا، دەیوت: ئێمە ناتوانین بەسەر جەزائیرییەکاندا سەربکەوین، تا ئەوان قورئان بخوێننەوە و بە عەرەبی قسە بکەن[89].

* حاخامی گەورەی ئیسرائیل، مۆردەخای ئەلیاهو دەڵێت: ئەو کتێبەی کە پێی دەڵێن قورئان، گەورەترین و تاکە دوژمنی ئێمەیە، ئەو دوژمنەیە کە ئامرازە عەسکەرییەکانمان ناتوانن بەرەنگاری ببنەوە[90].

**٢- ڕۆژهەڵاتناسان:**

* ڕیجیس بلاشیر دەڵێت: (بەهەرحاڵ، ئەم نووسینەوەیە – نووسینەوەی قورئان- بە شێوەیەکی جوزئی بووە و هۆی جیاوازی (اختلاف) بووە، جگە لەوەی دواکەوتووانە بووە، بەتایبەتی لەبەر ناجێگیریی ئەو ماددە و ڕێگایانەی کە بەکاریان هێناوە بۆ ئەو نووسینەوەیە)[91].

---

[88] الخنجر المسموم الذي طُعن به المسلمون، ص٢٩. لە کتێبی: الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د. عبد الراضي محمد عبد المحسن.

[89] قادة الغرب يقولون: دمروا الإسلام أبيدوا أهله، ص٣١. لە کتێبی: الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د. عبد الراضي محمد عبد المحسن.

[90] گۆڤاری البيان، ژمارە ١٥٩. لە کتێبی: الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د. عبدالراضي محمد عبد المحسن.

[91] القرآن، نزوله، تدوينه، ترجمته، وتأثيره، ريجيس بلاشير، ترجمة: رضا سعادة، دار الكتاب اللبناني، ط١، ١٩٧٤م، ص٢٩، لە کتێبی: القرآن الكريم والقراءة الحداثية، دراسة تحليلية نقدية لإشكالية النص عند محمد أركون، د. الحسن العبّاقي، دار صفحات للدراسات والنشر، سورية، ط١، ٢٠٠٩م، ١٢٩. (تێبینی: لە قسەکەی ئەرەگۆن دەچێت!).

* گۆڵد زیهەر دەڵێت: موسڵمانان هەڵەیان کردووە لە شوێنی ئایەتی ٧ی سوورەتی (الفتح) کردوویانە بە ئایەتی ٦١ لە سوورەتی (النور) و ئێستا لەو شوێنەی کە تێیدایە، لەقە و پەیوەندیی بە پێش و پاشی خۆیەوە نییە[٩٢].

**٣- هەندێ لایەنی لادەر لە ئیسلام، وەك قادیانییەکان:**

* یەکێك لە پێگەکانی قادیانییەکان[٩٣]:

http://www.thequran.com/VerseTopic

**٤- مۆدێرنیستەکان (الحداثیون)[٩٤]:**

* موحەممەد ئەرەگۆن دەڵێت: کۆکردنەوەی قورئان دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکردووە، لە سەردەمی عوسماندا، واتە دوای ٢٥ساڵ. هاوەڵان لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ ئایەتیان نووسیوەتەوە کە بریتیبووە لە چەند نوسخەیەکی جوزئی[٩٥].

* ئەرەگۆن دەڵێت: (با ئەو ئەرکە هەنوکەییانە بیری خۆمان بێنینەوە کە پێویستە بۆ پێداچوونەوەی دەقی قورئانی، واتە ڕەخنەگرتن لەو چیرۆکە فەرمییەی کە پێی دەوترێت سەر و بۆر کردن بۆ قورئان، ئەمە وامان لێ دەکات بگەڕێینەوە بۆ هەموو بەڵگە مێژووییەکان، لە سەرچاوە شیعییەکان بێت، یان

---

[٩٢] إتقان البرهان ٣٤٩/٢.

[٩٣] بزووتنەوەیەکە ساڵی ١٩٠٠ز لە هیند دروستبووە بە پلانی ئینگلیزەکان، ئامانجی دوورخستنەوەی موسڵمانانە لە ئایینەکەیان بە گشتی و لە جیهاد بە تایبەتی. لە کتێبی: الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، اشراف وتخطيط ومراجعة: د. مانع بن حمّاد الجهني، دار الندوة العالمية للطباعة والنشر والتوزيع، ط٥، ٢٠٠٣م، ١٤٢٤هـ: ١/ ٤١٦.

[٩٤] مەزهەبێکی فیکری ئەدەبی عەلمانییە، لەسەر بنەمای بیرو بۆچوونی ڕۆژئاوایی دروستبووە، وەك مارکسی و فرۆیدی و داروینی، ئامانجی سڕینەوەی سەرچاوەکانی ئایینە. لە کتێبی: الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، ٢/ ٨٦٧.

[٩٥] لە کتێبی: إتقان البرهان، ٣٧١/٢.

خاریجییەکان، یان سوننییەکان. بەو شێوەیە بەرگری دەکەین لە هەموو کەمکردنەوەیەکی لاهوتی بۆ خاتری لایەنێك دژی لایەنێك، دوای ئەمە ڕووبەڕوی پرسی دووبارە خوێندنەوەی ئەو بەڵگانە، بەڵکو هەوڵدان بۆ گەڕان بەدوای بەڵگەی تر گەر بگونجێت، وەك بەڵگەکانی دەریای مردوو کە لەم دواییەدا دۆزرانەوە)[٩٦].

* نەسر ئەبو زەید دەڵێت: (ئەگەر ئەوەش زیادبکەین بۆ ئەو ڕیوایەتە زۆرانەی کە باسی ونبوونی چەند بەشێك لە قورئان دەکەن و بیرچوونەوەیان لە یاد و هۆشی موسڵمانان، بووەتە زیادکردنی توندی ئەو کێشەیەی کە دەبوایە زانا کۆنەکان و شوێنکەوتووانیان بەرەنگاری ببوونایەتەوە)[٩٧].

* کتێبی (ڕیشەی قورئان) نووسینی تەها حەمە حەمەئەمین هەڵەدنی، ساڵی ١٩٩٩. ئەم کتێبە لە پێگەی (الرد على الاسلام – الحوار المسيحي الاسلامي) بڵاوکراوەتەوە، کە پێگەیەکی مەسیحییە!

**٥- شیعە:**

هەندێك لە شیعە پێیان وایە کە قورئان (تحريف) کراوە و هەندێك ئایەتی سڕدراوەتەوە لەلایەن هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە. بۆ نموونە:

- هەندێك لە شیعە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە عوسمان –پێشتریش ئەبوبەکر و عومەر– هەندێ ئایەت و سورەتیان لە قورئان پچڕاندووە. وەك

---

[٩٦] (لنذكر الآن المهام العاجلة التي تتطلبها أية مراجعة نقدية للنص القرآني.. أي نقد القصة الرسمية لتشكيل القرآن، هذا يتطلب منا الرجوع إلى كل الوثائق التاريخية سواءً كانت ذات أصل شيعي أم خارجي أم سني، هكذا نتجنب كل حذف تيولوجي لطرف ضد آخر، بعدها نواجه ليس فقط مسألة إعادة قراءة هذه الوثائق، وإنما أيضاً محاولة البحث عن وثائق أخرى ممكنة الوجود كوثائق البحر الميت التي اكتشفت مؤخراً)، لە كتێبی: تأريخية الفكر العربي الإسلامي، محمد أركون، ترجمة: هاشم صالح، مركز الإنماء القومي والمركز الثقافي العربي، الدار البيضاء- المغرب ، ط٢، ١٩٩٦م: ٢٩٠- ٢٩١.

[٩٧] مفهوم النص، دراسة في علوم القرآن، د. نصر حامد أبو زيد، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء- المغرب، ط٧، ٢٠٠٨: ١٣١.

دەگێڕنەوە لە هیشامی کوڕی سالمەوە لە ئەبو عەبدوڵڵاوە، کە گوایە وتوویەتی: (إنَّ القرآنَ الذي جاءَ به جِبريلُ الى محمدٍ ﷺ كانَ سَبْعَةَ عَشَرَ أَلْفَ آيةٍ)[٩٨]. واتە: (ئەو قورئانەی کە جبریل هێناویەتی بۆ موحەممەد ﷺ، حەڤدە هەزار ئایەت بووە). هەروەها موحەممەدی کوڕی نەصر لێی دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (كانَ في سُورةِ (لَمْ يَكُن) اسمُ سَبعينَ رَجُلاً مِنْ قُرَيشٍ بِأَسْمائِهِمْ وَأَسْماءِ آبَائِهِمْ). واتە: (لە سورەتی (لَمْ يَكُن)دا ناوی حەفتا پیاوی قورەیشی تێدا بووە، بە ناوی خۆیان و باوکیشیانەوە). هەروەها موحەممەدی کوڕی جەهەننەمی هیلالی لە ئەبو عەبدوڵڵاوە دەیگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (إنَّ لَفْظَ (أُمَّةٌ هيَ أَرْبى مِن أُمَّة) في سُورةِ النَّحْلِ لَيسَ كَلامَ اللهِ بَلْ هُوَ مُحَرَّفٌ عَنْ مَوْضِعِهِ، وَحَقيقَةُ المنزَلِ: أَئِمَّةٌ هِيَ أَزْكَى مِنْ أَئِمَّتِكُمْ). واتە: (لەفزی (أُمَّةٌ هيَ أَرْبى مِن أُمَّة) کە لە سورەتی (النحل)دایە، قسەی خودا نییە و تەحریف کراوە، لەڕاستیدا ئایەتەکە بەم شێوەیە دابەزیوە (أئمة هي أزكى من أئمتكم). هەندێکیان وتوویانە لە قورئاندا سورەتێك هەبووە ناوی (الولاية) بووە بە تەواوەتی ونبووە. زۆربەی سورەتی (الأحزاب) دیارنەماوە کە هاوتای سورەتی (الأنعام) بووە و چاکەکان (مناقب)ی (آل البيت)ی لێ دەرهێنراوە. هەروەها ئیدعای ئەوەیان کردووە کە لەفزی (وَيْلَكَ) پێش (لا تَحْزَنْ إنَّ اللهَ مَعَنا) هەبووە، هاوەڵەکان لایان بردووە. هەروەها ڕستەی (عَنْ وِلَايَةِ علّي) لە دوای ئایەتی (وَقِفُوهُم إِنَّهُمْ مَسْؤُلُونَ —الصافات ٢٤) لابراوە، ڕستەی (بعلّيٍ بنِ أَبّي طَالبٍ) لە دوای ئایەتی (وَكَفى اللهُ المؤمنينَ القِتالَ — الأحزاب ٢٥) لابراوە. هەروەها لەفزی (آلَ مُحَمَّدٍ) لە دوای (وَسَيَعلَمُ الذينَ ظَلَمُوا — الشعراء ٢٢٧) لابراوە[٩٩].

---

[٩٨] کافی لە صادقەوە دەگێڕێتەوە: الوشيعة في نقد عقائد الشيعة، موسى جاداللە: لە کتێبی: التفسير والمفسرون، الذهبي، ٢/ ٣٥.

[٩٩] زەرقانی لە (مناهل العرفان ١/ ٢٠٠- ٢٠١)دا هێناویەتی. هەروەها: إعجاز القرآن، الباقلاني، ٢٤.. لە کتێبی: القرآن الكريم والقراءة الحداثية، ١٣٤.

بەڵام شیعە خۆیان کۆکنین لەسەر ئەم مەسەلەیە و هەندێکیان ڕەتیدەکەنەوە، وەك تەبرەسی لە (مجمع البيان)دا دەڵێت: ئیدیعای زیادکردن لە قورئاندا کۆکین لەسەر ئەوەی هەڵەیە. ئەمما ئەگەر بڵێین قورئان نوقستانە، ئەوە لەو موستەحیلترە[١٠٠].

عەلیی کوڕی ئەبو تالیب خۆی کارەکانی ئەبوبەکر و عوسمانی –لە کۆکردنەوەی قورئاندا– بەرزنرخاندووە و کۆکبوونی هاوەڵانی لەسەر باس دەکات. بە عەقڵیش: باشە ئەو مافانەی عەلی و ئالوبەیت –کە گوایە لە قورئاندا باسکراوە– کە زەوت کرابوو، بۆچی عەلی خۆی کە بوو بە خەلیفە ئەو مافانەی نەگەڕاندەوە و ئەو ئایەتانەی چاکنەکرد؟! شیعە خۆیان لە صادقەوە دەگێڕنەوە کە پێیان وتووە: ئایا عەلی لە دیندا بەهێزنەبووە؟ وتی: با. پێیان وت: ئەی چۆن نەیتوانی سەربکەوێت بەسەریاندا؟ چ شتێك بەرگریی کرد؟ صادق وتی: ئەوەی بەرگریی کرد ئایەتێکە. پێیان وت: کام ئایەت؟ وتی: (لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذينَ كَفَرُوا مِنْهُم عَذَاباً أَليماً)، خوای گەورە هەندێك موسڵمانی بە ئەمانەت لە پشتی قەومێکی کافر و دووڕوو دانابوو، نەدەبوایە عەلی باوکەکان بکوژێت تا ئەو سپاردانە نەیەنە دەرەوە، کاتێکیش هاتنەدەرەوە عەلی سەرکەوت بەسەریاندا و کوشتنی[١٠١].

– موحەممەدی کوڕی یەعقوبی کولەینی لە (أصول الكافي)دا لەژێر ناونیشانی (أنه لم يجمع القرآنَ إلاّ الأئمة) دەگێڕێتەوە: (عن جابرٍ قالَ سَمِعْتَ أبا جَعْفَرٍ يَقُولُ: ما ادَّعَى أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ أَنَّهُ جَمَعَ القُرآنَ كُلَّهُ إِلاّ كَذَّابٌ، وَمَا جَمَعَهُ وَما حَفِظَهُ كَمَا أُنْزِّلَ إلاّ عَلِيُ بنُ أبي طالِبٍ، وَالأَئِمَّةُ مِنْ بَعْدِهِ). واتە: (جابیر دەڵێت گوێم لە ئەبو جەعفەر بووە دەیوت: هەر کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کە هەموو قورئانی

[١٠٠] مناهل العرفان، ١/ ٢٠٢.

[١٠١] الوشيعة في نقد عقائد الشيعة، موسى جادالله: لە کتێبی: التفسير والمفسرون، د. محمد حسين الذهبي، دار الكتب الحديثة، ط٢، ١٩٧٦م، ١٣٩٦هـ: ٢/ ٣٦- ٣٧.

کۆکردووەتەوە –لەبەری کردووە یان نووسیویەتیەوە– درۆ دەکات، چونکە تەنها عەلی و پێشەواکانی دوای خۆی ئەوەیان زانیوە)[١٠٢].

– ئەحمەد تەبرەسی لە (الإحتجاج)دا و مەلا حەسەن لە تەفسیری (الصافي)دا دەگێڕنەوە: (عومەر بە زەیدی کوڕی سابتی وتووە: عەلی قورئانی بۆ هێناوین و فەزیحەتی کۆچکردووەکان و پشتیوانانی تێدایە، جا ئێمە بەتەماین قورئان بنووسین و ئەو فەزیحەتانەی لێ لابەرین، زەیدیش ڕەزامەندیی خۆی دەربڕی. ئینجا وتی: باشە ئەگەر من قورئانم نووسییەوە بەو شێوەیەی ئێوە دەتانەوێ و پاشان عەلی قورئانەکەی خۆی دەرخست، ئایا چیتان کردووە تا هەڵنەوەشێتەوە؟ عومەر وتی: چارە چییە؟ زەید وتی: خۆتان چارەی بۆ بدۆزنەوە. عومەر وتی: تەنها چارە ئەوەیە بیکوژین و لە کۆڵمان بێتەوە. ویستی بیکوژێت لەسەر دەستی خالیدی کوڕی وەلید، بەڵام نەیتوانی. کاتێك عومەر بوو بە خەلیفە، داوایان لە عەلی کرد قورئانەکەیان بۆ بهێنێت تا بیگۆڕن، عومەر پێی وت: ئەبولحەسەن بۆ ئەو قورئانەمان بۆ ناهێنیت کە کاتی خۆی هێنات بۆ ئەبوبەکر، تا لەسەری کۆببینەوە؟ عەلی وتی: بە هیچ شێوەیەك نایگەنێ. کاتی خۆیشی بۆیە هێناومە بۆ ئەبوبەکر، تا ببێتە بەڵگە بەسەریەوە و ڕۆژی دوایی نەڵێن: (إنَّا كُنَّا عَن هَذا غَافِلِين)، یان بڵێن: (مَا جِئْتَنَا)، ئەم قورئانە تەنها پاکان و واریسەکانم لە نەوەکانم دەتوانن دەستی لێبدەن. عومەر وتی: کاتی خۆی هەیە دەربکەوێت؟ عەلی وتی: بەڵێ کاتێ کە مەهدی پەیدا دەبێت، دەریدەخات و خەڵکی شوێن دەخات)[١٠٣].

---

[١٠٢] الشيعة في ميزان علماء الأمة، جمع وترتيب: سامي بن سالم السيد علي، الدار العالمية، مصر، الإسكندرية، ط١، ٢٠١٠م، ١٤٣١هـ: ٥٠.

[١٠٣] الإحتجاج للطبرسي، ٢٢٥، هەروەها فصل الخطاب، ٧، لە کتێبی: الشيعة في ميزان علماء الأمة، ٥٠- ٥١.. الصافي في تفسير القرآن الكريم لملا محسن الكاشي١/ ١٠- ١١، لە کتێبی: التفسير والمفسرون، ٢/ ١٥٧- ١٥٨.

– کولەینی لە (الكافي)دا لە جەعفەری صادقەوە دەگێڕێتەوە: (وإنّ عِنْدَنا لمصْحَفَ فاطمةَ عليها السلام، قال: قلتُ: وما مُصْحَفُ فَاطِمَة؟ قال: مُصْحَفٌ فيه مِثْلُ قُرآنِكُم هذا ثلاثَ مراتٍ، وَاللهِ ما فيهِ حَرْفٌ وَاحِدٌ مِنْ قَرآنِكُم)[١٠٤]. واتە: (ئەو موصحەفەی کە لامانە –لای پێشەواکانیان و پێی دەڵێن موصحەفی فاتیمە– سێ ئەوەندەی قورئانەکەی ئێوەیە، سوێند بە خوا پیتێکی تێدا نییە لە قورئانەکەی ئێوە).

## تەوەرەی دووەم: ئەو دەقانەی کە کراونەتە بەڵگە لەسەر زیادکردن و کەمکردن لە قورئاندا

هەندێك دەق، لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و وتەی هاوەڵان، کە لە کتێبی پێشینناندا هاتووە، نەیارانی قورئان کردوویان بە بەڵگە لەسەر دەستکاریکردنی قورئان بە کەمکردن و زیادکردن. هەندێك لەو دەقانە:

١– (القرآنُ ألفُ ألفِ حَرْفٍ وَسَبعَةٌ وَعِشرونَ ألفَ حَرْفٍ فَمَنْ قَرَأَهُ صَابِراً مُحْتَسِباً فَلَهُ بِكُلِ حَرْفٍ زَوجةٌ مِنَ الحورِ العِينِ)[١٠٥]:

* تەبەرانی دەڵێت: لا يروى هذا الحديث عن عمر (رضي الله عنه) إلا بهذا الاسناد. تفرد به حفص بن ميسرة[١٠٦].

---

[١٠٤] الكافي، ص٥٧، ط ١٢٧٨هـ. لە کتێبی: الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، ١/ ٥٥.

[١٠٥] الخوئي دەڵێت: أخرج الطبراني بسند موثق عن عمر بن الخطاب مرفوعا: "القرآن ألف ألف وسبعة وعشرون ألف حرف"، لە میانەی تۆمەتبارکردنی ئەهلی سوننە بە سڕینەوەی هەندێك لە قورئان! (البيان ل٢٠٢، لە ئەنتەرنێتەوە).

[١٠٦] حدثنا محمد بن عبيد بن آدم بن أبي إياس العسقلاني حدثني أبي عن جدي آدم بن أبي إياس ثنا حفص بن ميسرة عن زيد بن أسلم عن أبيه عن عمر بن الخطاب قال: قال رسول الله ﷺ: (القرآن ألف ألف حرف.. الحديث). المعجم الأوسط للطبراني، ج٦، ل٣٦١.

* زەهەبی دەڵێت: محمد بن عبيد بن آدم بن أبي إياس العسقلاني تفرد بخبر باطل[١٠٧].

* هەیسەمی دەڵێت: رواه الطبراني في الأوسط عن شيخه محمد بن عبيد بن آدم بن أبي إياس ذكره الذهبي في الميزان لهذا الحديث ولم أجد لغيره في ذلك كلاماً وبقية رجاله ثقات[١٠٨].

* ئەلبانی دەڵێت: (القرآن ألف ألف حرف.. الحديث).. باطل[١٠٩]!

٢- لە عومەرەوە دەگێڕنەوە: (إِنَّ اللهَ عَزَ وَجَلَ بَعَثَ مُحمَداً بِالحَقِّ، وأَنْزَلَ مَعَهُ الكتابَ، فَكانَ ممَّا أُنْزِلَ إليهِ آيَةُ الرَّجْمِ، فَرَجَمَ رسولُ الله ﷺ وَرَجَمْنا بَعْدَهُ، ثُمّ قَالَ: كُنَّا نَقْرَأُ: (وَلا تَرْغَبُوا عَنْ آبائِكُمْ فَإِنَّهُ كُفْرٌ بِكُمْ)، أو: (إِنْ كُفْراً بِكُمْ أَنْ تَرَغَبُوا عَنْ آبائِكُم).

* البخاري (٦٨٣٠) ومسلم (١٦٩١)[١١٠]. زاد أبو داود (٤٤١٨): (وَايْمُ اللَّهِ، لَوْلَا أَنْ يَقُولَ النَّاسُ: زَادَ عُمَرُ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، لَكَتَبْتُهَا). وصححه الألباني في صحيح أبي داود.

---

[١٠٧] ميزان الاعتدال للذهبي، ٣/ ٦٣٩.

[١٠٨] مجمع الزوائد للهيثمي، ٧/ ١٦٣.

[١٠٩] قال الطبراني في "معجمه الأوسط": حدثنا محمد بن عبيد قال: حدثنا أبي، عن جدي، عن حفص بن ميسرة، عن زيد بن أسلم، عن أبيه، عن عمر رضي الله عنه مرفوعاً. وقال: "لا يروى عن عمر إلا بهذا الإسناد". كذا في ترجمة محمد بن عبيد بن آدم بن أبي إياس العسقلاني من "الميزان"، وقال: "تفرد بخبر باطل". ثم ساق هذا، وأقره الحافظ في "اللسان". وأشار إليه الهيثمي في "المجمع" (٧/ ١٦٣) وقال: "ولم أجد لغيره في ذلك كلاماً، وبقية رجاله ثقات". قلت: لوائح الوضع على حديثه ظاهرة، فمثله لا يحتاج إلى كلام ينقل في تجريحه بأكثر مما أشار إليه الحافظ الذهبى ثم العسقلاني" من روايته لمثل هذا الحديث وتفرده به.. السلسلة الضعيفة والموضوعة، ج٥، ص٧٠.

[١١٠] عن ابن عباس رضي الله عنهما: أن عمر بن الخطاب صعد المنبر فخطب الجمعة، وكان مما قال رضي الله عنه فقال: (إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا ﷺ بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَرَأْنَاهَا، وَعَقَلْنَاهَا، وَوَعَيْنَاهَا، رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ

– ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل دەڵێت: کە پووری وتوویەتی: لقد أَقْرَأَنا رَسولُ اللهِ ﷺ آيَةَ الرَّجْمِ: (الشَّيخُ وَالشَّيخَةُ فَارْجُمُوهُما أَلْبَتَةَ بِما قَضَيا مِنَ اللَّذَةِ).. ضعيف[111].

٣– ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت: (وَإنّا كُنّا نَقْرأُ سورةً كُنّا نُشَبِهُها في الطُولِ وَالشِّدَةِ بِبَراءَةَ فَأُنْسيتُها، غَيرَ أنّي قَدْ حَفِظْتُ مِنْها: (لَوْ كَان لابْنِ آدمَ واديانِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغى وادياً ثالِثاً وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابنِ آدمَ إلّا التُراب). وَكُنّا نَقْرَأُ سُورةً كُنّا نَشَبِهُها بِإحْدى المسَبِحاتِ فَأُنْسيتُها، غَيرَ أنّي حَفِظْتُ مِنها: (يَا أيُّها الّذينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولونَ ما لا تَفْعَلونَ، فَتُكْتَبُ شَهادَةً في أعْناقِكُم، فَتُسْأَلونَ عَنها يَومَ القِيامةِ).

* صحيح مسلم –كتاب الزكاة– حديث رقم ١٧٣٩[112].

---

قَائِلٌ: وَاللَّهِ مَا نَجِدُ آيَةَ الرَّجْمِ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وَالرَّجْمُ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أُحْصِنَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتْ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ، أَوْ الِاعْتِرَافُ).

[111] قال أبو عبيد: حدثنا عبدالله بن صالح، عن الليث، عن خالد بن يزيد، عن سعيد بن أبي هلال، عن مروان بن عثمان، عن أبي أمامة بن سهل: أن خالته قالت: لقد أقرأنا رسول الله (ﷺ) آية الرجم: (الشيخ والشيخة فارجموهما ألبتة بما قضيا من اللذة). رواه أبوعبيد في الفضائل ص١٩١: وفي سنده: ١- عبدالله بن صالح: صدوق، كثير الغلط، ثبت في كتابه، وكانت فيه غفلة (تهذيب الكمال ١/ ٩٨-١٠٩، وتهذيب التهذيب ٥/ ٢٥٦- ٢٦١، والتقريب ١/ ٤٢٣). ٢- مروان بن عثمان: قال أبو حاتم: **ضعيف** (التهذيب ١٠/ ٩٥، والتقريب ٢/ ٢٣٩: الاتقان، ص٥٣٠.

[112] بعث أبو موسى الأشعري الى قراء أهل البصرة، فدخل عليه ثلاثمائة رجل، قد قرأوا القرآن. فقال: أنتم خيار أهل البصرة وقراؤهم، فاتلوه ولا يطولن عليكم الأمد فتقسو قلوبكم كما قست قلوب العرب من كان قبلكم، وإنا كنا نقرأ سورة كنا نشبهها في الطول والشدة ببراءة فانسيتها، غير أني قد حفظت منها: (لو كان لابن آدم واديان من مال لابتغى وادياً ثالثاً ولا يملأ جوف ابن آدم إلا التراب. وكنا نقرأ سورة كنا نشبهها بإحدى المسبحات فانسيتها، غير أني حفظت منها: يا أيها الذين آمنوا لم تقولون ما لا تفعلون، فتكتب شهادة في أعناقكم، فتسألون عنها يوم القيامة). حدثني زهير بن حرب وهارون بن عبد الله، قالا: حدثنا حجاج بن محمد عن ابن جريج قال: سمعت عطاء يقول: سمعت ابن عباس: يقول سمعت رسول الله ﷺ يقول: لو أن لابن آدم ملء واد مالا لأحب أن يكون إليه مثله، ولا يملأ نفس ابن آدم إلا التراب، والله يتوب على من تاب. قال ابن عباس: فلا أدري أمن القرآن هو أم لا. وفي رواية زهير قال: فلا أدري أمن القرآن. لم يذكر ابن عباس. هەروەها سەیری: الاتقان ص٣٠ بکە.

٤- له عائيشه‌وه ده‌گێڕنه‌وه: (كانتْ سورةُ الآحْزابِ تُقْرَأُ في زَمَنِ النَّبى ﷺ مِئَتي آيةٍ، فَلَمَّا كَتَبَ عُثمانُ المصاحِفَ لَمْ نَقدرْ منها إلّا ما هُوَ الآنَ).

* له (مسند أحمد ج٥/ ١٣٢)دا[١١٣]: تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لضعف يزيد بن أبي زياد.

* له كتێبى (الإتقان في علوم القرآن): وفي سنده ابن أبي لهيعة: ضعيف[١١٤].

٥- ئوبه‌ى كوڕى كه‌عب له زيڕڕى پرسيوه: (كَأَيِّنْ تَقْرأُ سورةَ الآحْزابِ؟ قُلْتُ: ثَلاثاً وَسَبعينَ آيةً. قالَ: إنْ كانَت لَتُضاهي سورةَ البَقَرةِ، أو هِي أَطْوَلُ مِنْ سُورةِ البقرة...).

* روي عن أبي بن كعب، من طريقين: أحدهما: ضعيف، والثاني: حسن.[١١٥]

٦- روى أبو سفيان الكلاعي: أن مسلمة بن مخلد الأنصاري قال لهم ذات يوم: (أَخْبِروني بِآيَتَينِ في القُرآنِ لَمْ يُكْتَبا في المصحَفِ، فَلَمْ يُخْبِروهُ، وَعِنْدَهُم أبو الكنود

---

[١١٣] ٢١٢٤٤ - حدثنا عبد الله حدثني وهب بن بقية أنا خالد بن عبد الله الطحان عن يزيد بن أبي زياد عن زر بن حبيش عن أبي بن كعب: قال: كم تقرؤون سورة الأحزاب؟ قال: بضعا وسبعين آية. قال لقد قرأتها مع رسول الله ﷺ مثل البقرة أو أكثر منها وان فيها آية الرجم.

[١١٤] وقال -يعني أبا عبيد-: حدثنا ابن أبي مريم، عن ابن لهيعة، عن أبي الأسود، عن عروة بن الزبير، عن عائشة، قالت: كانت سورة الأحزاب تقرأ في زمن النبى ﷺ مائتي آية، فلما كتب عثمان المصاحف لم يقدر منها إلاّ على ما هو الآن.. رواه أبو عبيد في فضائله ص١٠. وفي سنده ابن لهيعة: ضعيف... الإتقان، ٥٢٩.

[١١٥] روي عن أبي بن كعب، من طريقين: أحدهما: من طريق يزيد بن أبي الزناد عن زر بن حبيش عن أبي بن كعب - رضي الله عنه-، وقد أخرجه أحمد في مسنده (٢٠٧٠١)، ويزيد بن أبي زياد **ضعيف،** قال عنه ابن معين: لا يحتج به. والثاني: من طريق عاصم بن بهدلة عن زر بن حبيش عن أبي بن كعب- رضي الله عنه-، وقد أخرجه ابن حبان في صحيحه (٤٤٢٨) والحاكم في المستدرك (٤١٥/٢) وصححه والنسائي في الكبرى (٧١٥٠) والبيهقي (٢١١/٨) وأحمد (٢١٢٠٦) وعبد الرزاق (١٣٣٦٣)، وعاصم بن بهدلة صدوق له أوهام، والحديث بهذا **حسن،** ومن أهل العلم من قال: تفرد عاصم بن بهدلة في مثل هذا مما لا يحتمل.

سعدُ بنُ مالكٍ، فَقَالَ ابنُ مَسلَمةَ: إنَّ الّذينَ آمَنوا وَهاجَروا وَجاهَدوا في سَبيلِ اللهِ بِأَمْوالِهِمْ وَأَنْفُسِهِم ألا أَبْشِروا أَنْتُم المفْلحونَ، وَالّذينَ آوَوهُم وَنَصَروهُم وَجَادَلوا عَنهمُ القَومَ الّذينَ غَضِبَ اللهُ عَليهِم أُولئِكَ لا تَعْلَمُ نَفْسٌ ما أُخْفِيَ لَهُم مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزاءً بِما كَانوا يَعْمَلون).

* رواه أبو عبيد في الفضائل، ص١٧٣، سنده ضعيف، فيه: ابن لهيعة[١١٦].

٧– له موصحەفی عائیشەدا هاتووە: (إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلى النَّبّي يا أَيُّها الّذينَ آمَنُوا صَلُّوا عَليهِ وَسَلِّمُوا تَسْليماً، وَعَلى الّذينَ يَصِلوُنَ الصُّفُوفَ الأُوَّلَ. قَالتْ: قَبْلَ أَنْ يُغَيّرَ عُثْمانُ المصاحِفَ).

* رواه أبو عبيد في فضائل القرآن، ص١٩٣. وفي سنده محمد ابن أبي حميد: ضعيف[١١٧].

٨– ئەوەی لە سورەتی (الخلع والحفد)دا هاتووە لە موصحەفی ئیبن عەبباس و ئوبەی کوڕی کەعب: (اللّهُمَّ إنّا نَسْتَعينُكَ وَنَسْتَغْفِرُكَ وَنُثْني عَليْكَ وَلا نَكْفُرُكَ وَنَخْلَعُ وَنَتْرُكُ مَنْ يَفْجُرُكَ، اللّهُمَّ إيّاكَ نَعْبُدُ وَلَكَ نُصَلّي وَنَسْجُدُ وَإليْكَ نَسْعَى وَنَحْفدُ، نَرْجُو رَحْمَتَكَ وَنَخْشى عَذابَكَ إنَّ عَذابَكَ الجِدَّ بِالكافرينَ مُلْحِقٌ).

خاوەنی کتێبی (الإنتصار) دەڵێت: ئەو دوعای قنوتەی کە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەیگێڕنەوە، کە لە موصحەفەکەیدا نووسیبووی، بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە قورئانە، بەڵکو تەنها دوعایە. ئەگەر قورئانبووایە بە تەواتر پێمان دەگەیشت، زانیاریمان دەبوو بە ڕاستێتیی قورئانیەتی. دەبێت قورئانیش بووبێت لە سەرەتادا و نەسخکراوەتەوە و مۆڵەت درابێت وەك دوعا بخوێنرێتەوە. ئەوەی

---

[١١٦] الاتقان، ٥٣١.

[١١٧] روت حميدة بنت أبي يونس، قالت: "قرأ علي أبي -وهو ابن ثمانين سنة- في مصحف عائشة: إن الله وملائكته يصلون على النبى يا أيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليماً، وعلى الذين يصلون الصفوف الأول. قالت: قبل أن يغير عثمان المصاحف. الاتقان، ٥٣٠.

لێی دەگێڕنەوە کە لە موصحەفەکەیدا نووسیبێتیەوە، ئەوە شتی تریشی لە موصحەفەکەیدا تۆمارکردبوو کە قورئان نەبوو، وەك دوعا و تەفسیر[118].

٩- ئیبن عومەر وتوویەتی: (لايَقُولَنَّ أَحَدُكُم: قَدْ أَخَذْتُ القرآنَ كُلَّهُ، وَما يُدريهِ مَا كُلُّهُ. قَدْ ذَهَبَ مِنْهُ قرآنٌ كثيرٌ، وَلكِنْ لِيَقُلْ: قَدْ أَخَذْتُ مِنْهُ مَا ظَهَرَ).

* لای سیوتی: رواه أبو عبيد في فضائله، ص ١٩٠ عن ابن عمر مرفوعاً. وسنده صحيح[119].

* خاوەنی (روح المعاني) دەڵێت: إما موضوع أو مؤول[120].

* زەرقانی دەڵێت: نیسبەتکردنی ئەم قسەیە بۆ ئیبن عومەر، ڕاست نییە و درۆیە. گریمان ڕاستیشە، ئەمە فەرموودەیەکی (موقوف[121])ە -واتە نەگێڕدراوەتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ- گریمان گێڕدرابێتیشەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ -واتە ئەگەر (مرفوع[122])یش بێت- ئەوە دژی بەڵگە ڕاستەکانە (الأدلة القاطعة) کە بە تەواتور پێمان گەیشتووە بەبێ زیاد و کەم. دیارە موعارەزەکردنی بەڵگەی (قطعي)ی حیسابی بۆ ناکرێت لە فەرموودەی (آحاد)دا، قیمەتی سەنەدەکەشی چەند بەرز بێت[123].

---

[118] مناهل العرفان، ١/١٩٥.

[119] قال أبو عبيد: حدثنا اسماعيل بن إبراهيم، عن أيوب، عن نافع عن ابن عمر قال: لا يقولن أحدكم: قد أخذت القرآن كله، وما يدريه ما كله قد ذهب منه قرآن كثير، ولكن ليقل: قد أخذت منه ما ظهر. الاتقان، ص٥٢٩.

[120] روح المعاني، الآلوسي، ٢١/ ١٤٢.

[121] هو ما روي عن الصحابي من قول له أو فعل أو تقرير، متصلاً كان أو منقطعاً. لە کتێبی: دراسة في مصطلح الحديث، إبراهيم النعمة، مطبعة الزهراء، الموصل، ط١، ١٩٨٥م، ١٤٠٥هـ: ٦٤.

[122] هو ما أضيف إلى النبي (ﷺ) من قول أو فعل أو تقرير أو صفة، سواء كان متصل الإسناد أم منقطعاً، وسواء كان الناسب صحابياً أم تابعياً أم غيرهما. لە کتێبی: دراسة في مصطلح الحديث، إبراهيم النعمة، ص٥٩.

[123] مناهل العرفان، ١/ ٢٠٦.

١٠- ئیبن مەسعود (المعوذتين)ی لە موصحەفەکیدا سڕیوەتەوە و وتوویەتی: (إِنَّهُمَا لَيْسَتَا مِنْ كِتابِ اللهِ)[١٢٤].

عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ عَنِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ ؟ فَقُلْتُ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ، إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَحُكُّهُمَا مِنَ الْمُصْحَفِ، قَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قِيلَ لِي: قُلْ. فَقُلْتُ. فَنَحْنُ نُقُولُ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[١٢٥].

---

[١٢٤] رواه أحمد في المسند١٢٩/٥ والطبراني في المعجم) من طريق أبي إسحاق السبيعي والأعمش وهو سليمان بن مهران وكلاهما ثقة مدلس من رجال الصحيحين وقد اختلط السبيعي بأخرة. فإذا أتيا بالرواية معنعنة تصير معلولة (العلل للدارقطني). وهذه الرواية معلولة بالعنعنة. وحكي عن كليهما الميل إلى التشيع.

وقد أنكر ابن حزم والنووي والباقلاني ثبوت شيء عن ابن مسعود في ذلك. وذهب ابن حزم إلى ضعف بأنه قد صحت قراءة عاصم عن زر بن حبيش عن عبد الله بن مسعود وفيها أم القرآن والمعوذتان (المحلى١٣/١).

وقال النووي «أجمع المسلمون على أن المعوذتين والفاتحة وسائر السور المكتوبة في المصحف قرآن. وأن من جحد شيئا منه كفر. وما نقل عن ابن مسعود في الفاتحة والمعوذتين باطل ليس بصحيح عنه» (المجموع شرح المهذب ٣٩٦/٣).

[١٢٥] وفي رواية: عَنْ زِرٍّ، قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيًّا عَنِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ، فَقَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ عَنْهُمَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَقِيلَ لِي، فَقُلْتُ، فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَنَحْنُ نَقُولُ.

وفي رواية: عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، قَالَ: قُلْتُ لأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: إِنَّ ابْنَ مَسْعُود كَانَ لاَ يَكْتُبُ الْمُعَوِّذَتَيْنِ فِي مُصْحَفِهِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَخْبَرَنِي، أَنَّ جِبْرِيلَ قَالَ لَهُ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) فَقُلْتُهَا، فَقَالَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) فَقُلْتُهَا، فَنَحْنُ نَقُولُ مَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ.

وفي رواية: عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْد الرَّحْمانِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللهِ يَحُكُّ الْمُعَوِّذَتَيْنِ مِنْ مَصَاحِفِهِ، وَيَقُولُ: إِنَّهُمَا لَيْسَتَا مِنْ كِتَابِ اللهِ، تَبَارَكَ وَتَعَالَى.

قَالَ الأَعْمَشُ: وَحَدَّثَنَا عَاصِمٌ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: سَأَلْنَا عَنْهُمَا رَسُولَ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: قِيلَ لِي، فَقُلْتُ: أخرجه الحميدي ٣٩٧ قال: حدثنا سفيان، قال: حدثنا عَبدة بن أبي لُبابة، وعاصم بن بَهدلة. وأحمد ١٢٩/٥(٢١٥٠٠) قال: حدَّثنا أبو بَكْر بن عَيَّاش، عن عاصم. وفي (٢١٥٠١) قال: حدَّثنا وَكِيع، حدَّثنا سُفْيان، عن عاصم. وفي (٢١٥٠٢) قال: حدَّثنا عَبْد الرَّحْمان بن مَهْدِي، حدَّثنا سُفْيان، عن

نەوەوی لە (شرح المهذب) دا دەڵێت: موسڵمانان کۆکن (إجماع) لەسەر ئەوەی هەر سێ سورەتی (الفاتحة والمعوذتان) لە قورئانە و هەرکەس ئینکاریی شتێك بکات تێیاندا، کافر دەبێت. ئەوەی لە ئیبن مەسعودی دەگێڕنەوە، (باطل)ە و ڕاست نییە. هەروەها ئیبن حەزم لە کتێبی (القدح المعلى)دا دەڵێت: (ئەمە درۆیە بە ناوی ئیبن مەسعودەوە کراوە). بەڵکو (قراءة)ەی (عاصم) بە ڕیوایەت دەچێتەوە سەر ئیبن مەسعود و هەر سێ سورەتی (الفاتحة والمعوذتان)ی تێدا ڕیوایەت کراوە، وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، دەڵێت: (أَنّهُ قَرأَهُما فِي الصلاةِ). واتە: (پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا هەردووکیانی خوێندووەتەوە) و ئیبن حیببان لە ڕێگەیەکی ترەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَإِن استَطَعتَ أَلاّ تَفُوتَكَ قِراءَتُهما فِي صَلاةٍ فَافْعَلْ). واتە: (ئەگەر پێتکرا لە نوێژدا بیانخوێنیتەوە، ئەوە باشە)[١٢٦]. زانراوە کە جگە لە

---

عاصم. وفي (٢١٥٠٣) قال: حدَّثنا عَبْد الرَّحْمان بن مَهْدِي، عن سُفْيان، عن الزُّبَيْر بن عَدِي، عن أَبي رَزِين. وفي (٢١٥٠٤) قال: حدَّثنا مُحَمد بن جَعْفَر، حدَّثنا شُعْبة، عن عاصم بن بَهْدَلَة. وفي (٢١٥٠٥) قال: حدَّثنا عَفَّان، حدَّثنا حَمَّاد بن سَلَمَة، أنبانا عاصم بن بَهْدَلَة. وفي (٢١٥٠٦) قال: حدَّثنا عَفَّان، حدَّثنا أبو عَوَانَة، عن عاصم. وفي ٥/١٣٠(٢١٥٠٨) قال: حدَّثنا سُفْيان بن عُيَيْنَة، عن عَبْدَة، وعاصم. و"البُخَارِي" ٦/٢٢٣ (٤٩٧٦) قال: حدَّثنا قُتَيْبَة بن سَعِيد، حدَّثنا سُفْيان، عن عاصم، وعَبْدَة. وفي (٤٩٧٧) قال: حدَّثنا علي بن عَبْد الله، حدَّثنا سُفْيان، حدَّثنا عَبْدَة بن أَبي لُبَابَة (ح) وحدَّثنا عاصم. و"عَبْد الله بن أحمد" ٥/١٢٩(٢١٥٠٧) قال: حدَّثني مُحَمد بن الحُسَيْن بن إِشْكَاب، حدَّثنا مُحَمد بن أَبي عُبَيْدَة بن مَعْن، حدَّثنا أَبي، عن الأَعْمَش، حدَّثنا عاصم. و (النَّسَائِي)، في "الكبرى" (تحفة الأشراف) رقم (١٩) عن قُتَيْبَة بن سَعِيد، عن سُفْيان، عن عاصم، وعَبْدَة بن أَبي لُبَابَة.

ثلاثتهم (عَبْدَة، وعاصم، وأبو رَزِين) عن زِرّ بن حُبَيْش، فذكره.

[١٢٦] مناهل العرفان، ١/ ١٩٧. هتروةها: تأريخ القراءات والقُرّاء وجهودهم في القراءة والتأليف في القراءات وعلومها منذ العهد النبوي وحتى اليوم، د. محمود أحمد سعيد الأطرش، دار الإيمان، الإسكندرية، ط١، ٢٠١١م: ٥٦.

قورئان —له دوای فاتیحه— نابێت بخوێنرێتەوه له نوێژدا، واته هەر ڕیوایەتێك نەگەیشتبێتە ڕاددەی تەواتر، نابێت له نوێژدا —وەك قورئان— بخوێنرێتەوه.

ئەگەر ئەم ڕیوایەتەش له ئیبن مەسعودەوە ڕاست بێت، ئەوه دەگەیەنێت که لای ئیبن مەسعود ئەم دوو سورەتە به تەواتور پێی نەگەیشتووە، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە دانی پێداناوه و بەڵگەش —وەك باسمان کرد— خوێندنەوەی قورئان به (قراءة عاصم) له ئیبن مەسعودەوە هەر سێ سورەتەکەی تێدایە[127]. ئەگەر له موصحەفەکەی خۆشیدا نەینووسیبێت، ئەوه لەبەر ئەوه بووه که زۆر ئاشکرا بووه لای که ئەمانە سێ سورەتی قورئانن و پاشانیش دوای نووسینەوەی قورئان له سەردەمی عوسماندا، جگە لەو موصحەفانەی که بڕیاری لەسەر درا، ئەوانی تر هەموویان سووتێنران، لەوانەش موصحەفەکەی ئیبن مەسعود. له حاڵەتێکیشدا ئینکارکردنی ئیبن مەسعود نابێتە گۆڕینی (إجماع)ی موسڵمانان لەسەر ئەوەی که پێمان گەیشتووە به تەواتور. کەسیش نەیوتووە مەرجە له تەواتوردا کەس نەبێت ئینکاری بکات.

١١– له عائیشە دەگێڕنەوە: (كانَ فيما اُنْزِلَ مِنَ القرآن: عَشْرُ رَضعَاتٍ مَعْلُوماتٍ يُحَرِّمْنَ ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعلوماتٍ، فَتُوفِيَ رَسولُ الله ﷺ وهُنَّ فيما يُقْرَأُ مِنَ القُرآنِ).[128]

وا دەردەکەوێت له ڕستەی (وهن فيما يقرأ من القرآن) که له قورئاندا مابێت، که ئەمە ڕاست نییە. بەوە وەڵام دەدرێتەوە که مەبەست پێی: تا نزیکی وەفاتی

---

[127] مناهل العرفان، ١/ ١٩٨.

[128] مسلم ١٤٠٢، وأبو داود ٢٠٦٢، والترمذي ١١٥٠، والنسائي ٦/ ١٠٠، وابن ماجة ١٩٤٢، ومالك في الموطأ ٢/ ٦٠٨، والدارمي ٢٢٥٣، والشافعي في مسنده ٢/ ٢١، وابن حبان في صحيحه ٤٢٢١- ٤٢٢٢، والنحاس في ناسخه ص١٢، وابن الجوزي في نواسخ القرآن ص٣٧، والبيهقي في سننه ٧/ ٤٥٤. هامش الإتقان، ٥٢٠.

پێغەمبەر ﷺ مابێت و هەندێك پێیان نەزانیبێت كە نەسخكراوەتەوە، بۆ كە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كردووە هەندێك خوێندوویانەتەوە[129].

١٢- لە عائیشە دەگێڕنەوە: (لَقَد أُنْزِلَتْ آيَةُ الرَّجْمِ وَرَضعَاتِ الكَبيرِ عَشْراً، فَكانَتْ فِي وَرَقَةٍ تَحْتَ سَرِيرٍ فِي بَيْتي، فَلَمَّا اشْتَكَى رَسولُ اللهِ ﷺ تَشاغَلْنا بَأَمْرِه وَدَخَلَتْ دُوَيْبَةٌ لَنا فَأَكَلَتْها)[130]. صحیح.

١٣- ئەو ڕیوایەتەی كە ئەنەس دەیگێڕێتەوە لە چیرۆكی كوژراوانی بیری مەعونە كە پێغەمبەر ﷺ لە قنوتدا دوعای لێ كردوون: قال أنس: ونزل فيهم قرآنٌ قَرَأْناهُ حتى رُفِعَ: (أَن بَلِّغُوا عَنَّا قَوْمَنَا أَنَّا لَقِينا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا). صحیح[131].

## تەوەرەی سێیەم: شیكردنەوەی بەڵگەكان

دوای هێنانەوەی هەندێك لەو دەقانەی كە ڕەخنەگرانی قورئان بەكاری دەهێنن بۆ تۆمەتباركردنی هاوەڵان بە كەمكردن و زیادكردن لە قورئاندا، بۆمان دەردەكەوێت:

---

[129] الإتقان، ٥٢١.

[130] أحمد ٢٥١١٢، ابن ماجه ٦٢٥/١، والدارقطني: ١٧٩/٤، وأبو يعلى في مسنده ٦٤/٨، والطبراني في معجمه الأوسط ١٢/٨، وابن قتيبة في تأويل مختلف الحديث، وأصله في الصحيحين، وأورده ابن حزم في المحلى ٢٣٦/١١ وقال: هذا حديث **صحيح**.

[131] البخاري ٢٨١٤، ومسلم ٦٧٧. هەروەها: البخاري (٢٥٩١): حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرُ الْحَوْضِيُّ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ إِسْحَاقَ عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ أَقْوَامًا مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ إِلَى بَنِي عَامِرٍ فِي سَبْعِينَ فَلَمَّا قَدِمُوا قَالَ لَهُمْ خَالِي أَتَقَدَّمُكُمْ فَإِنْ أَمَّنُونِي حَتَّى أُبَلِّغَهُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِلَّا كُنْتُمْ مِنِّي قَرِيبًا فَتَقَدَّمَ فَأَمَّنُوهُ فَبَيْنَمَا يُحَدِّثُهُمْ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ أَوْمَئُوا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ فَطَعَنَهُ فَأَنْفَذَهُ فَقَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ ثُمَّ مَالُوا عَلَى بَقِيَّةِ أَصْحَابِهِ فَقَتَلُوهُمْ إِلَّا رَجُلًا أَعْرَجَ صَعِدَ الْجَبَلَ قَالَ هَمَّامٌ فَأُرَاهُ آخَرَ مَعَهُ فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدْ لَقُوا رَبَّهُمْ فَرَضِيَ عَنْهُمْ وَأَرْضَاهُمْ فَكُنَّا نَقْرَأُ أَنْ بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ فَدَعَا عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَبَنِي لَحْيَانَ وَبَنِي عُصَيَّةَ الَّذِينَ عَصَوْا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﷺ.

* ئەم هێرشە لەسەر قورئان تازە نییە و نزیکی چواردە سەدەیە بەردەوامە. جارجار کز دەبێت -دوای پوچەڵکردنی- و جارجار هەڵدەداتەوە، بەڵام هەمان بەڵگە -بە حیسابی خۆیان- دووبارەدەکەنەوە، بەشێوەیەکی تر، یان بە زمانێکی تر. لە شێوەی هێرشکردن و داننەنان بە قورئان، یان لە شێوەی -گوایە- گەڕان بەدوای ڕاستیدا! بەڵگەش وەڵامدانەوەی زانایانی ئیسلامە لە کتێبە کۆنەکاندا بۆ ئەو گومانانە.

* قۆستنەوەی نەیارانی قورئان بۆ ئەو دەقانەی کە لە کتێبە کۆنەکاندا نووسراون و ڕیوایەت کراون -ڕاست و نادرووست- کە زۆرجار نووسەری ئەو کتێبانە ئاماژەی بە نادروستیی ڕیوایەتەکان کردووە، یان زنجیرەی ڕاوییەکانی نووسیوە، بەڵام نەیاران تەنها دەقەکان دەگێڕنەوە بێ باسکردنی ڕای نووسەر خۆی لەسەر ڕاستی و درووستیی ئەو دەقانە!

* پڕکردنی کتێبە کۆنەکانی زانستەکانی قورئان و فەرموودە و مێژوو لەو ڕیوایەتە زۆر و بۆرانەی کە هەندێکیان -لەڕاستیدا- ناچێتە ئەقڵی کەسەوە، بووەتە هۆی ئیستیغلالکردنیان لە لایەن نەیارانی قورئانەوە.

* لەو دەقانەی کە هێناومانەتەوە بە نموونە -ڕیوایەتەکانی تریش کە باس نەکراون بە شێوەیەکی گشتی لەو شێوازانەن- بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەیان نادروستن: درۆن -واتە داهێنراون (موضوع)، یان لاوازن وەك نموونەکانی (١، ٤، ٦، ٧) و نموونەکانی (٥ و ٩)ش لە نێوان ئەوەدان لاوازن یان (حسن). دیارە لەم بابەتە (عقیدي)یە گرنگەدا کار بە ڕیوایەتی (موضوع) و (ضعیف) ناکرێت[١٣٢].

* ئەوانەشی کە ڕیوایەتەکەیان دروستە (صحیح)ە یان (حسن)ە، ئەوا زانایان وەڵامیان داوەتەوە:

---

[١٣٢] بنوارە: علوم الحدیث، زیدان و عبدالقهّار، ٤٨- ٤٩.

– نموونەی ٢: ڕیوایەتەکەی لە عومەرەوە دروستە دەربارەی سزای ڕەجمی (محصن)، کە ئەمە لە جۆری نەسخی خوێندنەوە و مانەوەی حوکمەکەیەتی لە قورئاندا. بەڵام ڕیوایەتی (الشیخ والشیخة فارجموهما ألبتة بما قضیا من اللذة) لاوازە و کاری پێ ناکرێت.

– نموونەی ٣: ئەمە لە جۆری نەسخی حوکم و مانەوەی خوێندنەوەیەتی لە قورئاندا.

– نموونەی ٨: حوسەینی کوڕی مونادی لە کتێبی (الناسخ والمنسوخ)دا دەڵێت: لەوانەی کە ڕەسمەکەی –نووسینەکەی– لە قورئاندا هەڵگیراوە، بەڵام لە دڵەکاندا ماوەتەوە، دوو سورەتی قنوتی نوێژی وەترن، پێیان دەوترێت سورەتی (الخَلع) و (الحفد)[١٣٣].

– نموونەی ١٠: لە تەوەرەی دووەمدا بە درێژی باسمان لێوە کردووە: کە ئیبن مەسعود بڕوای هەبووە بەوەی هەر سێ سورەتی (الفاتحة والمعوذتان) بەشێکن لە قورئان، موسڵمانان بە سەنەدی موتەواتیر ئەو سێ سورەتە لەوەوە دەگێڕنەوە. لای خوارەوە سەنەدی سیان لە حەوت خوێنەرەکان (القراء السبعة) دێنین، کە بە ڕێگەی تەواتور پێمان گەیشتووە، بە سەنەدی دروست دەگاتەوە بە پێغەمبەر ﷺ:

١– سەنەدی (قراءة)ی عاصم:

وقرأ عاصم على أبي عبدالرحمن عبدالله بن حبيب السُّلَميِّ، وعليه تعلَّم القرآن، وقرأ أبو عبدالرحمن على عليٍّ بن أبي طالب، وعلى عثمان بن عفان، وعبدالله بن عَبَّاس، وأُبيٍّ بن كعب، وأبي عبدالله زيد بن ثابت. وقرأ عاصم أيضاً على أبي مريم زِرِّ

[١٣٣] الإتقان، ٥٣٢: لە پەڕاوێزەکەیدا دەڵێت: لە (البرهان)دا هاتووە ٢/٣٧.

بن حُبَيش، وقرأ زِرٌ على أبي عبدالرحمن عبدالله بن مسعود. وقرأ عليٌّ وعثمان وعبدالله بن العبَّاس وأُبيٌّ بن كعب، وزيد بن ثابت، وعبدالله بن مسعود على النِّبيِّ ﷺ[134].

٢- سەنەدی (قراءة)ی حەمزە:

وقرأ حمزةُ على أبي محمد سُليمان بن مِهران الأعمش، وقرأ الأعمش على يحيى بن وَثّاب، وقرأ يحيى على عَبيدَة السَّلْمانيِّ وعلقمة والأسود ومسروق، وقرأ هؤلاء على عبدالله بن مسعود، وقرأ ابن مسعود على النَبّي ﷺ[135].

٣- سەنەدی (قراءة)ی (الكسائي):

وقرأ الكسائي على حمزة بن حبيب الزيّات وزائدة بن قُدامة، وقرءا جميعاً على أبي محمد سُليمان بن مِهران الأعمش، وقرأ الأعمش على حُمران بن أعين وابن أبي ليلى أصحاب عبدالله بن مسعود، وقرأ حُمران على عبيد بن نُضيلَة، وقرأ عُبيد على عَلقَمة، وقرأ علقمةُ على عبدالله بن مسعود، وقرأ ابن عبدالله على النَبى ﷺ[136].

- نموونەی ١١: ئەمە لە جۆری نەسخی هەردوو خوێندنەوە و حوكمە لە قورئاندا، كە جیاوازیی لەسەر نییە لە نێوان زانایاندا.

- نموونەی ١٢: سەبارەت بە (رضاعة الكبير عشراَ): ئەمیش لە جۆری نەسخی هەردوو خوێندنەوە و حوكمە لە قورئاندا. سەبارەت بە (آية الرجم): وەك باسكرا، كە بریتییە لە ڕیوایەتی (الشيخ والشيخة فارجموهما ألبتة بما

---

[134] المستنير في القراءات العشر، للإمام أبي طاهر أحمد بن علي بن عُبيدالله بن عمر بن سِوار البغدادي (ت٤٩٦هـ)، تحقيق ودراسة د. عمّار أمين الدّدو، دار البحوث والدراسات الإسلامية وإحياء التراث، الإمارات العربية المتحدة، ط١، ٢٠٠٥م، ١٤٢٦هـ: ١/ ٣٣٦. هەروەها: التذكرة في القراءات، أبو الحسن طاهر بن عبدالمنعم بن غَلبون، تحقيق ومراجعة د. سعيد صالح زعيمة، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ٢٠٠١م، ١٤٢٢هـ: ١٦. هەروەها: كتاب التيسير في القراءات السبع، الإمام أبو عمرو عثمان بن سعيد الدّاني، تصحيح أوتو ثرتزل، المعهد الألماني للأبحاث الشرقية، بيروت، ٢٠٠٩م: ٩.

[135] المستنير في القراءات العشر، ١/ ٣٥٩- ٣٦٠. هەروەها: كتاب التيسير في القراءات السبع، ٩.

[136] المستنير في القراءات العشر، ١/ ٣٨٦.

قضيا من اللذة): لاوازە و کاری پێناکرێت. سەبارەت بەوەی کە لە پەڕەیەکدا نووسرابووەوە و ئاژەڵێکی ناوماڵ خواردوویەتی: هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت، چونکە تەنها ڕیوایەتێکی نەسخکراو ونبووە.

نموونەی ۱۳: ئەمەش لە جۆری خوێندنەوەیەتی لە قورئاندا هەڵگیراوە، بەڵام لە دڵەکاندا ماوەتەوە، واتە: نەسخی خوێندنەوەی و مانەوەی حوکم.

* بە شێوەیەکی گشتی بۆ وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە ڕیوایەت و گومانانە — دوای وەلاخستنی ڕیوایەتە نادروستەکان— ئەوەیە کە ئەو قورئانەی کە لەبەردەستماندایە ئێستا، لە دووتوێی پەرتووکێکدا نووسراوەتەوە (إجماع)ی هەموو موسوڵمانانی لەسەرە —مەگەر هەندێ گرووپی لادەر— کە ئەو قورئانەیە عوسمان کۆی کردووەتەوە، ئەویش لەبەر موصحەفەکەی ئەبوبەکر نووسیویەتییەوە. خوێندنەوەی بە ڕیوایەتی موتەواتیر پێمان گەیشتووە کە تا ئەمڕۆش ئەو ڕیوایەتە لە سەرەوە دەگوێزرێتەوە بۆ خوارەوە، تەنها ۱۰ (قراءة)ەی وەرگیراوە لە لایەن موسوڵمانانەوە[١٣٧]، کە ئەوانیش دەبێت مەرجەکانی ڕاستیی خوێندنەوە (صحة التلاوة)ی لەسەر بێت ئینجا وەردەگیرێت، کە بریتین لە سێ مەرج[١٣٨]:

١. بوونی سەنەدی دروستی نەپچڕاوی موتەواتیر بۆ پێغەمبەر ﷺ.

٢. گونجانی لەگەڵ شێوازێك لە شێوازی زمانی عەرەبی.

---

[١٣٧] أجمع الأصوليون والفقهاء على أنه لم يتواترشئ مما زاد على القراءات العشرة، وكذلك أجمع عليه القراء أيضاً إلاّ من لا يعتد بخلافه: شرح طيبة النشر في القراءات العشر، أبو القاسم محمد بن محمد بن محمد بن علي النويري، تحقيق: د. مجدي محمد سرور سعد باسلوم، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان، ط١، ٢٠٠٣م، ١٤٢٤هـ: ١/ ١٢٧.

[١٣٨] قطر من غيث النفع في أصول وكلمات القراءات السبع، د. محمد نبهان مصري، دار ابن حزم، بيروت، لبنان، ط١، ٢٠١٠م، ١٤٣١هـ: ١٠.

٣. بەپێی خەتی موصحەف بێت.

بەڵام گرنگترینیان بوونی سەنەدێکی نەپچڕاوی ڕاستی موتەواتیرە تا دەگاتە پێغەمبەر ﷺ، لەویشەوە بۆ جبریل و پاشانیش بۆ خوای گەورە[١٣٩].

زانراوە ئەگەر هەواڵێك (خبر)ێکی پێچەوانەی موتەواتیر هەبێت، نابێتە ڕەتدانەوەی یان سڕینەوە و بەرەنگاری (معارضة)ی دەقە موتەواتیرەکە، کە بەڵگەیەکی (قطعي)یە، هیچ بەڵگەیەکی تری (ظني) با دروستیش بێت، وەرناگیرێت لە بەرامبەریدا.

قازی ئەبوبەکر لە (الإنتصار)دا لە هەندێك ئەهلی عیلمەوە دەگێڕێتەوە: (نابێت شتێك لە قورئان بنووسرێتەوە بە هەواڵ (خبر)ی (آحاد)، چونکە (آحاد) نابێتە بەڵگە)[١٤٠].

* لەکاتی گەڕان بە دوای ئەم بەناو بەڵگانەی (تحريف)ی قورئان، بۆمان دەردەکەوێت هەموویان باسی کەمکردن (نقص) لە قورئاندا دەکەن، نەمان بینیوە –بە پێی زانیاریی من– بەڵگە بهێننەوە لەسەر ئەوەی ئایەتێك هەیە زیادبێت لەناو ئەو موصحەفەی کە لەبەردەستماندایە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ کام لەو لایەنانە –ئەگەر ڕێزی خۆیان لابێت– ناتوانێت ئینکاری ئایەتێك بکات، چونکە (نَظْم)ی قورئان تایبەتە، هەرکەس سەلیقەی عەرەبیی هەبێت ناتوانێت بڵێت ئەمە قورئان نییە. ئەمەش پێچەوانەی هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی ترە کە تۆمەتبار دەکرێن بەوەی چەندین شتیان بۆ زیادکراوە

---

[١٣٩] ئیبن جەزەری دەڵێت: وأجمع الأصوليون والفقهاء والقراء وغيرهم على القطع بأن الشاذ ليس بقرآن، لعدم صدق حد القرآن عليه بشرطه: وهو التواتر، صرح بذلك الغزالي، وابن حاجب في كتابيه، والقاضي عضدالدين وابن الساعاتي والنووي، وغيره ممن لا فائدة في عدّه لكثرته، وكذلك السخّاوي في (جمال القرّاء): شرح طيبة النشر في القراءات العشر، النويري، ١/ ١٢٦- ١٢٧.

[١٤٠] الإتقان، ٥٣٢.

کە لە بنەڕەتدا تێیاندا نەبووە. ئەمەش ڕاستیی گوتاری خوا دەردەخات (قُلْ لَئِن اجْتَمَعَت الإنْسُ وَالجِنُّ عَلى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذا القُرآنِ لَا يَأَتُونَ بِمِثْلِه وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهيراً — الإسراء ٨٨). لێرەدا باسی ئەو هەوڵە منداڵانە نازانستییانە ناکەین کە ویستوویانە شتێك وەك قورئان بڵێن کە هەر لە سەرەتاوە بەدرۆخراونەتەوە.

## ئەنجامەکان:

* قورئان پارێزراوە لە ڕێگەی لەبەرکردن و گێڕانەوەی بە ڕیوایەتی نەپچڕاو. هەروەها لە ڕێگەی نووسینەوەی هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ.

* ئەوانەی قورئانیان لەبەربووە لە سەردەمی پێغەمبەردا، ژمارەیان زۆر بووە.

* نووسینەوەی قورئان لە قۆناغی مەککییەوە دەستی پێ کردووە.

* کۆکردنەوەی قورئان بە ٣ قۆناغدا تێپەڕیوە: سەرەتا لە سەردەمی پێغەمبەردا لەسەر شتی سەرەتایی و بە پەرتەوازەیی نووسراوەتەوە. پاشان لە سەردەمی ئەبوبەکردا لە دووتوێی پەرتووکێکدا لەسەر کاغەز نووسراوەتەوە. دوایی لە سەردەمی عوسماندا، لە دووتوێی پەرتووکێکدا و لەسەر کاغەز و چاککردنی پیتەکان (رسم المصحف) ڕەچاو کراوە و (بسم الله الرحمن الرحيم) لە سەرەتای سوورەتەکاندا نووسراوە و ڕەچاوی هەموو قیرائاتەکان کراوە بەپێی گونجانی لەگەڵ (ڕەسمی موصحەفدا).

* بوونی چەندین ڕیوایەتی هەڵبەستراو و لاواز لە کتێبەکانی زانستەکانی قورئان و فەرموودە و مێژوو، کە نەیارانی قورئان قۆستویانەتەوە بۆ هێرشکردنە سەر قورئان.

* ئەو دەقانەی کە نەیارانی قورئان بەکاری دەهێنن بۆ لێدانی قورئان، یان هەڵبەستراو و لاوازن کە کاریان پێناکرێت، یان هەر لە زووەوە زانایان وەڵامیان داونەتەوە بەوەی کە نەسخکراونەتەوە، یان حوکم بێ نووسینەوەی، یان نووسینەوەی بێ حوکمەکەی، یان هەردووکیان.

* بانگەشەی (تحريف) لە قورئاندا نزیکی ١٤ سەدە تەمەنێتی و جارجارە کزدەبێت و جارجارە هەڵدەداتەوە. سەرچاوەی ئەم بانگەشانەش یان خاوەن دینە ئاسمانییەکانن، یان عەلمانی و بێدینەکانن، یان گرووپە لادەرەکانی ئیسلامن.

* هەمیشە لە لایەن نەیارانی قورئانەوە بانگەشەی کەمکردنەوەی قورئان دەکرێت کە گوایە هەندێك ئایەت و سوورەت لە قورئان دەرهێنراوە، بەڵام تێبینی ناکرێت بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئایەتێك یان سوورەتێك هەبێت لە قورئاندا و زیادەبێت.

## راسپاردەکان:

١- لە کاتی وەڵامدانەوەی نەیارانی قورئان، باشترە بگەڕێینەوە سەر بنەماکان. ئەگەر کۆکبین لەسەر تەواوبوونی کۆکردنەوەی هەموو قورئان بە بەڵگەی (قطعي) موتەواتیر، ئەو ڕیوایەتانەی کە ڕووکەشەکەی ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە کە دژی بێت، حیسابی بۆ ناکرێت.

٢- تۆمارکردنی چەند زنجیرە بەرنامەیەك لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی بینراو و بیستراو، بۆ ڕەتدانەوەی گومانەکان، بەڵام بێ ناوهێنانی ئەوانەی ئەم گومانانە بڵاودەکەنەوە. بۆ دروستکردنی بناغەیەکی پتەو بۆ هاووڵاتیان.

٣- هەڵوێست وەرگرتن لەو کەناڵ و پێگانەی کە هێرش دەکەنە سەر قورئان، ئەگەر بشگاتە بەرزکردنەوەی دەعوا لەسەریان، چونکە ئەوان سوکایەتی بە ئایینی خەڵکی دەکەن.

٤- نووسین و وەرگێڕانی چەند کتێب و نامیلکەێك بە زمانی کوردی، دەربارەی وەڵامدانەوەی گومانەکان.

٥- دروستکردنی لیژنەیەك بۆ وەرگێڕانی زاراوە ئیسلامییەکان (بۆ نموونە زاراوە فیقهییەکان) بۆ زمانی کوردی.



## سەرچاوەكان:

١- تفسير النسفي: مدارك التنزيل وحقائق التأويل، عبدالله بن أحمد بن محمود النّسفي، إعتنى به: عبدالمجيد طعمة حلبي، دار المعرفة، بيروت، ط٢، ١٤٢٩هـ، ٢٠٠٨م.

٢- تفسير الكشّاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التأويل، أبو القاسم جارالله محمود بن عمر الزَّمخشري الخوارزمي، إعتنى به وخرَّج أحاديثه وعلّق عليه: خليل مأمون شِيحا، دار المعرفة، بيروت، ط٢، ١٤٢٦هـ، ٢٠٠٥م.

٣- تەفسیری قورئانی پیرۆز، عثمان عبدالعزیز، گ٢، بیروت، لبنان، ٢٠١٠.

٤- موسوعة الحديث الشريف، قرص حاسوبي، مؤسسة سليمان بن عبدالعزيز الراجحي الخيرية، ١٤٢٨هـ.

٥- مناهل العرفان في علوم القرآن، محمد عبدالعظيم الزرقاني، دار إحياء التراث العربي، بيروت، لبنان، ط٢.

٦- تأريخ القرآن وغرائب رسمه وحكمه، محمد طاهر بن عبدالقادر الكردي المكي الخطاط، شركة ومطبعة مصطفى البابي الجلبى وأولاده بمصر، ط٢، ١٩٥٣م، ١٣٧٢هـ.

٧- إتقان البرهان في علوم القرآن، د. فضل حسن عباس، دار النفائس، الأردن، ط٢، ٢٠١٠م، ١٤٣٠هـ.

٨- البرهان في علوم القرآن، الإمام بدرالدين محمد بن عبدالله الزّركشي، تحقيق: محمد أبو الفضل ابراهيم، دار المعرفة، بيروت، لبنان، ١٩٧٢م، ١٣٩١هـ.

٩- الإتقان في علوم القرآن، جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي، حققه وعلّق عليه وخرّج أحاديثه: فوّاز أحمد زمرلي، دار الكتاب العربي، بيروت، لبنان، ١٤٢٧هـ، ٢٠٠٧م.

١٠- مباحث في علوم القرآن، د.صبحي صالح، دار العلم للملايين، بيروت، لبنان، ط١٠، ١٩٧٧.

١١- الجامع لأحكام القرآن، محمد بن أحمد الأنصاري القرطبى، تحقيق: د. عبدالحميد هنداوي، المكتبة العصرية، صيدا، بيروت، لبنان، ٢٠١١م، ١٤٣٢هـ.

١٢- التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن، د. مصطفى ابراهيم الزلمي، مكتب التفسير، أربيل، ط١، ٢٠٠٠م.

١٣- مباحث في علوم القرآن، د. منّاع القطان، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١٩، ١٩٨٣م، ١٤٠٦هـ.

١٤- السراج المنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، الحافظ جلال الدين السيوطي والعلامة محمد ناصر الدين الألباني، ترتيب وتعليق: عصام موسى هادي، مؤسسة الريّان، بيروت، لبنان، ط٣، ٢٠٠٩م، ١٤٣٠هـ.

١٥- الإبانة عن معاني القراءات/ أبي محمد مكي بن أبي طالب القيسي القيرواني ثمّ الأندلسي القرطبى، تحقيق: فرغلي سيد عرباوي، لبنان، ط١، ٢٠١١.

١٦- جمع القرآن الكريـم حفظًا وكتابـةً، أ. د. علي بن سليمان العبيـد، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية.

١٧- معجم مصطلحات الحديث النبوي، أ. د. رشيد عبدالرحمن العبيدي، ديوان الوقف السني، بغداد، ٢٠٠٦م، ١٤٢٧هـ.

١٨- علوم الحديث، د. عبدالكريم زيدان ود. عبدالقهّار داود عبدالله، مطبعة عصام، بغداد، ط٢، ١٩٩٠م.

١٩- الغارة التنصيرية على أصالة القرآن الكريم، د . عبد الراضي محمد عبد المحسن، له ئەنتەرنێتەوە.

٢٠- القرآن الكريم والقراءة الحداثية، دراسة تحليلية نقدية لإشكالية النص عند محمد أركون، د. الحسن العبّاقي، دار صفحات للدراسات والنشر، سورية، ط١، ٢٠٠٩م.

٢١- الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، اشراف وتخطيط ومراجعة: د. مانع بن حمّاد الجهني، دار الندوة العالمية للطباعة والنشر والتوزيع، ط٥، ٢٠٠٣م، ١٤٢٤هـ.

٢٢- تأريخية الفكر العربي الإسلامي، محمد أركون، ترجمة: هاشم صالح، مركز الإنماء القومي والمركز الثقافي العربي، الدار البيضاء- المغرب ، ط٢، ١٩٩٦.

٢٣- مفهوم النص، دراسة في علوم القرآن، د. نصر حامد أبو زيد، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء- المغرب، ط٧، ٢٠٠٨.

٢٤- التفسير والمفسرون، د. محمد حسين الذهبى، دار الكتب الحديثة، ط٢، ١٩٧٦م، ١٣٩٦هـ.

٢٥- الشيعة في ميزان علماء الأمة، جمع وترتيب: سامي بن سالم السيد علي، الدار العالمية، مصر، الإسكندرية، ط١، ٢٠١٠م، ١٤٣١هـ.

٢٦- دراسة في مصطلح الحديث، إبراهيم النعمة، مطبعة الزهراء، الموصل، ط١، ١٩٨٥م، ١٤٠٥هـ.

٢٧- تأريخ القراءات والقُرّاء وجهودهم في القراءة والتأليف في القراءات وعلومها منذ العهد النبوي وحتى اليوم، د. محمود أحمد سعيد الأطرش، دار الإيمان، الإسكندرية، ط١، ٢٠١١م.

٢٨- المستنير في القراءات العشر، للإمام أبي طاهر أحمد بن علي بن عُبيدالله بن عمر بن سِوار البغدادي (ت٤٩٦ه)، تحقيق ودراسة الدكتور عمّار أمين الدّدو، دار البحوث والدراسات الإسلامية وإحياء التراث، الإمارات العربية المتحدة، ط١، ٢٠٠٥م، ١٤٢٦هـ.

٢٩- التذكرة في القراءات، أبو الحسن طاهر بن عبدالمنعم بن غَلبون، تحقيق ومراجعة الدكتور سعيد صالح زعيمة، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ٢٠٠١م، ١٤٢٢هـ.

٣٠- كتاب التيسير في القراءات السبع، الإمام أبو عمرو عثمان بن سعيد الدّاني، تصحيح أوتو ثرتزل، المعهد الألماني للأبحاث الشرقية، بيروت، ٢٠٠٩م.

٣١- شرح طيبة النشر في القراءات العشر، أبو القاسم محمد بن محمد بن محمد بن علي النويري، تحقيق: د. مجدي محمد سرور سعد باسلوم، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان، ط١، ٢٠٠٣م، ١٤٢٤هـ.

٣٢- قطر من غيث النفع في أصول وكلمات القراءات السبع، د. محمد نبهان بن حسين مصري، دار ابن حزم، بيروت، لبنان، ط١، ٢٠١٠م، ١٤٣١هـ.

٣٣- ميزان الإعتدال في نقد الرجال، أبو عبدالله محمد بن أحمد بن عثمان، تحقبق محمد البجاري، دار المعرفة للطباعة والنشر، بيروت. له ئەنتەرنێتەوە.




# ئاماژەکانی قورئان بۆ ڕەمسیسی دووەم
# وەك فیرعەونەکەی مووسا
# لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی

**فازڵ قەرەداغی**

**سەرەتای ١٤٣١ك – کۆتایی ٢٠١١ز**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

لێکۆڵینەوەکەمان دەربارەی ئەو فیرعەونەیە کە لە چیرۆکەکەی مووسادا هەیەو جێگەی مشتومڕێکی زۆر بووە لەنێوان لێکۆڵەرەوەکانی ڕۆژئاوا. مسوڵمانانیش بە هەمان شێوە لێی دواون، بەڵام لێکۆڵینەوەکانیان کەمترن‌و لاوازییان پێوە دیارەو بەشی زۆری ئەوەی بڵاودەبێتەوە، دووبارەکردنەوەی نووسینی لێکۆڵەرەوەی مسوڵمانی ترە. ئەهەمیەتی چیرۆکەکە لە لایەنە مێژووییەکەی دەرچووە، چونکە ئەساسی چیرۆکەکە مەسەلەیەکی ئاینییە، بۆیە سەلماندنی یان بەدرۆخستنەوەی، دەچێتە خانەی ململانەی ئاینییەوە، یان بەلای کەمەوە بانگەواز بۆ ئاین یان بۆ دژەکەی.

ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەو بۆچوونە بەهێز دەکات کە فیرعەونی مووسا بە ڕەمسیسی دووەم دەزانێت، بەڵگەی نوێش دەخاتە ڕوو. لەگەڵ ئەوەش دەرگا داناخات بەڕووی هەر ئیحتمالێکی تردا، چونکە هێشتا شتی زۆری ئەو مێژووە ونبوون و دیار نییە کەی دۆزینەوەی نوێ ئاشکرایان دەکەن. لەبەر ئەوەشە لێکۆڵینەوەکە سەرەتاییە، هەروەها لەبەر ئەوەی زۆری تر ماوە بوترێت، بەڵام لەبەر کەمیی کات و نزیکبوونەوەی وادەی کۆنگرەکە لەم سنوورە، وەستێنرا. بە هیوای ئەوەی لەدوای کۆنگرەکە فراوانتر بکرێت.* هەندێك بابەتیش لەبەر هەمان هۆ دەستیان لێ نەدرا، بۆ نموونە باسی ژنەکەی فیرعەون، لەکاتێکدا تەوەری تر

* ئەمەش کە ئێستا بڵاودەبێتەوە، هەر ئەوەی کۆنگرەیە لەگەڵ چەند ڕاستکردنەوە و دەستکارییەکی کەم، مەگەر فراوانکردنی نووسینەکە لە داهاتوو بێت.

وەك رێڕەوی دەرچوونی بەنو ئیسرائیل لە میسر، کەمێك پەیوەندیی کەمترە بە دەستنیشانکردنی فیرعەونەکە لەچاو بابەتەکانی تر.

لێکۆڵینەوەکە چەند بەشێکی لەخۆی گرتووە: بۆچوونەکان سەبارەت بە فیرعەونی مووسا، بەڵگەکان سەبارەت بە ڕەمسیسی دووەم، کە جگە لەوەی بەشێك بەم ناوە هەیە، بەشەکانی تریش خزمەت بە تەوەرەکەی دەکەن: ناوی فیرعەون، نیشانەکانی مووسا، باسی هامان، بینای خشت لە میسری کۆن... تاد.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەند بەڵگەیەك خراونەتە ڕوو کە بە بەڵگەی نوێیان دەزانین، هەروەها چەند بۆچوونێکی نوێ کە وای بۆ دەچین پێشتر نەخرابوونە ڕوو. بە پێویستیشمان زانی سەرەتا زۆر بە کورتی لەبارەی ڕێڕەوی لێکۆڵینەوە لە باسە مێژووییەکانی قورئان بدوێین.

## ڕێڕەوەی لێکۆڵینەوە لە باسە مێژووییەکانی قورئان

بۆ لێکۆڵینەوە لە باسە مێژووییەکانی قورئان، پێویستە لێکۆڵەرەوە بە زانیاریی زۆرەوە بۆچوونەکانی خۆی بخاتە ڕوو. ئەو هەڵەیەی نووسەرە عەلمانییەکان دەیکەن، ئیسلامییەکان بەشێوەیەکی تر دەیکەن. نووسەرە عەلمانییەکان بە بڕوایەکی یەقینییەوە دەستپێدەکەن کە قورئان کتێبی خودا نییە، بۆیە باسەکان هەڵگری ڕەخنەن، سەبارەت بە بەشێکی چیرۆکەکانی قورئانیش، لەو یەقینەوە دەستپێدەکەن کە پێغەمبەری ئیسلام ئەو چیرۆکانەی لە تەورات وەرگرتووە. نووسەرە ئیسلامییەکانیش لە سەرەتایەکی هەڵەوە دەستپێدەکەن، ئەویش بەزۆر سەپاندنی ئایەتەکانی قورئانە بەسەر زانیارییە مێژووییەکان و بەپێچەوانەوە.

ئایا سەرەتای یەکەمی نووسەری ئیسلامی، ئەویش باوەڕی تەواو بە قورئان، سەرەتایەکی زانستیی ڕاستە یان هەڵەیە؟ تێڕوانینی نووسەری ئیسلامی بۆ ڕێڕەوی زانستیی لێکۆڵینەوە ئەوەیە قورئان وەکو ڕاستی وەربگیرێت، بەڵام

جیاوازییەکە لە تێگەیشتنە لێی. لێرەش نووسەری ئیسلامی لەگەڵ خودی خۆی ڕێکە، بەڵام نووسەری عەلمانی کە دەیەوێت ڕێڕەوێکی زانستی پیادە بکات، کە پێویستی بە گومانە، لە باوەڕەوە دەستپێدەکات، کە لە سەرەوە باسمان کرد، واتە قورئان کتێبی ئاسمانی نییە و لەمەش لەگەڵ خودی خۆی ناڕێکە. نەهێشتنی ناڕێکییەکانیش کارێکی زۆر پێویستە بۆ لێکۆڵینەوە. کەواتە هەردوو نووسەری عەلمانی و ئیسلامی لە باوەڕەوە دەستپێدەکەن، بەڵام باوەڕی یەکەمیان ناڕێکە بە باوەڕەکانی تری، لەکاتێکدا ناڕێکی لە هەڵوێستی نووسەرە ئیسلامییەکە نییە. بەڵام وەنەبێت نووسەری ئیسلامی ناڕێکیی هەر نەبێت. ناڕێکییەکانی نووسەری ئیسلامی لەوەیە کە ئەوەی بۆچوونە یەکسانی دەکات بە بەڵگەی ئیعجاز و یەکسانی دەکات بە قورئان.

لە لێکۆڵینەوەکەش گرنگتر ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەیە کە پێویستی بەم شتانە هەیە، مەبەستیشمان لەو خاڵانەی خوارەوە زیاتر ئەوانەی باوەڕیان بە چیرۆکەکە هەیە:

١- لێکۆڵەرەوە ئامادە بێت هەندێك باوەڕی باو بخاتە ئەولاوە.

٢- بەپێی توانا دەستگیرکردنی زانیارییەکان.

٣- پەلەنەکردن لە ئیستنتاج.

٤- بۆچوونەکانی نووسەری تر وەکو بۆچوون وەربگرێت نەك وەك ڕاستی.

٥- بۆچوونەکان کوێرانە نەقڵ نەکات، بەڵکو تاقییان بکاتەوە.

٦- یەکسەر بڕیار لەسەر بۆچوونەکە نەدات کە ئەمە ئیعجازی قورئان دەسەلمێنێت، چونکە ئەگەر دواتر دەرکەوت زانیارییەکان یان بۆچوونەکان هەڵەن، بەشێوەیەکی خراپ بەسەر مەسەلەی ئیعجازدا دەشکێتەوە، جگە لەوەی خۆی تووشی سادەیی دەکات و لە دۆزینەوەی ڕاستییەکان دووریدەخاتەوە.



دەریای ناوەڕاست
الإسكندرية
دلتا النيل
أواريس
پر-رەمسیس
مصر السفلى
(الوجه البحرى)
هليوبوليس
القاهرة
الجيزة
منف
سقارة
دهشور
ميدوم
سيناء
الفيوم
تل العمارنة
الصحراء الشرقية
مصر العليا
(الوجه القبلى)
الصحراء الغربية
أبيدوس
دندرة
دەریای سوور
طيبة
الكرنك
الأقصر
نهر النيل
جزيرة الفيلة (ألفانتين)
أسوان
أبو سمبل
النوبة

## بەشی یەکەم:
## بۆچوونەکان سەبارەت بە فیرعەونەکەی مووسا

لە تەوراتدا دوو پادشا هەبوون، یەکەمیان بووەتە باو ناوبنرێت فیرعەونی چەوساندنەوە، کە چەوساندنەوەی ئیسرائیلییەکانی دەستپێکرد، چونکە بینی ژمارەی ئیسرائیلییەکان زیادی کردووە، لە میسرییەکان زۆرتر بوون و ئەگەر جەنگی دژی دوژمنێك ڕوویدات، ئەوان دەچنە پاڵیەوە. ئیتر کاری بیناسازیی بە سوخرە پێدەکردن (سیفری دەرچوون، ئیصحاحی یەکەم). فیرعەونی دووەمیش ناوی نراوە فیرعەونی دەرچوون، کە ئیسرائیلییەکان لە کاتی ئەودا لە میسر دەرچوون. سیفری دەرچوون باسی مردنی ئەو فیرعەونە لەو کاتەی مووسا لە (میدیەن) بوو، دەکات (٢٣/٢). لە قورئانیشدا باسی لەو جۆرەی تێدا نییە، بەڵکو وا تێدەگەین فیرعەون یەك فیرعەونە.

چەند بۆچوونێك سەبارەت بەو دوو فیرعەونە هەن، تەرکیزیش لەسەر فیرعەونی دەرچوون دەکرێت، چونکە وردەکاریی تایبەت بەو زۆرترن. لە ڕێگەی دۆزینەوەی ئەو فیرعەونەشەوە فیرعەونی چەوساندنەوە دەدۆزرێتەوە. بۆچوونەکانیش بە کورتی: فیرعەونی مووسا ئەحموسی یەکەم بوو، کە هیکسۆسی لە میسر دەرکرد، فیرعەونی چەوساندنەوە ئەحموسە و دەرچوون تحوتمسی یەکەمە، تحوتمسی دووەم فیرعەونی چەوساندنەویە، تحوتمسی سێیەم، ئامنحوتپی دووەم[١]، ئەخناتوون،[٢] توت عنخ ئامون، حور–م–حب فیرعەونی

---

[١] جگە (دانیال رۆپس) کە د. راشد البدراوي ناوی دەبات، کەسانی تر ئەوەیان وتووە، وەك ئەو دوانەی خوارەوە کە لێکۆڵەرەوەی کتێبی پیرۆزن لەو دوو بابەتەی خوارەوەیان:

Douglas Petrovich, Amenhotep II And The Historicity of the Exodus-Pharaoh.

Thomas L. Constable, Notes on Exodus.

چەوساندنەوەیەو مرنپتاح فیرعەونی دەرچوونە، رەمسیسی دووەم فیرعەونی چەوساندنەوە و دەرچوونە، رەمسیسی دووەم فیرعەونی چەوساندنەوەیەو مرنپتاح فیرعەونی دەرچوونە.[3] لە خوارەوەش هەندێك موناقەشە دەخەینە ڕوو.

جیاوازیی بۆچوونەکان دەگەڕێتەوە بۆ چەند کێشەیەك لە دەقە تەوراتییەکەدا، بە تایبەتی بە بەراورد لەگەڵ زانیارییە مێژووییەکان. ئێمە لێرە ئەوە پەسەند دەکەین کە فیرعەونەکان یەکن و بریتین لە ڕەمسیسی دووەم، ئەمەش کە بۆچوونی زۆربەی کەسانی ترە. هەرچەندە ئەوانەی پشت بە تەورات دەبەستن، باس لە دوو فیرعەون دەکەن و رەمسیسی دووەم دەکەنە فیرعەونی چەوساندنەوە.

یەك لەو شتانەی پەسەندی دەکەن، کە ڕووداوەکان لە سەردەمی رەمسیسی دووەم بووبن، ناوبردنی شاری رەعمسیسە لە باسی هەڵهاتنی ئیسرائیلییەکان،[4] بەپێی سیفری یەکەمی پادشایان (ئیصحاحی ٦ ئایەتی) دەرچوون ٤٨٠ ساڵ بوو پێش ساڵی چوارەمی سولەیمانی پێغەمبەر (کە لە تەورات پادشایە). بەپێی مامۆستایەکی کتێبی پیرۆز، بە ئەکیدی ئەو ساڵە چوارەمەی سولەیمان، ساڵی ٩٦٧ی پێش زاین بوو و ئەوە لەگەڵ سفری قازییەکان (٢٦/١١) گونجاوە کە ٣٠٠ ساڵ لەنێوان چوونە ناو کەنعان و سەرەتای فەرمانڕەوایی یەفتاحی قازی.[5] بەڵام

---

[2] د. راشد البدراوي ئەو بۆچوونە سەیرە بۆ مامۆستایەکی میسری دەگەڕێنێتەوە: د. راشد البدراوي، موسى وهارون، ص ٦٦٤-٦٦٥، بەڵام لە ڕۆژئاواش کەس هەبووە دەرچوونی خستبێتە سەردەمی ئەخناتون و جێنشینەکانی، بڕوانە:

W. Max Müller, Pharaoh, In; Encyclopaedia Biblica, Vol 3, 3688.

[3] د. راشد البدراوي، موسى وهارون، ص ٦٦٠ فما بعد. نووسەر بەڵگەکانی ئەو کەسانە دەهێنێتەوە لەگەڵ وەڵامەکانیان. وەك چۆنیش بەڵگەکان مەرج نییە تەواو بن، مەرجیش نییە وەڵامەکانی ئەو بەڵگانەش تەواو بن. نووسەری کتێبەکە رەمسیسی دووەم پەسەند دەکات.

[4] Thomas L. Constable, Notes on Exodus, p.67.

[5] Ibid.

ئەمە دەرچوون دەکاتە ساڵی١٤٤٧ و ناگونجێت لەگەڵ مێژووی ١٢٩٠ بۆ دەرچوون کە بەپێی مامۆستایەکی کتێبی پیرۆز، زۆربەی لیبراڵییەکان و زۆر لە ئیڤانجیلییەکان باوەڕیان وایە.[٦] چارەسەرێکی ئەوە، ئەوەیە ٤٨٠ ساڵەکە وەکو ژمارەیەکی رەمزی تەماشا بکرێت و لێکدانەوەی بۆ بکرێت، کە یەك لەوانە دانانی تەمەنی هەر نەوەیەکە بە بیست ساڵ[٧] . رێدفۆرد کە ڕەخنەگرە لە باسەکانی تەورات، باسی ئەو چارەسەرانە دەکات و بە فێڵ ناویان دەبات، کە بڵاوترینیان ئەوەیە کاتەکە بکرێتە چەند نەوەیەك، بۆیە ژمارەی ٤٨٠ ساڵ، واتە ١٢ نەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی تەمەنی چل ساڵ بۆ هەر نەوەیەك زۆرە، ژمارەی بیست نزیکترە لە تێکڕا، بۆیە ٤٨٠ ساڵەکە دەبێتە نیوەو بەم جۆرە دەرچوون دەکەوێتە ساڵی ١٢٥٥ پ.ز لەجیاتی ١٤٨٦. رێدفۆرد بە گاڵتەجاڕییەوە دەڵێت کە چەند سەیرە ئەو کاتە سەردەمی رەمسیسی دووەمەو ناوبردنی شاری رەعمسیس لە سیفری دەرچوون جوان سازێنرا[٨].

دەستنیشانکردنی سەردەمی رەمسیسی دووەم و مرنپتاح، کێشەی ئەوە چارەسەر دەکات کە دەقە میسرییەکان باسی ئیسرائیلییەکانی نەکردووە پێش ئەو سەردەمە. هەروەها کاتی رەمسیسی دووەم و یەکەم جار ناویان براوە لە میلەکەی مرنپتاح کوڕ و جێنشینی رەمسیسی دووەم بوو، کە باسی ساڵی پینجەمی فەرمانڕەواییەکەی دەکات، ئەویش هەرچەندە یەکدەنگی نییە لەبارەی ئەوەی ئەو ناوەی لە میلەکەدا هاتووە مەبەست لێی ئیسرائیلییەکان بووبێت.

---

[6] Ibid.

[٧] بڕوانە:

Douglas Petrovich, Amenhotep II And The Historicity of the Exodus-Pharaoh, p.85.

[٨] دونالد ريدفورد، مصر وكنعان واسرائيل في العصور القديمة، ص٣٩٤. بۆ موناقەشەی بەڵگەکانی تەورات، بڕوانە لاپەڕە ٣٩١ بەدواوە.

(کیتچن) بە پێچەوانەی ئەوانی تر، مرنپتاح ناخاتە ناو وێنەکەوە، بەڵکو دەرچوون دەخاتە کاتی رەمسیسی دووەم. ئەو دەڵێت کە بە پشتبەستن بە میلەکەی مرنپتاح و بە حسابکردنی تەمەنی نەوەیەك کە چل ساڵە بۆ دەرچوون لە نیلەوە بۆ ئوردون و ئەگەر حساب بۆ نیو سەدە بکرێت، دەتوانرێت ماوەیەك بۆ دەرچوونی ئیسرائیلییەکان لە میسر دابنرێت لەنێوان ساڵی ١٥ و ساڵی ٢٥ی رەمسیسی دووەم.[9] بەپێی (نیکۆلا گریمال)یش نیوە یەکدەنگییەك هەیە (باسی ساڵی ١٩٨٨ دەکات) لەسەر ئەوەی دەرچوون لە سەردەمی مرنپتاح بووەو لەوە کۆنتر نییە.[10]

ئەمانە چەند نموونەی کەمن لەسەر موناقەشە هەرە زۆرەکانی دەرچوون و دەستنیشانکردنی فیرعەونەکە، لێرە تەرکیز لەسەر رەمسیسی دووەم دەکەین کە بە بۆچوونی خۆمان پاڵێوراوی یەکەمە. بە پشتبەستنیش بە قورئان، تەنها یەك فیرعەون هەیە نەك دوو فیرعەون، هی چەوساندنەوە و هی دەرچوون: مەرج نییە کە بە ڕواڵەت باسی یەك فیرعەون لە قورئاندا کرا ئیتر پێویستە یەکسەر باوەڕ بکەین کە هەر یەك فیرعەون بووە، بۆیە پێویستە ورد لە ئایەتەکان بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بزانین ئاماژەکان بۆ یەك فیرعەونی، سەد لە سەد تەواون یان نا. ڕاستەکەشی ئەوەیە ئاماژەکان ئاشکران کە یەك فیرعەون بووە، چونکە سەبارەت بە هەڵگرتنەوەی مووسا لە ئاوەکە باسی ژنەکەی فیرعەون کراوە (وقالت امرأت فرعون قرّت عين لي ولك لا تقتلوه عسى أن ينفعنا أو نتخذه ولدا وهم لا يشعرون- القصص/٩)، دواتریش باسی ژنی فیرعەون کراوە کە باوەڕی هێناوە (وضرب الله مثلا للذين آمنوا امرأة فرعون إذ قالت رب ابن لي عندك بيتا في الجنة ونجني من فرعون وعمله ونجني من القوم الظالمين-التحريم/١١). ئاماژەکەش بە ڕواڵەت بۆ یەك

---

[9] Kenneth A. Kitchen, Pharaoh Ramesses II and his Times, p.772.

[10] نيقولا جريمال، تاريخ مصر القديمة، ص ٣٣٨.

ئافرەتە، هەرچەندە وەك ئاشكرایە ناتوانرێت سەد لە سەد بە ئەكید وەربگیرێت. لەم لێكۆڵینەوەیەش دوو ئافرەتەكە بە یەك كەس دەزانین، بێئەوەی دەرگای ئیحتمالەكەی تر دابخەین. ڕەنگە سەرەتای سوورەتی (القصص) وەك بەڵگەی ئاشكرا لەسەر ئەوەی باس لە یەك فیرعەون كراوە، تەماشا بكرێت، بەڵام لە پاڵ ئاشكراییەكەیدا هێشتا بەڵگەی بێگومان نییە، چونكە سەرەتای سوورەتەكە باسی حاڵەتی چەوساندنەوە دەكات، ترسیش لەوەی مووسای منداڵ بكوژرێت، مەرج نییە تەنها لە سەردەمی یەك فیرعەوندا بووبێت. هەروەها دەكرێت لەدایكبوونی مووسا لە كۆتایی فەرمانڕەوایی سێتیی یەكەم، باوكی رەمسیسی دووەم بووبێت، كە لەو ماوەیە كردبوویە شەریكی فەرمانڕەواییەكەی، بەتایبەتیش لە ساڵانی كۆتایی فەرمانڕەوایی سێتیی یەكەم كە رەمسیس بووە لاو و ژنی هەبووە. ئایەتەكەی سوورەتی (الشعراء)یش بەڵگە نییە كە ئەو فیرعەونەی هەڵیگرتەوە هەر ئەو فیرعەونەی دواتر بووە: (قال ألم نربك فينا وليدًا ولبثت فينا من عمرك سنين-الشعراء/١٨)، چونكە قسەكە بەشێوەی كۆ وتراوە (فينا) كە دەكرێت مەبەست لە بنەماڵەكە بێت. لەبەر ئەوە پەسەندكردنی ئەوەی فیرعەونەكە یەك فیرعەون بووبێت، نابێت دەرگای ئحتمالەكەی تر دابخات كە لەوانەیە دوو فیرعەون بن، بەڵام بێئەوەی خۆمان بە گێڕانەوە تەوراتییەكەوە ببەستینەوە كە فیرعەونی یەكەم تا ئەو كاتە مابوو كە مووسا لە میدیەن بوو، هەروەها بێئەوەی خۆمان ببەستینەوە بە تەمەنی مووسا لە تەورات كاتێك چووە لای فیرعەون، كە تەورات تەمەنی هەشتا ساڵی بۆ دادەنێت (دەرچوون: ٧/٧).

بەڵگەكانیشمان سەبارەت بە فیرعەونی مووسا، كە رەمسیسی دووەم بووە، لە بەشەكانی تر دەخەینە ڕوو.

## بەشی دووەم:
## نـاوی فیرعـــەون

ناوی فیرعەونەکەی مووسا لە قورئاندا وەك (فیرعەون) هاتووە، لە تەوراتیش (پرعە) פַּרְעֹה بە عیبریی کۆنیش: 𐤐𐤓𐤏𐤄 . لە هەردووکیشیان وەکو ناوی کەسێك نەك نازناو (بە واتای پادشا) هاتووە، بەڵام بەکارهێنانی تەعبیری وەك: فیرعەون، پادشای میسر مەیلێك پیشان دەدات کە وشەکە وەکو ناوێکی تایبەتی لێ بێت.[11] وشەکە لە میسری ئەمەیە: (پر–عئـ) pr-aA . پر–عا، کە لەناو نووسەران باوە لەفزی تەواو نییە، چونکە هێمای (عا) بەم جۆرە دەخوێنرێتەوە [12] کە هێمای دووەم دەستنیشانی دەکات چۆن دەنگی دووەمی هێمای یەکەم (هێمای دوو دەنگی) دەخوێنرێتەوە، واتە (عئـ) چونکە وەکو هەمزەی عەرەبی دەخوێنرێتەوە. هەروەها بڕگەی یەکەم لە هیرۆگلیفی (پر)ـەو بزوێنی نێوان دوو دەنگەکە دیار نییە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی میسرناسەکان وەکو وشەکانی تر بزوێنی بۆ دادەنێن‌و[13] دەیکەن بە per.

واتای حەرفیی وشەکە (خانووی گەورە)یە واتە کۆشك، بەڵام دواتر بۆ پادشا بەکارهات.

وشەی باوی (پادشا) بریتییە لە نسو nsw ، لەوەش کەمتر وشەی ئتی ity ، ناونانێکی بڵاوی تر وشەی (ئاغا)یە nb [14] (کە ئەمە نزیکە لە وشەی

---

[11] W. Max Müller, Pharaoh, in; Encyclopaedia Biblica, Vol. 3, 3687.

[12] E. A. Wallis Budge, An Egyptian Hieroglyphic Dictionary, Vol.1, p.cxxxviii.

[13] بۆ چۆنێتیی زیادکردنی بزوێنەکان، بڕوانە:

M. Collier, B. Manley, How to Read Egyptian Hieroglyphs, p.4.

[14] Alan Gardiner, Egyptian Grammar, p.75.

"رب"ی عەرەبی) بەڵام لە کاتی پادشانشینی کۆن (بنەماڵەی چوارەم بەدواوە)[15] پر–عئـ pr-aA، واتە خانووی گەورە، دەبینین لە چەندین تەعبیر بەکارهاتووە، وەك تەعبیری سمر پر–عئـ smr pr-aA واتە یاوەری خانووی گەورە و ئاشکرایە ئاماژەیە بۆ کۆشك نەك بۆ پادشاکە.[16]

لە کۆتایی بنەماڵەی دوانزەیەم بەدواوە ئەم تەعبیرە دەنووسرا: خانووی گەورە، با بژی و خۆشگوزەران بێت و تەندروست بێت pr-aA anx wDA snb کە ئەمەی دوایی فۆرمێکی بڵاوی ئاواتخواستنە (هەروەکو وتەی مسوڵمانان کە ناوی موحەممەدی پێغەمبەر یان هەر پێغەمبەرێکی تر دەبەن و دەڵێن دروودی خودای لێ بێت[17])، بەڵام هێشتا هەر مەبەست تەنها لە کۆشکە.[18] یەکەم نموونەش بۆ بەکارهێنانی وشەکە بۆ خودی پادشا کاتی ئەخناتوونە (بنەماڵەی هەژدەیەم) کە بەم جۆرە قسەی لەگەڵ کراوە: فیرعەون، ژیان و خۆشگوزەرانی و تەندروستیت هەبێت، ئاغاکە.[19] (نۆبلکور) یەکەم بەکارهێنانی پر–عئـ بە واتای ناسراوی فیرعەونی بۆ ساڵی دوانزەیەمینی فەرمانڕەوایی هاوبەشی حەتشپسوت و تحوتمسی سێیەمی برازای دەگەڕێنێتەوە.[20]

---

[15] W. Max Müller, op. cit.

[16] Alan Gardiner, Egyptian Grammar, p.75.

[17] Shawn C. Knight, Egyptian Writing Systems and Grammar, p.10.

[18] Alan Gardiner, Egyptian Grammar, p.75.

[19] Ibid.

[20] ئەمە لە کتێبێکی تری نۆبلکور، کە لام نییە، بە ناوی La reine mystérieuse لاپەڕە ١٣٤. ئەم زانیارییەش لە:

http://fr.wikipedia.org/wiki/Pharaon

ویکیپیدیا سەرچاوەیەکە بۆ زانیاری کە ناتوانرێت پشتی تەواوی پێ ببەسترێت و پێویستە هەر کەسێك زانیاریی لێ وەربگرێت، بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی ناویان لەو بابەتەدا هاتووە.

تەعبیری pr-aA وەکو قسەی ئەمڕۆمان کە دەڵێین (کۆشکی سپی ڕایگەیاند)و مەبەستمان (سەرۆکی ئەمەریکی یان کەسێکی ستافی سەرۆك ڕایگەیاند).[٢١]

لە بنەماڵەی نۆزدەش بەدواوە ئەوە دەخوێنینەوە: (فیرعەون پێشڕەویی کرد)، (فیرعەون وتی)... تاد، بە واتایەکی تر بوو نازناوێکی ڕێز بۆ پادشا هەروەك نازناوی (الباب العالی)ی حکومەتی عوسمانی، دوایەمین گۆڕانکاریی نازناوەکەش ئەوە بوو بۆ ناوە تایبەتییەکانی فیرعەونەکان زیادکرا: وەك فیرعەون فلانکەس، یەکەم بەکارهێنانی لەو شێوەیەش کاتی یەکێك لەو پادشایانە بوو کە بە ناوی (شۆشینق)ـەوە لە بنەماڵەی ٢٢ فەرمانڕەواییان کرد.[٢٢] جێگەی تێبینییە کە تا سەدەی پێنجەمی زاینیش و لە نووسینێك دەربارەی نووسینی هیرۆگلیفی، هەمان تەعبیر بە یۆنانی οικος μέγας، واتە خانووی گەورە، واتای پادشای هەبووە.[٢٣]

موفەسسیرەکانی قورئان زوو زانیویانە کە فیرعەون نازناوە بۆ پادشایانی کۆنی میسر. بۆ نموونە ئیبنو کەسیر دەڵێت: فیرعەون ناوی هەر پادشایەکی کافری میسرە لە سەردەمی عەمالیق، وەك چۆن (کیسرا) نازناوی پادشاکانی فارسە و قەیسەر نازناوی ئەوانەیە کە فەرمانڕەوایی ڕۆم و شامیان کردبوو... تاد (تفسیر القران العظیم، سورة البقرة، تفسیر الایة ٤٩). ئەو قسانەش دەگێڕێتەوە کە گوایە ناوی فیرعەون (الولید کوڕی مصعب کوڕی الریان)ـە یان (مصعب کوڕی الریان) و کونیەکەی (ابو مرة)یەو ئەسڵەکەی فارسە لە شاری (اصطخر).

---

[21] Shawn C. Knight, Egyptian Writing Systems and Grammar, p.9.

[22] Alan Gardiner, Egyptian Grammar, p.75.

[23] W. Max Müller, Pharaoh, ibid.

بە کورتی، قۆناغەکانی وشەی فیرعەون ئاشکرای دەکات کە بەکارهێنانی وشەکە لە قورئان و تەورات وەکو ناوی کەسێك، جێگەی ڕەخنە نییە، چونکە لە سەردەمی رەمسیسی دووەم دەکرا پادشا بەو ناوە بانگبکرایە وەك چۆن ناوی شەخسی بێت. جێگەی تێبینیشە کە هاوشێوەی ئەوە هەیە لە فەرموودەکان، کاتێك هەردوو کیسرا و قەیسەر وەکو ناوی کەسیی بەکارهاتوون هەرچەندە عەرەبی ئەو کاتە دەیانزانی کیسرا و قەیسەر نازناون بۆ پادشای فارس و ئیمپراتۆری بیزەنتییەکان.

موفەسسیرە کۆنەکانیش هەرچەندە لە بەشێکی تەفسیری ناوەکە پێکاویانە، بەڵام ئەوەیان نەزانیبوو کە وشەکە لە نازناو زیاتر بوو، ئەویش وەك باسمان کرد لە ئەخناتوون بەدواوە، ئەگەر کۆنتر نەبێت. بەڵام سەبارەت بە ناوە شەخسییەکەی فیرعەون، ئەو بۆچوونانە وەك ئاشکرایە زۆر لە ڕاستییەوە دوورن. جێگەی تێبینیشە کە بەکارهێنانی ناوی (الولید) ئاماژەیە بۆ دوو کەس، یەکەمیان (الولید کوڕی المغیرە) کە یەکێك بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی پێغەمبەر، دووەمیشیان (الولید کوڕی عبدالملك)ی ئەمەوی کە یەکێکە لە خەلیفە هەرە ستەمکارەکانی بەنو ئومەییە، ڕەنگە لەبەر ئەو دوانە ڕەخنەی یەکێك لە سەلەف هەیە دەربارەی ناونانی کەسێك بەوەی کە ((ناوی جەببارەکانتان بۆ هەڵبژاردووە)).

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە و لێرە تەنها وەك تێبینی باسی بکەین، ئەوەیە ناوی الولید (واتە: لەدایکبوو یاخود منداڵی تازە لەدایکبوو) لە ناوی لەدایکبوونی رەمسیس هەیە:



(رع–مس–سو مری–ئمن)، واتە (رەع ئەوی بوو، خۆشەویستی ئامون)، ئەو ناوەش لەناو خەرتووش (قاوغ لەو جۆرەی لە نووسینەکەی سەرەوە دیارە) دەنووسرێت، کە بۆ

پادشایان بەکاردێت. پێش ناوەکە ئەمە هەیە: (کوڕی رع) کە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو ناوە لەگەڵ لەدایکبوون پێی دراوە، بەڵام ئەمە تەنها ڕێکەوتە.

# بەشی سێیەم:
# بەڵگەکانی رەمسیسی دووەم

دەستنیشانکردنی رەمسیسی دووەم وەك فیرعەونی كاتی مووسا بەهۆی چەند شتێکەوەیە:

**یەکەم: باسکردنی ئیسرائیلییەکان لە دەقە فیرعەونییەکان.**

بێدەنگیی بەڵگەنامەکانی فیرعەونی سەبارەت بە ئیسرائیلییەکان لای هەندێك کەس، بووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی باسەکانی تەورات سەبارەت بە چوونی یەعقووب و کوڕەکانی بۆ میسر و بەسەرهاتەکانی یووسف و زیادبوونی ژمارەی ئیسرائیلییەکان لە میسر و ئەو ڕووداوە گەورانەی بەسەر میسر هاتبوون وەك (لافاو، خوێن، هێرشی کوللە... تاد) و پاشان تێکچوونی لەشکری فیرعەن لە دەریا، هیچیان لە دەقە میسرییەکان باسیان نەکراوە. بە کورتی ئەوانەی ئامادە نەبوون باوەڕ بە تەورات بکەن، سەرجەم هەبوونی بەنو ئیسرائیلیان لە میسر، وەك چیرۆك تەماشا دەکرد. بەنو ئیسرائیل تەنانەت بە ناویش لە دەقە میسرییەکاندا نەدەبینران، تا ساڵی ١٨٩٦ کاتێك میلێك، کە ناوی (میلەکەی ئیسرائیل)ی لێ نرا و هی مرنپتاحی کوڕی رەمسیسی دووەمە، دۆزرایەوەو ناوێکی لەسەر بوو لە ناوی ئیسرائیلەوە نزیکە، بەڵام ئێستاش هەمان کێشە کۆنەکان ماونەتەوە.

هەڵوێستێکی لەوە نەرمتر بەرامبەر بە بێدەنگیی بەڵگەنامەکانی فیرعەونی ئەوەیە ئەو هەبوونە و ئەو ڕووداوانە بۆ ڕووداوی بچووك، بچووکبکرێنەوە، وەك هەڵهاتنی هەندێ خەڵکی ئاسیایی یان هەڵهاتنی (عابیرو) لە میسر.

بەشێك لەوانەی باوەڕیان بەو ڕووداوانەی تەورات هەیە، ناچارن کاتی دەرچوون لەجیاتی سەدەی پانزەیەمی پێش زاین (بەپێی دیاریکردنی ٤٣٠ ساڵ لە تەورات بۆ مانەوەی ئیسرائیلییەکان لە میسر) (دەرچوون: ٤٠/١٢) بکەنە کاتی رەمسیسی دووەم و مرنپتاحی کوڕی، بۆ ئەوەی لەگەڵ ناوبردنی ئیسرائیل لە

میلەکەی مرنپتاح بگونجێت، کە لە هەمان کاتدا لەگەڵ ناوبردنی شاری ڕەعمسیس لە باسی دەرچوون بگونجێت.[٢٤] بەڵام سەبارەت بە لێکۆڵینەوەیەك پشت بە قورئان ببەستێت، ئەمەیان کێشە نییە، چونکە قورئان باسی ماوەی مانەوەی ئیسرائیلییەکان لە میسر ناکات.

ماوەیەکی زۆریش بوو باسی ئەو مەسەلانە پشتی بە سەرچاوە مێژووییەکان و دەستکەوتەکانی ناو خودی میسر دەبەست، بەڵام دواتر پشکنینی شوێنەواری لە فەڵەستین و دەوروبەری کراو کێشەی نوێتر هاتنە پێشەوە. پشکنینەکان دەریانخست کە ئەگەر کاتی دەرچوون زووتر دابنرێت، هەروەك سەدەی پانزەیەمی پێش زاینی، ئەو کاتە باسەکانی تەورات لەگەڵ واقیعی ناوچەکە ناگونجێن.

تەورات باسی گرتنی شارەکان و وێرانکردنیان لەلایەن یۆشع (جێنشینەکەی مووسا)وە دەکات، بەڵام پشکنینی شوێنەواریی دەریخست ئەو شارانە وەزعێکی تریان هەبووە: شارەکانی ئەریحا و یەرموت و عای.. خراپ وێرانکرابوون، بەڵام ئەوە لە چەرخی نوێی برۆنزی، یان کۆتایی چەرخی ناوەڕاستی برۆنزی بوو (واتە دەوروبەری ١٦٠٠ پ.ز)، شاری تریش وەك جەبعون و قادش بەرنیع...تاد، نیشتەجێی تێدا نەبووە تا چەرخی ئاسنین (دەوروبەری ١٢٠٠پ.ز)، وەك رێدفۆردیش، کە ڕەخنەگرێکی سەختە لە باسەکانی تەورات، دەڵێت کە دەکرێت بێ ئالۆزی ئەو وێرانییە گشتگیرەی کاتی گۆڕانی چەرخی برۆنزی بۆ چەرخی ئاسنیی دەوروبەری ١٢٠٠ پێش زاین تووشی هەندێك شوێن بووە، بۆ پەلامارەکەی

---

[٢٤] ئەوانەی ئەوە بە ڕەخنە لە دانانی سەردەمی پێش ڕەمسیس بۆ دەرچوون دەزانن، دەڵێن ئەو کاتە شارەکە نەبووە، بەڵام ئەوە کێشەیەکی گەورە نییە، چونکە ئەوانەی سوورن لەسەر ئەوەی دەرچوون کۆنتر بووە، دەڵێن تەورات دواتر نووسرابووەوە و ناوی شوێنەکانی ئەو کاتەی بەکارهێناوە.

(گەلانی دەریا) بگەڕێنینەوە.[25] ئەو باسانەش کاتێك دەبنە کێشە ئەگەر بڕوا بە گێڕانەوەکانی ناو تەورات سەبارەت بە وێرانکردنی ئەو شارانە لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە، بکەین، بۆ نموونە باسی گرتنی ئەریحا کە: وەکو ڕێز بۆ خودا هەموو خەڵکەکەیان کوشت لە پیاو و ئافرەت و منداڵ و پیر و تەنانەت ئاژەڵەکانیش (يشوع: ٦/٢١) و شارەکەیان سووتاند (٦/٢٤). هەروەها کوشتنی هەموو خەڵکی شاری (عای)، بەڵام بۆ ئەمەیان ئاژەڵەکانیان وەکو دەستکەوت برد (يشوع: ٨)[26]. هەروەها ئەوانەی سەرەوە کێشە دەبن ئەگەر یوشع زۆر پێش ١٢٠٠پ.ز دەستی بە شەڕەکانی کردبێت.

بە هەمان شێوەش دەسەڵاتی میسر بەسەر کەنعاندا لە هەموو سەردەمی نوێی برۆنزی (سەدەی شانزە تا دەوروبەری ١٢٠٠ پێش زاین) توند بوو، کە ئەو کاتەیە گوایە یوشع، بەپێی مێژووی کۆنتری دەرچوون، چالاکیی سەربازیی دەنواند.[27] کە ئەمەش دیسان کێشە نییە بۆ مێژووی نوێتری دەرچوون، کە دەیخاتە کۆتایی سەردەمی ڕەمسیسی دووەم یان دواتر.

وەزعی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئوردون و بەراوردیان لەگەڵ بەسەرهاتەکانی دەرچوون و گرتنی کەنعان، وا دەخوازێت کە دەرچوون پێش ڕەمسیسی دووەم

---

[25] دونالد ريدفورد، مصر وكنعان واسرائيل في العصور القديمة، ص٤٠١. گەلانی دەریا، ئەو گەلانە بوون لە هەزارەی دووەمی پێش زاین لە ڕێگەی دەریای ناوەڕاستەوە پەلاماری میسر و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەو دەریایەیان داو توانییان لەو ناوچانەی دوایی نیشتەجێ بن. (پیلیست)ـەکان یەکێك لەو گەلانە بوون و ناوی فەلەستین لەوانەوە هاتووە.

[26] هەرچەندە لە سیفری (تثنية) گوایە خودا بە مووسای وتووە گەلانی زۆر دوور ئەگەر نەچوونە ژێر دەسەڵاتتانەوە، پیاوەکانیان بکوژن و ژنەکان و منداڵەکان و شتەکانیان دەبنە موڵکتان، بەڵام میللەتانی نزیکتان: حیتییەکان و ئامورییەکان و کەنعانییەکان.. تاد کەسیان بە زیندوویی مەهێڵنەوە (التثنية:٢٠/ ١٢-١٧)

[27] دونالد ريدفورد، مصر وكنعان واسرائيل في العصور القديمة، ص٤٠١.

نەبووە، چونکە کاتێك ئیسرائیلییەکان لەگەڵ مووسا چوونە ڕۆژهەڵاتی ئوردون، بەرەو ڕووی (ئەدۆم) و (موئاب) بوونەوە، پشکنینە شوێنەوارییەکانی ساڵی ١٩٣٠ ش وایان دەرخستووە کە ناوچەکانی ئەدۆم و موئاب لە دەوروبەری ساڵی ٢٠٠٠ پ.ز تا سەدەی ١٣ پ.ز نیشتەجێی لێ نەبووە، کەواتە نابێت دەرچوون پێش سەدەی ١٣ پ.ز بووبێت، هەرچەندە پشکنینی نوێتر لە بەشی باشووری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری ئوردون گومانی خستووەتەوە ئەوەی نەبوونی نیشتەجێ بوون بەو شێوە گەورەیە بووبێت، یان دەرکەوتنی گوندەکانی لە سەدەی ١٣ بەو کتوپڕییە بووبێت.[٢٨] بەڵام دیارە هێشتا ئەوە بایی ئەوە نییە ناوچەکە بەو چڕییەی دانیشتوانی تێدا بێت کە لە باسەکانی تەورات هاتووە. بۆیە ناوبردنی ئیسرائیل لە میلەکەی مرنپتاح (میلەکەی ئیسرائیل) بۆ ئەو کاتە گونجاوە. کێشەیەکیش هەیە ئەویش میلەکەی مرنپتاح ئەو بۆچوونە لاواز دەکات کە ڕەمسیسی دووەم فیرعەونی چەوساندنەوەیەو مرنپتاحی کوڕی فیرعەونی دەرچوونە، چونکە بەپێی میلەکەی مرنپتاح، بەنو ئیسرائیل پێش ساڵی پێنجەمی حوکمی لە فەڵەستین بوون، لەکاتێکدا تەورات دەڵێت کە ئەو فیرعەونە خنکا، بە واتایەکی تر ئەگەر مرنپتاح فیرعەونی دەرچوون بووبێت، پێویستە کاتی شوێنکەوتی ئیسرائیلییەکان، لە دەریای سوور خنکابێت، ئیتر ناکرێت مرنپتاح پێش ئەوە بە چەند ساڵێك باس بکات کە ئیسرائیلییەکان لە فەڵەستین بوون.

چارەسەرێکی ئەوە بریتییە لەوەی بوترێت کە فیرعەونی دەرچوون لەگەڵ لەشکرەکەی نەخنکا، هێندەی بزانین بۆچوونی وا بۆ مرنپتاح نییە، بەڵام بۆ فیرعەونێکی بنەماڵەی پێشتر، بنەماڵەی هەژدەیەم، ئەویش ئامنحوتپی دووەم کە لەدوایی باسی دەکەین، ئەوەش پەیوەندیی نییە بە کێشەی هەبوونی ناوی ئیسرائیل لە میلەکەی مرنپتاح. سەبارەت بە لێکدانەوەی قورئان ئەمە کێشە نییە،

---

[28] Miller and Hayes, A History of Ancient Israel and Judah, p.71.

چونکه ڕواڵەتی ئایەتەکان باسی یەك فیرعەون دەکات، واتە دەکرێت ڕەمسیسی دووەم بە فیرعەونی هەردوو چەوساندنەوە و دەرچوون دابنێین و ئەو کاتە میلەکەی مرنپتاح نەك تەنها کێشە نابێت، بەڵکو بەڵگەشە.

ڕێکخستنەوەی ڕووداوەکانیش بە بڕوای خۆمان بەم جۆرە دەبێت:

ئەگەر ساڵێکی دیاریکراوی فەرمانڕەوایی ڕەمسیسی دووەم وەربگرین بۆ دەرچوون (بڕوانە دواتر بۆ بۆچوونەکەمان کە فیرعەون لەو ڕووداوە تێدانەچووبوو)، ئەویش ساڵی پەنجایەمی فەرمانڕەوایی بێت (کە ساڵی مردنی ڕەمسیسی کوڕی کە سەرکردەی گشتی بوو)، واتە ئەگەر ماوەی فەرمانڕوایی دەوروبەری ١٢٧٩-١٢١٣[٢٩] بۆ ڕەمسیسی دووەم وەربگرین، ساڵی پەنجایەمین دەکاتە دەوروبەری ساڵی ١٢٣٠پ.ز، سەرەتای چل ساڵ ونبوونەکەی ئیسرائیلییەکان ساڵی ١٢٣١ بوو (بە حسابکردنی ٤١ ساڵ، چونکە بڕیاری ونبوونیان لە ساڵی دووەمی دەرچوون بوو)[٣٠] و کۆتایی ونبوونەکە دەمانگەیەنێتە دەوروبەری ساڵی ١١٩٠ پ.ز، واتە ونبوونەکە لە ساڵی ٥١ ـەمی ڕەمسیس تا سیانزە ساڵ دوای مردنی ڕەمسیس، کە دەکاتە سێ ساڵ دوای مردنی مرنپتاح. میلەکەی مرنپتاحیش کە ناوی ساڵی پێنجەمی فەرمانڕەوایی دەبات، دەکاتە ساڵی ١٢٠٩. بێگومان ئەوەش ئەگەر دوو شت بە ڕاست وەربگرین:

١-ناوبردنی ئیسرائیل لە میلەکە مەبەست لێی بەنو ئیسرائیلە.

---

[٢٩] کیتچن باسی دوو مێژووی چوونە سەر تەخت بۆ ڕەمسیسی دووەم: ١٣٠٤ یان ١٢٩٠ کە ناتوانرێت بڕیار لەسەر هیچیان بدرێت:
Kenneth Kitchen, Ancient Orient and Old Testament, p.58 n.6.
لێرە ئەو مێژووەم وەرگرتووە کە لە کتێبی ڕەمسیسی دووەمی نۆبلکور هاتووە.

[٣٠] دەرچوونی بەنو ئیسرائیل لە سینا ڕۆژی بیستەمی مانگی دووەمی ساڵی دووەم بوو (العدد: ١١/١٠)، بڕیاری ونبوونی چل ساڵەکەش لە (العدد: ٣٣/١٤).

٢–مرنپتاح سەبارەت بە بەنو ئیسرائیل بەڕاستی مەبەستی لە ساڵی پێنجەم بووبێت.

بەم جۆرە:

١–تەنانەت ئەگەر ڕاستیش بێت مرنپتاح ئەو لەشکرکەشییەی فەڵەستینی کردبێت، شەڕی لەگەڵ بەنو ئیسرائیل نەکردووە، چونکە ئەوان لەو کاتە ونببوون.

٢–مرنپتاح ونبوونەکە بەوە پشتڕاستدەکاتەوە کە لە میلەکەی و بە پێچەوانەی ناوەکانی تر کە وەکو شوێن ناویبردوون، ئیسرائیلی وەکو خەڵکان ناوبردووە. بەنو ئیسرائیل لەو کاتە جێگیر نەبوون تا ناوی شوێنیان لێ بنرێت.

٣– دەقی میلەکە سەبارەت بە ئیسرائیل دەڵێت: ئیسرائیل وێرانکرا، تۆوەکەی نەما. مرنپتاح ناڵێت تۆوەکەیانم لەناوبرد، ئەمەش بیرمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە مرنپتاح بەدوای بەنو ئیسرائیلدا گەڕاو نەیدۆزینەوە، ئیتر گرنگ نییە بەڕاستی لەشکرکەشییەکەی کردبێت یان نا.

کەواتە ئەگەر ئەو ژمارەیەی دامانناوە بۆ دەرچوون و بۆ کۆتایی ونبوونەکە، ڕاست بێت، پێویستە لە مردنی ڕەمسیسەوە حسابیان بکەین، ئیسرائیلییەکان لە بەردەستی میسرییەکاندا نەبوون. هەرچەندە فیرعەونی بنەماڵەکەی دوای ئەوە (ڕەمسیسی سێیەم) جۆرە دەسەڵاتێکی هەبووە لە فەڵەستین، بەڵام ناوی ئیسرائیلییەکانی نەبردووە، کە پێویستە لەو کاتەدا خاوەنی سەربەخۆیی خۆیان بوون. ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ دووریی سنووری دوو لایەنەکە لە یەکتر، هەروەها کێشەکانی میسر لەگەڵ لیبییەکان و گەلانی دەریا.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مرنپتاح، دەڵێین کە میلەکەی بە زۆری باسی بەرپەرچدانەوەی لیبییەکانە کە لە باکووری ڕۆژئاواوە هێرشیان بردبوو، تەنها لە کۆتاییش باسی چەند شوێنێکی فەڵەستین لەگەڵ ئیسرائیل دەکات. ناوی ئیسرائیل لە دەقەکە بەم شێوەیە هاتووە:

| | | |
|---|---|---|
| | ysriAr | یسریئر |

هێماکانی دواوە: دارەکە (نیشانکەرەوەی بێگانە) و پیاو و ئافرەتەکە و سێ خەتی نیشانەی کۆ (واتە خەڵکان) کە پێکەوە واتای خەڵکی بێگانە دەدەن و ئەو نیشانکەرەوەیە ناخوێنرێتەوە.

یەکێك لە ڕەخنەکان لە دەستنیشانکردنی ئەو ناوە بە ئیسرائیلییەکان، ئەوەیە مەبەست لە ناوەکە شار و دۆڵی (یزرعئل)ـە יזרעאל Jezreel، بەڵام ئەو ڕەخنەیە لاوازە، چونکە ناوی سەر میلەکە وەکو خەڵکانێك باسکراوە نەك شوێن و نووسەرەکە، بۆ ناوەکانی تر نیشانکەرەوەی شوێنی داناوە. ڕەخنەیەکی لاوازتریش ئەوەیە نووسەرە میسرییەکە لێی تێکچووە و لەجیاتی نیشانکەرەوەی شوێن هی خەڵکی بەکارهێناوە.

**دووەم: خۆ بە خودا زانین.**

بەڵگەیەك بۆ ئەوەی فیرعەونی مووسا رەمسیسی دووەم بووە، خۆ بە خوداوەند زانینی رەمسیسە.



قودسی ئەقداس لە پەرستگەی گەورەی ئەبو سمبل–رەمسیسی دووەم لەناو خوداوەندەکان–دووەم لە راستەوە

رەمسیس لەماوەی فەرمانڕەوایەتیی خۆی زۆر تەرکیزی کردە سەر دڵسۆزیی خەڵك بەوەی هانی پەرستشی میللی دەکرد، کە خۆی دەکاتە خوداوەند لە دەرکەوتە جیاکانی پادشایەتی. پەرستگە بچووکە متوازعەکان کە خەڵکی ئاسایی دروستیان دەکردن و پەیکەرە زەبەلاحەکانی بەردەم پەرستگەکانی پی– رەمسیس و ئەبو سمبل و شوێنی تر، هێما بوون بۆ ئەو پەرستشانە: رەمسیس وەك فەرمانڕەوای فەرمانڕەواکان، خۆری فەرمانڕەواکان، خوشەویستی ئەتوم، خوداوەند... تاد[31] (..) شێوەکانی خوداوەندە گەورەکان بەخۆیەوە بەسترابوون: ئامونی رەمسیس، پتاحی رەمسیس و خوداوەندی مێینەش وەك (عەنات)ی رەمسیس.[32]

(کیتچن) کە کتێبێکی ناوداری لەبارەی رەمسیسەوە نووسیوە، ئەمە دەڵێت و باسی ڕووچوونەکەی دەکات کە لە میسر و نووبە هانی پەرستشی پەیکەری پادشایانەی خۆی کرد بۆ ئاستێکی زۆر دوورتر لە سەرەتای کاری وا لە بنەماڵەی

---

[31] Kenneth A. Kitchen, Pharaoh Ramesses II and his Times, p.769.
[32] Ibid, p.770.

عەنات (عنتئت، عنتئیت.. بەمیسریی کۆن) خوداوەندی مێینەی ئاسیاییە، میسرییەکان خستبوویانە ناو لیستی خوداوەندەکانی خۆیان، کچی رەمسیس لە (ئست نفرت) ناوی (بنت عەنات) بوو، واتە کچی عەنات.

هەژدەیەم.[٣٣] بۆیە بۆچوونی هەندێك کەس ئەوە پەرستنی ڕاستەقینە نەبوو و خودی خۆی نەدەپەرسترا، بەڵکو وەکو ڕواڵەتی ئەو خوداوەندە ئەو نیشانی دەدا...[٣٤] ئەوە قسەیەکە بەڵگەکانی تر نایسەلمێنن، بەتایبەتیش کە ئەوانەی بەتایبەت لەبارەی رەمسیسەوە لێکۆڵینەوەیان هەیە، وەك کیتچن یان خاتوو نۆبلکور.

ئەوەی باوە ئەوەیە فیرعەونەکانی میسر خۆیان بە خوداوەند زانیوە، بەڵام ئەوەی لە ڕاستییەوە نزیکترە، ئەوەیە ئەوان خۆیان بە کوڕی خوداوەند زانیوە. رەمسیسی دووەم خۆی بە کوڕی رع زانیوەو ئەوە لە ناوە تایبەتییەکەی (ناوی لەدایکبوون) دیارە: رع–مس–سو، بەڵکو ئەو کوڕی خوداوەندەکانە، بە ئامون و خوداوەندە مێینەکانیشەوە[٣٥] بەڵام رەمسیس لە خۆبەگەورەزانیندا زۆر ڕۆچووبوو، تا گەیشتە ئەوەی لە  ساڵی ٤٥ـەمی پەرستگەی (نیو ئەشکەوت) لە (جرف حسین) بۆ پتاح–تاتنن (یاخود پتاح–تانن)، خوداوەندی گەورەی یۆبیلەکان (جەژنەکانی "سد") لە (نووبە) دەیبینین. لە حەرەمی حەرەمەکانیش پەیکەری چوار خوداوەندی داناوە کە یەکێکیان خۆیەتی: پەیکەری پتاح و پەیکەری خۆی، ئینجا پتاح–تانن و پەیکەری حتحور[٣٦] و شتێکی نوێی دامەزراند، لێرە رەمسیس بەلای کەمەوە حەوت جار وەك رەمسیسی خوداوەند ناوبراوە[٣٧]. پێشدەچێت ئەو

---

[33] K.A. Kitchen, Ramesses II, in ; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.3, p.118

[٣٤] نیقولا جریمال، تاریخ مصر القدیمة، ص٣٣٩-٣٤١.

[٣٥] بڕوانە میلەکەی (کوبان):

J. H. Breasted, Ancient Records of Egypt, vol. III, SS282-293, pp.118-119.

[٣٦] نوبلکور، ص٣٦٥.

[٣٧] نوبلکور، ص٣٦٦.

پەیکەرانە بە زێڕ داپۆشرابن[38] و ئەو پەرستگەیە بۆ پەرستنی پتاح–تاتنن و ڕەمسیس دروستکرابێت[39]، پێشدەچێت پەرستنی ڕەمسیس لە نووبە زوو لەو پەرستگەیەی جرف حسێن بڕیاری لەسەر درابێت، چونکە وێنەکەی ڕەمسیس بە زۆری زۆرداری لەو جێگەیە دانەنرا، بەڵکو پێشتر بڕیاری لەسەر درابوو[40]. پەیکەری ڕەمسیس دیسان لە قودسی قودسەکانی پەرستگەی ئەبوسمبلی گەورەیە لەگەڵ رع و ئامون و حورئاختی. ئەمەش دوای ئەو بوومەلەرزەیەی زیانی بە ئەشکەوتی (محا) گەیاند.

تەنانەت کارەساتەکانیش کاریان لە ڕەمسیس نەدەکرد، بەڵکو دەیکردن بە هەل بۆ خۆگەورەکردن. لە ساڵی ٣١ـەمی بوومەلەرزەیەك بەشی ناوەوەی ئەشکەوتە گەورەکەی (محا)، کە بریتییە لە چوار پەیکەری گەورەی خۆی و پەیکەری بچووکی دوو ژنەکەی و هی چەند منداڵێکی و پێدەچێت لە چارەکی یەکەمی فەرمانڕەواییەکەی دروستکرابێت، بە توندی لەقاند و ئەمە دەرفەت بوو بۆ ڕەمسیس بۆ ئەوەی خوداوەندێتیی تەواوی دەستکەوێت (بەڵام دروستتر باسی پاساو بکەین نەك دەرفەت)، لەو کاتەشەوە ڕەمسیس دەچێتە ژێر سەرپەرشتیی پتاح–تاتنن، خودای جەژنەکانی سد (یۆبیلەکان)، ئەو بوومەلەرزەیەش کە یەکێك لەو پەیکەرە گەورانەی شێواند، وەکو تووڕەبوونێکی خودایی تەماشای نەکرد، بەڵکو لەرزینێکی زەوی بۆ ئاوڕدانەوەی خودایی لە پادشا.[41]

ڕەمسیس تەنانەت ئەوەش پیشان دەدات کە دەسەڵاتی بەسەر کەشوهەواشدا هەیە، ئەویش لەڕێگەی خوداوەندەکەی (ست)، کە خوداوەندی بنەماڵەکە بوو. لە

---

[38] جيمس بيكي، الاثار المصرية في وادي النيل، ج٥، ص١١٢.

[39] جيمس بيكي، ص١١٢.

[40] جيمس بيكي، ص١١٢.

[41] نوبلكور، ص٣٤٠.

باسەکانی ئاشتیی نێوان میسر و وڵاتی (خاتتی)و ناردنی سەرانە بۆ رەمسیس، بە کچەکەی پادشای خاتتیەوە، دەبینین رەمسیس داوا لە باوکی خۆی، خوداوەند (ست)، دەکات، باران و بای سارد و بەفر دوابکەون تا ئەو شتانەی پیٚ بگات، ڕەمسیس پێی دەڵێت ئاسمان لەناو دەستدایە و زەوی لەژێر پێتە، (ست)یش بەگوێی دەکات.[42]

دەسەڵاتە سەرووسروشتییەکانی رەمسیسی دووەم لە دەقێکی تردا دەبینین (بەردییەی ئەنستاسی ٢) کە ستایشی پایتەختەکەی رەمسیس (پی–رەمسیس) دەکاتو لە دواتر نووسینەکە (کە دارشتنی قوتابخانەیە)، باسی نامەی پادشای (خاتتی) بۆ میرێکی کەناری باکووری فینیقیا دەکات، کە پێی دەڵێت پێکەوە بچن بۆ لای رەمسیس و داوای خوداکە (واتە رەمسیس) جێبەجیٚ بکەن (کە بانگی کردبوون): ((ئەو هەناسە بەو کەسە دەدات کە خۆی پێی خۆشە و بە خۆشەویستیی ئەو هەموو وڵاتە بێگانەکان دەمێننەوە. وڵاتی خاتی تەنها لەژێر دەسەڵاتی ئەوە و ئەگەر خوداکە بەخششەکانی خاتی وەرنەگرێت، ئاوی ئاسمان نابینێت، چونکە لەژێر دەسەڵاتی ئوسر مئعت رع (رەمیسس)ـە)).[43]

ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە، واتە تەسخیرکردنی دیاردە سروشتییەکان بۆ رەمسیس، مەعقوولیەتێکی زۆر دەدات بەم پرسیارە: ئەگەر بەڕاستی دەریاکە بۆ بەنو ئیسرائیل لەتبوو، فیرعەون چۆن وێرای شوێنیان بکەوێت؟ وەڵامەکە بەم شێوەیەو بە ڕەچاوکردنی تایبەتمەندییەکانی رەمسیسی دووەم، ئەوەیە لەو کاتەدا ئەو دیاردەیەی بە کارێکی خوداکەی زانی کە بۆ ئەوی کردبوو.

---

[42] John A. Wilson, The Asiatic Campaigning of Ramses II, ANET, p.257.

[43] J. H. Breasted, Ancient Records of Egypt, vol. III, S426, p.186; John A. Wilson, In Praise of the City Ramses, , ANET, pp.470-471.

زۆرێك تێبینییان كردووە كە رەمسیس لە نووسینەكانیدا موبالەغەی دەكرد و لە رادەبەدەر شانازیی بە خۆیەوە دەكرد و هەیشە وای بۆ دەچن تووشی نەخۆشیی شێتیی مەزنێتی بووە.[٤٤] دەشبینین لە میلەكەی (كوببان) هێندە ستایشی خۆی كردووە كە نزیكی كردووەتەوە لە خوداوەندەكان، بەمەرجێك ئەو میلە هی ساڵی سێیەمی بوو، واتە هێشتا سەرەتای حوكمی بوو.

میلەكە باسی هەڵكەندنی بیری ئاو بۆ كانەكانی زێڕ لە نووبەی خواروو دەكات. لە میلەكە شتی وا دەخوێنینەوە: سەرەتا ستایشی خۆی دەكات كە (رع)ی باوكی بەسەر عەرشی (حور)دا هەموو رۆژێك بەرجەستە دەبێتو میسر بە باڵەكەی دەپارێزێتو سێبەر بۆ خەڵك دروست دەكات. رۆژی لەدایكبوونی یادێكی شادی لە ئاسمانە بەرزەكان [٤٥] دەكات و بە بیستنی ناوی زێڕ لە شاخەكان دەردەچێت[٤٦].

پاش باسی كێشەی نەبوونی ئاو، بەجۆرێك نیوەی ئەوانەی دەچوون بۆ دەركردنی زێڕ لە تینوویەتیدا دەمردن، میرەكانی كۆشكی بانگكرد بۆ ڕاوێژ، ئەوانەی ڕێگەیان پێدەدرێت بچنە بەردەمی خوداوەندی بەرجەستە (خوداوەندی باش/برێستد)و

---

[٤٤] نوبلكور، ص٨٠.

[٤٥] بەم شێوەیە لە وەرگێڕانە عەرەبییەكەی كتێبەكەی (نۆبلكور)دا هاتووە، وەرگێڕانەكەی برێستد بە شێوەیەكی ترە: زەوی دامەزراوە، ئاسمان رازییە، نۆ خوداوەندەكە دڵخۆشن بە تایبەتییەكانی (بڕگەی ٢٨٥، لاپەڕە ١١٩).

[٤٦] برێستد لێرە دەڵێت كە هەمان فیكرە لە دەقێكی ئامنحوتپی چوارەم (ئەخناتوون) هەیەو ئاماژە بۆ بەرگی دووەمی سەبارەت بە بنەماڵەی ١٨ دەكات:

J. H. Breasted, Ancient Records of Egypt, vol.II, S946, p.118-119

بەڵام جیاوازیی دوو دەقەكە ئەوەیە دەقەكەی رەمسیس خۆی نووسیویەتی لەكاتێك ئەخناتوون لەسەر گۆڕی رعموسی، وەزیری ئەخناتوون، كە هێشتا بە ئامنحوتپ دەناسرا، نووسراوە، واتە هی كەسێكی ترە نەك هی خودی پادشا. هەروەها ئەم دەقەیان لە رەمزی دەچن: ((ترسی تۆ لە ناوەڕاستی چیاكانە، وەك چۆن لە دڵی خەڵكە و چیاكان گوێت لێ دەگرن، وەك چۆن خەڵك گوێت لێ دەگرن)).

دەستی ڕێزی بۆ بەرزدەکەنەوە، بۆ (کئـ kA)[٤٧]کەی و بەسەر زەویدا کڕنووشی بۆ دەبەن (بەرامبەر دەموچاوە جوانەکەی/ برێستد)، ئینجا دەقەکە ستایشی دووروودرێژی ئەوان باس دەکات: تۆ وەکو (رع)یت لە هەموو ئەو شتانەی دەیانکەیت، چونکە هەر شتێکت بە شەو ویست خێرا بەر ڕۆژ هەڵدێت، ئێمەش ئاگاداری موعجیزەی زۆری تۆ بووین، لەو کاتەوە چوویتە سەر تەخت، چ شتێك هەیە نایزانی؟[٤٨] وڵات نەما دەستت نەیگاتێ و هێشتا کە لە هێلکە بووی و جێنشینی پادشا بووی، نەخشەت دەکێشا. سەرکردەی گشتیی سوپاش بووی کە هێشتا تەمەنت دە ساڵ بوو. تۆ ئەگەر بە ئاو بڵێیت لە چیا دەربچێت، یەکسەر لافاو دێت. تۆ (رع)ی بەرجەستەی و (خپری)ت لە شێوە ڕاستەقینەکەی... تاد.[٤٩]

ستایشی لەو جۆرە وا دەکات تەنانەت خاتوو نۆبلکۆر کە موعجبی رەمسیس بوو و دیارە پەیوەستێکی رۆحی و سۆز پێوەی دەبەستێت و یەکێك بوو لەوانەی مۆمیاکەیان پشکنی، ددان بەوەدا بنێت کە ڕاددەی ستایشەکە چەند گەورەیە و مەراییکردن و خۆبردنەپێشەوە چەند زۆر بوو. دەڵێت کە هەرچەندە لە پادشانشینی نوێ تەعبیرەکانی خۆگەورەکردن لەناو نووسراوە پادشاییەکاندا بڵاوبوون، بەڵام رەمسیسی دووەم براوەی یەکەم بووە.[٥٠]

---

[٤٧] هێزێکی نامادديیە، واتاکەی ئەکید نییەو ئەوەی پادشایان جیاوازە لە هی خەڵکی ئاسایی، بڕوانە:
Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.2, p.215ff.

[48] J. H. Breasted, Ancient Records of Egypt, vol. III, S288, p.120.

[٤٩] نوبلكور، رمسيس الثاني، ص١٢٥-١٢٨، جگە لەوەی لە (برێستد) وەرگیراوە. سەبارەت بە ناوبردنی خپری نیشانەیەکی گونجاومان پێ دەدات بۆ نیشانەکانی مووسا، بڕوانە باسی نیشانەکانی مووسا، نیشانەی (قومەل).

[٥٠] نوبلكور، رمسيس الثاني، ص١٢٤.

**سێیەم: ڕەمسیس وەك نموونە بۆ فیرعەونەکانی دوای خۆی.**

یەکێك لەو ئایەتانەی قورئان کە ڕوودانی لە مێژوو تێبینی نەکراوە، ئەم ئایەتەیە: (وجعلناهم ائمة يدعون الى النار ويوم القيامة لاينصرون–القصص:٤١)، ئەویش دوای باسی خۆی و هامان و دوای باسی لەناوبردنی خۆی و سەربازەکانی لە دەریا. کەسێك کە زۆر گونجاوە ببێتە نموونە و ئیمامێك بۆ کەسانی دوای خۆی، ڕەمسیسی دووەمە، چونکە لە سەردەمەکانی دوای خۆی ناوبانگێکی زۆر گەورەی هەبوو و بە پادشایەکی مەزن تەماشا دەکرا و پادشایان تەنانەت چاویان لە ناوی ئەو دەکرد. لەدوای ئەو، ژمارەی ڕەمسیسەکان گەیشتە ڕەمسیسی یانزەیەم، بەڵام لە هەموویان بەتواناتر، ڕەمسیسی سێیەم (دەوروبەری ١١٨٥–١١٥٣پ.ز) کە سەر بە بنەماڵەی بیستەم بوو و موعجەبی ڕەمسیسی دووەم بوو و تەنانەت ناوی کوڕەکانیشی وەکو ناوی ڕەمسیسی دووەم نابوو. ناوی دامەزرێنەری بنەماڵەکە (ست ناخت) بوو، بەڵام ئەوانەی تر، لە ڕەمسیسی سێیەمەوە، هەموو ڕەمسیس بوون.[٥١] دوانیش ناوی ڕەمسیس بەشێك لە ناوەکەیان بوو.[٥٢] لەدوای ڕەمسیسی سێیەمیشەوە مێژووی بنەماڵەکە بریتی بوو لە دابەزینی خێرای هێزی میسر و بووە دەوڵەتی پلە دوو.[٥٣]

ناوی ڕەمسیسی دووەم کاریگەر بوو. بینا زۆرەکان و دیمەنەکانی شەڕەکانی، هەروەها لەوانەیە یادەوەریی میللی سەبارەت بە ئاشتی و خۆشگوزەرانیی سەرەدەمەکەی، هالەیەکیان دروست کردبوو بۆ مەزنێتیی ڕەمسیس و توانایەك کە پاشاکانی دواتر هەوڵی بۆ بدەن. ڕەمسیسی چوارەم وتی کە سوودی بە

---

[51] Pierre Grandet, Twentieth Dynasty, in; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.2, p.538.

[52] K.A. Kitchen, Ramesses II, in ; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.3, p.118.

[53] Pierre Grandet, Twentieth Dynasty…, p.539.

خوداکانی گەیاندووە لە ماوەی چوار ساڵدا زیاتر لەوەی رەمسیسی دووەم لە ٦٧ ساڵدا کردبووی و داوای پاداشتی کردبوو، بەڵام ئیدعاکەی قبووڵ نەکرابوو و داواکەی جێبەجێ نەکرابوو.[٥٤]

کاریگەرییەکەی رەمسیسی دووەم بۆ ماوەیەکی زۆر مایەوەو هەرچەندە پادشایەك نەمابوو ناوی رەمسیس لە خۆی بنێت، بەڵام نازناوی وەك (کوڕی پادشای رەمسیس) لە میسری سەردەمە نوێترەکان لە کۆشك هەبوو، شێوازی رەمسیسیش لە نازناوی شایانە بۆ نزیکەی چوارسەد ساڵ مایەوە. پەرستنی رەمسیس لە ئەبیدۆس و مەمفیس بۆ سەردەمی هیلینستی مایەوە،[٥٥] واتە زیاتر لە هەزار ساڵ دوای رەمسیس. تەنانەت ژمارەیەك پادشای بنەماڵەی لیبی لە میسر، ئەو ناوەیان لە خۆیان نا، کە ناوی چوونە سەر عەرشی رەمسیس بوو[٥٦]. لە سەدەی چوارەم (یان سێیەم)[٥٧]ی پێش زاینیش، کاهنەکانی خوداوەند خونسوی (تیبە) باسەکەی رەمسیس کە پزیشکی بۆ پادشای خاتییەکان ناردبوو، کردیانە چیرۆکی کچەمیری بختن bxtn ئەویش بۆ پشتگیریکردن و بەرزکردنەوەی خونسوی خودایان[٥٨].

---

[54] Kenneth A. Kitchen, Pharaoh Ramesses II and His Times, p.773.

[55] Ibid.

[56] K.A. Kitchen, Ramesses II, in ; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.3, p.118.

[57] John A. Wilson, The Legend of the Possessed Princess, in; ANET, p.29

[58] Ibid, Kenneth A. Kitchen, Pharaoh Ramesses II and his Times, p.773.

تەماشای دەقی چیرۆکەکە بکە لە:

J. H. Breasted , Ancient Records of Egypt, Volume III, SS429-447, pp.188-195.

هەروەها:

بەڵام نەك تەنها رەمسیس، بەڵكو كوڕەكەشی (خع–م–وئست)یش ناوی هەر مایەوە، كە لە سەردەمی ڕۆمایی بووە بابەتێكی چەند چیرۆكێكی بڵاوی جادووگەری.[59]

**چوارەم: وەسفی پایتەختی رەمسیسی دووەم.**

پر–رع مس سو (ماڵی رەمسیس)، یاخود پی–رع مس سو، پایتەختی رەمسیسی دووەم بوو. پێشتر سێتیی یەكەمی باوكی كۆشكێكی تێدا دروست كردبوو، بەڵام رەمسیسی دووەم كردیە شارێكی گەورە و پڕی كرد لە بینا و باخ و بووە پایتەختی خۆی. بەردیەی ئەنستاسی ٢ كە دارِشتنێكی قوتابخانەیە، دەڵێت: خەڵكی شارەكانی تر هەموو شارەكانیان بەجێهێشت و لەوێ نیشتەجێ بوون. شارەكە پڕە لە خواردن و ئازووقە، قەڵاكەی وەكو ئاسۆی ئاسمانە و (رەمسیس مری ئامون) تێی وەكو خوداوەندە.[60]

بەردیەیەكی تر كە بەردیەی ئەنستاسی ٣ ی پێ دەوترێت، بریتییە لە نامەی نووسەرێك بۆ ئاغاكەی كە نووسەرێكی ترەو باسی گەیشتنی بۆ پی رەمیسیس دەكات، كە چۆن بینی زۆر باشە و جوانە و خوداوەند (رع) خۆی دروستی كردووە، شارەكە خۆشە بۆ ژیان، كێڵگەكەی پڕە لە هەموو شتێكی باش، هەموو رۆژێك پڕە لە خواردن، گۆمەكانی پڕن لە ماسی، دەریاچەكانی پڕن لە باڵندە، مێرگەكانی سەوزن بە گیا، گوێئاوەكانی خورمایان گرتووە، كاڵەكەكانی لەسەر لمەكە زۆرن، عەمارەكانی پڕن لە جۆ و ئیمەر (جۆرێكی كۆنی گەنم) كە (هێندە بەرزن) نزیك ئاسمان دەكەون. ئینجا باسی پیاز و كەرەوز و كاهووی ((باخەكە))،

---

John A. Wilson, The Legend of the Possessed Princess, in; ANET, pp.29-31.

[59] K.A. Kitchen, Ramesses II, p.118.

[60] John A. Wilson, In Praise of the City Ramses, in; ANET, p.470.

هەنار و سێو و زەیتوون و هەنجیری باخەکان، شەرابی شیرین، هەنگوینی پلە یەك، ماسیی (وج)ی قەناتی شارەکە... تاد.. ئینجا دەڵێت: مرۆڤ دڵی خۆش دەبێت کە لەوێ بژی و کەس ناڵێت ((خۆزگە)). پاشان باسی لاوەکان دەکات کە پۆشاکیان لەبەردایە و سەریان چەور کردووە و گوڵیان پێیە و لای دەرگاکانیان وەستان، ئەو رۆژەی رەمسیس دەچێتە ناوەوە بەیانیی جەژنی خۆاياخ[61]... تا لە کۆتایی قسە ئاڕاستەی رەمسیس دەکات و لەکۆتاییدا دەڵێت: تۆی خودا.[62]

ئەم وەسفە ئەو ئایەتەمان بۆ ڕووندەکاتەوە: (كم تركوا من جنات وعيون * وزروع ومقام كريم * ونعمة كانوا فيها فاكهين –الدخان:٢٥–٢٧). ئەم وەسفەش گونجاوە لەگەڵ شارەکانی میسر، بەڵام زیاتر لەگەڵ پایتەختەکەی رەمسیس، بەتایبەت کە دەبینین باسی کانیاو دەکرێت لەکاتێکدا لە میسر رووباری نیل بە تەنیاو بێ هیچ لقێك دەڕوات و هەبوونی لق دەلتای میسر دەگرێتەوە، ئەویش کاتێك نیل دەبێتە چەند لقێك و دەلتا دروست دەکات. پی–رەمسیس دەورە درابوو بە ئاو، ئەوەش جگە لە باخەکان و خۆشگوزەرانیی ناو شارەکە کە بەردییەکەی سەرەوە باسی دەکات. یەکسەر دوای ئەوە ئایەتەکەی تر هەروەها بۆ شارەکە گونجاوە: (كذلك وأورثناها قوما آخرين) چونکە دەبینین مرنپتاح، کوڕ و جێنشینی رەمسیس، ئیدارەکەی گواستەوە بۆ شارە کۆنەکەی مەمفیس و لەوێ کۆشکێکی بۆ خۆی دروست کرد. ئەوەندەشی پێ نەچوو ئەو لقەی نیل ڕێڕەوەی گۆڕی بەجۆرێك شارەکە بێ ئاو مایەوە، بۆیە پایتەختی پادشایانی بنەماڵەی بیستویەکەم بووە شاری تانیس ("جعنت" بە میسریی کۆن). لەو شارەش بەرد و کەرەستەکانی پی –رەمسیس بە ئەندازەیەکی گەورە گوازرانەوە، بۆیە سەرەتا شوێنەوارناسان وایانزانی ئەوێ شاری پی–رەمسیسە.

---

[61] یان خۆاياك. ویڵسن دەڵێت پەیوەندیی ئەو جەژنە بە چوونە ناوەوەی پاشا بۆ شارەکە دیار نییە:
John A. Wilson, In Praise of the City Ramses, p.471 n.18.
[62] John A. Wilson, In Praise of the City Ramses, pp.470-471.

پایتەختەکەش کە بەو شێوەیەی سەرەوە باسمان کرد، ئیشکالیەتی ئەو ئایەتە ناهێڵێتەوە: (ونادى فرعون في قومه قال يا قوم أليس لي ملك مصر وهذه الأنهار تجري من تحتي أفلا تبصرون–الزخرف:٥١)، مەبەستیش باسی رووبار بە کۆ نەك بە تاك (نیل بە تەنیا). چارەنووسی پایتەختەکەش ئەوە بوو کە ئایتەکە باسی دەکات: (ودمرنا ما كان يصنع فرعون وقومه وما كانوا يعرشون–الاعراف:١٣٧) چونکە پایتەختەکە دوایی هیچ شوێنەوارێکی گرنگی تێدا نەما، ئەوەش جگە لەوەی شوێنەواری زۆری رەمسیس لەناوچوون و ئەوەی ماوەتەوە کەمێکە لەو زۆرەی هەبوو.[٦٣]

**پێنجەم: بەڵگەی ڕوودانی کارەسات لە کاتی رەمسیسی دووەمدا.**

بەهۆی تێداچوونی لەشکرەکەی رەمسیس و ئەو زیانە ماددییانەی تووشی میسر بوو، دەبێت هێزی میسر کەمبووبێتەوە، ئەوەشمان لە سەرەوە بینی. سەبارەت بە جێنشینی رەمسیس، واتە مرنپتاحی کوڕی، زانیاریی کەمە لەبارەیەوە و وا دیارە لە سەردەمی ئەودا میسر لاواز بووبێت.

هەرچەندە مرنپتاح توانی بەرەنگاری هێرشی لیبییەکان ببێتەوە، بەڵام لەدوای ئەوەوە میسر لە جاران لاوازتر بوو. بەپێی هەندێ زاناش، سەردەمی مرنپتاح، خاڵی جیاکەرەوەی نێوان بەهێزی و شکۆمەندیی میسر و داڕمان و لاوازییەتی، چونکە دوای فرەمانڕەوایی مرنپتاح، کاریگەریی میسر وردەوردە کەمدەبووەوە، لە لایەك پێگەکانی خۆی لە سووریا بۆ ماوەیەك لەدەست دەدات و لە لایەکی تر یەکێتیی سیاسیی وڵاتەکە ڕووەو هەڵوەشان چوو و لە دواتر میسر بوو بە چەند شانشینێکی بچووکی دژ بە یەك، چیتر ئەو پادشا بەهێزەی تێدا پەیدا نەبوو کە کۆتایی بەو فەوزایە بهێنێت و تەنها چارەسەری کاتی هەبوون، تا

---

[٦٣] دەشکرێت ئایەتەکە هەروەها وەسفی بیناکانی رەمسیس بکات کە ماونەتەوە، بەڵام سەقفیان نەماوە، چونکە واتایەکی (عرش) بریتییە لە سەقف.

دەگاتە ئەو کاتەی دەکەوێتە دەستی هێزە گەورەکان: ئاشوورییەکان، پاشان هەخامەنشییەکان و دواتر یۆنانەکان[٦٤].

دیارە دارمانەکە یەکسەر نەبووە، بەڵام ئاشکرایە میسری دوای رەمسیسی دووەم، وەکو میسری کاتی ئەو نەبووە.

**شەشەم: نەخۆشیی پێستی رەمسیس.**

ئەوەیان لە باسی نیشانەکانی مووسادا باسی دەکەین، وەك حیکمەتی نیشانەی (دەست)، لێرە بە کورتی ئاماژەی بۆ دەکەین:

لەو بەشە پرسیار لە نەگونجانی دوو نیشانەی یەکەم: نیشانەی مارەکە و نیشانەی دەستەکە دەکەین، کە لەگەڵ یەك ناگونجێن، بەتایبەتی کە پێکەوە و لە یەککاتدا پیشانی فیرعەون درابوون. هەروەها نەبوونی موناسەبەیەکی دیاری نیشانەی دەستەکە لەگەڵ خودی فیرعەون یان میسر، لەکاتێکدا نیشانەی مارەکە موناسەبەی بەهێزی هەیە. ئەوەش لەو بەشەدا دەڵێین کە رەمسیسی دووەم نەخۆشیی سپیبوونی پێستی هەبووە و نیشانەی دەستەکەی مووسا، کە سپی دەبێت و پاشان وەکو خۆی لێ دێتەوە، لەگەڵ رەمسیسی دووەم گونجاوە. رەنگە پادشای تر هەمان نەخۆشییان هەبووبێت، بۆیە ئەم بەڵگەیە تەنها پاڵپشتی بەڵگەکانی ترە بۆ دەستنیشانکردنی فیرعەونەکەی مووسا.

---

[٦٤] د. رمضان عبدة علي، رؤى جديدة في تاريخ مصر القديمة، ص ٩٢.

## بەشی چوارەم:

## هـــامــــان

ڕواڵەتبینەکان دەڵێن قورئان لێی تێکچووە و هامان وەزیری فیرعەون نەبووە، بەڵکو وەك تەورات باسی دەکات، وەزیری ئەحشویرش (خشایارشا بە فارسی)، پادشای ئەخمینی بوو و کە جوولەکەکانی چەوساندەوە تا ئەستێر، کە کچە جوولەکەیەك بوو، ببووە ژنی پادشا و بە خۆی و (مۆردخای)ی ئامۆزای توانییان بەسەریدا زاڵ بن، وەك لە سیفری ئەستێردا باسکراوە.

هامانی تەورات لە سیفری (ئەستیر)دا هاتووە کە گومان لەوە کراوە بەشێك بێت لە تەورات، هەروەها تاکە سیفرێکی تەوراتە کە لە دەستنووسەکانی دەریای مردوو نییە. سیفرەکە بەشی زۆری هەیە ڕەخنەی لێ بگیرێت، بەڵام ڕواڵەتبینەکان بەلایانەوە گرنگ نییە ڕاست بووبێت یان نا، گرنگ ئەوەیە کە هەبووە و بە قسەی خۆیان قورئان ناوی هامانی لەوەوە وەرگرتووە، بەڵام بەر لەوەی ئەوە بکرێتە بەڵگە، پێویستە ئەوە بسەلمێنرێت کە عەرەبی ئەو کاتە پەیوەندییان لەگەڵ جوولەکەکان هەبووە، لە نیمچە دوورگەی عەرەب و شام... تاد، کە ئەو سفرەیان هەبووە یان نا، چونکە بۆی هەیە نەیانبووبێت. تەنانەت لە حاڵەتی هەبوونیشدا، دەعوای وەرگرتنی قورئان لە تەورات، تەنها بۆچوونە، چونکە دەکرێت حاڵەتەکەی تر ڕاست بێت، واتە باسی هامان ئەساسی هەبێت، بەڵام نووسەرانی ئەو بەشەی تەورات لێیان تێکچووە و قورئان راستی کردووەتەوە. ئەوەش دەمێنێتەوە سەر باوەڕ، باوەڕی مسوڵمان کە قورئان و تەورات یەك سەرچاوەیان هەیە و باوەڕی بێباوەڕ کە هەردووکیان بەرهەمی دەستی مرۆڤن.

ئەوانەی ڕەخنەکە دەگرن، ناتوانن پێمان بڵێن مێژووی هەخامەنشییەکان باسی هامانی کردووە یان نا، ئایا دەتوانین ئەو باسانەی تێدا بدۆزینەوە، لە دەرکردنی فەرمانی کوشتنی هەموو جوولەکەکان لە دەوڵەتی فارس و ژنهێنانی

پاشا و بایەخی ژنەکە لای پاشا و کوشتنی هامان و کوشتنی خەڵکێکی زۆر لە شوشیانا و لە وڵاتەکانی تری دەوڵەتەکە؟

یەکێك لە هەڵەکانی چیرۆکەکە ئەوەیە، هامان بە هامانی ئاگاگی ناو دەبات، کە لە شەرح بە (ئاگاگ)ی عەمالیقی دانراوە کە دژ بە شائوول (تالووتی قورئان) شەڕی کردووە، کە ئەمە دەیخاتە نزیکەی ۱۰۰۰ ساڵ پێش زاین، لەکاتێکدا ئەحوشیرشی یەکەم ساڵی ٤٨٥ تا ٤٦٥ پێش زاینی حوکمی کردووە و گوایە لە ساڵی دوانزەمینی هامان قەناعەتی بە ئەحشویریش کرد کە جوولەکە لەناو ببەن (ئەستێر ٧/٣) کە دەکاتە ٤٧٤ ی پێش زاین. بەم شێوەیە سەیر دەبێت کەسێك لە فارس پاش زیاتر لە پێنجسەد ساڵ بزانرێت نەوەی پادشایەکی عەمالیقی باشووری فەڵەستینە.

بۆیەش باسی پادشای عەمالیق کراوە، چونکە لە تەوراتدا رقەکە لە عەمالیق زۆر گەورەیە، بۆیە هامان کراوە بە عەمالیقی. بڕوانە شەریعەتی مووسا کە باسی عەمالیقی تێدا کراوە، وەك بیرخستنەوەیەکی جوولەکە کە چۆن لە کاتی دەرچوونیان لە میسر پەلاماریان دان، بۆیە ((لەبیرتان نەچێت ناوی بەنو عەمالیق لەژێر ئاسماندا بسڕنەوە)) (التثنية:٢٥). هەروەها ئامۆژگاریی سەموئیل بۆ شائوول، کە خوا پێی دەڵێت کە کاری عەمالیقی بیربێت بۆیە بچێت و لەناویان بەرێت، بە پیاو و ئافرەت و منداڵ و شیرەخۆرەکان و ئاژەڵەکانەوە (سەموئیلی یەکەم/١٥)، لێرەش باسی ئاگاگ، پادشای عەمالیق، دەکرێت. لەلایەکی ترەوە موردخای کە لە چیرۆکەکەی ئەستێر باسکراوە، کە کوڕی یائیرە و ئەم کوڕی شەمعییە و ئەم کوڕی (قیش)ـە، کە بەپێی شەرح، قیش باوکی شائوولە واتە زیاتر لە ۱۰۰۰ ساڵ پێش زاینە، بەم جۆرەش ئەگەر سەد ساڵ بۆ تەمەنی ئەو کاتەی موردخای دابنێین و پەنجا ساڵ بۆ هەر یەکێك لە باوکانی دابنێین (بە مەرجێك تەمەنی هەر نەوەیەك سی ساڵ بێت نەك پەنجا) کەمتر لە سێسەد ساڵ لە نێوان قیش و موردخایدا هەیە، لەکاتێکدا بەپێی جیاوازیی نێوان ئەحشویریش‌و

شائوول، زیاتر لە پێنجسەد ساڵە. موردخای بەپێی (ئەستیر/٢) یەکێك بووە لەو جوولەکانەی لەسەر دەستی نەبوخودنوسەر رەوانەی وڵاتی دووڕووبار کرابوون (ساڵی ٥٩٧ پێش زاین)و نازانین تەمەنی ئەو کاتەی چەند بووە، بەڵام لەو کاتەوە تا کاتی ئەحشویریش، بەلای کەمەوە سەدویانزە ساڵ بووە + ساڵانی تەمەنی پێش بردنی بۆ وڵاتی دووڕوبار، بەڵام دەبینین تەورات دەڵێت پەروەردەی ئەستیری دەکرد و ئەمیان کچی مامی بوو، ئەی دەبێت ئەستیر تەمەنی چەند بووبێت کە ئەحشویریش هێنابووی؟ ئەستیر کچێکی زۆر جوان بوو و بە دڵی ئەحشویریش و هەموو ئەو کەسانە بوو کە دەیانبینی و ئەوی لەناو کچانی وڵاتاندا هەڵبژارد بۆ ئەوەی هاوسەری بێت.

چیرۆکەکە لە چیرۆکە کۆنەکان دەچێت و شتی ناماقووڵی تێدا هەیە، وەك ئەوە موردخای کڕنووشی بۆ هامان نەبرد بۆیە ڕقی لە هەموو جوولەکە هەڵسا و قەناعەتی بە پادشا کرد جوولەکەکانی ئمپراتۆریەتەکەی کە لە هیندستانەوە بۆ کووش درێژ دەبووەوە (ئەستیر/١)، بکوژێت، ئەی چۆن پادشا قەناعەتی بەوە کرد خەڵکێك بکوژێت کە هیچیان نەکردووە، تەنها لەبەر ئەوەی وەزیرەکەی پێی وت کە گەلێك هەیە یاساکانی جیاوازن لە یاساکانی گەلانی دەوڵەتەکە و کار بە یاساکانی پادشا ناکەن؟

ئەوەی دیارە ئەوەیە نووسەرانی دواتری ئەو سیفرە لێیان تێکچووە و لەجیاتی هامانی فیرعەون، هامانێکی تریان داهێنا کە وەزیری پادشای هەخامەنشییە و تایبەتیان کردووە بە عەمالیقەکان، کە دوژمنیانن. ڕەنگە ئەو بەشەش جوولەکەکانی وڵاتی دووڕووبار نووسیبێتیانەوە، ئەگینا ئەوە زیاتر دەگونجا هامان وەزیرێکی فیرعەون بێت و ڕەچەڵکی عەمالیقی بێت، چونکە وڵاتی عەمالیقەکان نزیکترە لە میسر وەك لە فارس، بەتایبەتیش کە لە کۆشکی رەمسیسی دووەم کەسانی ئاسیایی هەبوون لە پلەی بەرزدا.

لێرە بە پێویستی نازانین بۆچوونی هەندێك لە ئایندار و ئیسلامییەکان سەبارەت بەوەی هامان کێ بووە، بهێنینەوە، چونکە هەموویان بۆچوونن و پێویستە بەڵگەی تەواوەتی بۆ قسەکردن لەسەر ئەمە هەبێت، بە شێوەیەکی گشتیش دەڵێین:

١- قورئان تەنها ناوی هامانی هێناوە و نەیوتووە وەزیری بووە، بۆیە ڕەنگە وەزیر یان فەرمانبەرێکی گەورەی بووبێت، یان وەزیری گەورە بووبێت، یان کاهنی گەورەی پەرستگەیەك بووبێت، بۆ نموونە پتاح لە منف (من نفر) کە خع-م-وئستی کوڕی بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو کاهنە بوو و بایەخی بە شوێنەوارەکانی فیرعەونە کۆنەکان دەدا و چاکی دەکردنەوە، ڕەنگە کوڕێکی تری بووبێت وەك رەمسیسی سەرکردە، بەتایبەتیش کە باسی سەربازەکانی هەردوو فیرعەون و هامان کراوە، ڕەنگە کوڕە نۆبەرەکەی بێت لە ژنە خۆشەویستەکەی، نفرتاری، ئەویش ئامون-حر-خپش-ف، کە دواتر بە ناوی ست-حر-خپش-ف دەیبینین.

٢-مەرج نییە هامان لەگەڵ فیرعەون تووشی کارەساتی دەریاکە بووبێت، ڕەنگە پێشتر یان دواتر مردبێت.

٣-ناوی هامان بڕگەی (ئامان)ی تێدایە کە نزیکە لە ناوی ئامونی خوداوەند. ئامون بە هیرۆگلیفی دەنووسرێت imn:



یان بێ نیشانکەرەوەی خوداوەندێتی :



ناوەکە بێ بزوێنەکان دەنووسرێت و بەم جۆرەیە: ئمن، ئیمن. یۆنانییەکانیش کردیان بە ئامۆن، لەکاتێکدا ئامون شێوە قیبتییەکەیەتی.

ڕەنگە هامان کورتکراوەی ناوێك بێت بڕگەی ئامونی تێدایە، وەك چۆن (سسی) کورتکراوەی ناوی ڕەمسیسی دووەم بوو: رع مس سو، هەرچەندە لەیەکچوونی ناوەکەی لەگەڵ ناوی ئامون بە تەنیا، بەڵگە نییە.

بڕیاردان لەسەر کەسایەتیی هامان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زۆرە و ڕەنگە پێویست بێت چاوەڕێی دۆزینەوەی شوێنەواریی نوێ بکرێت بۆ ئەوەی بە ئەکیدی بناسرێت. تا ئەو کاتەش هەردوو ئیسلامییەکان و عەلمانییەکان، پێویستە وەکو بۆچوون باسی باوەڕی خۆیان بکەن: عەلمانییەکان لە بەدرۆخستنەوەی هەبوونی هامان و ئیسلامییەکان لە دەستنیشانکردنی کەسێکی دیاریکراوی کاتی ڕەمسیس، یان هەر فیرعەونێکی تر وەك هامانەکەی قورئان، کە ڕاستییەکەی هەردوو بۆچوونەکە بێپاساو و بەڵگەن، چونکە ئەگەر مەسەلە ئەوە بێت ناوێکی نزیك لە هامان بدۆزینەوە، ژمارەیەکی باش هەیە، بۆ نموونە ئەمانەی خوارەوە:

حم یون Hm iwn واتە: خزمەتکار یان کۆیلەی یون. (یون) ئەو شارەیە کە یۆنانییەکان ناوی (هلیۆپۆلس–شاری خۆر)یان لێ نا. لە هەمان کاتیشدا یون واتای (ستوون)ی هەیە. ناوێکی تر: حم من (و) Hm mn(.w) هەیە واتە خزمەتکاری خوداوەند (من).[65] لەوەش نزیکتر لە هامان ناوی همنن hmnn کە نازناوی کەسێکە بە ناوی پنن Tnn [66] کە ئەمەیان زۆ نزیکترە، بگرە نازناویشە و لەوانەیە لە بنەماڵەی ١٩، کاتی

---

[65] Hermann Ranke, Die Ägyptischen Personennamen, B.1, S.239.
[66] Ibid, S.229.

سەرچاوەی (رانکە) بۆ ئەو ناوە و ئەو نازناوە کتێبەکەی (زێتە)یە: بەڵگەنامەکانی میسر، بنەماڵەی ١٨، بەرگی ٤. هێمای (هـ)ی ناوی همنن لە دەقە هیرۆگلیفییەکە کەمێکی سڕاوەتەوە، بەڵام ئاشکرا دیارە. زیتە پەراوێزێکی لە تەنیشت دێڕی ٣ داناوە و ناوەکەی نووسیوە:

Kurt Sethe, Urkunden der 18. Dynastie, B.4, 1007, *l*.3.

**ڕەمسیسی دووەمیش نازناوی وا هەبووبێت. بە کورتی، دۆزینەوەی ناوی نزیك لە هامان، کارێکی گران نییە، بەڵام گرنگ بەڵگەی تەواوە لەسەر ئەو کەسە نەك پەلەکردن لە بڕیاردان.**

## بەشی پێنجەم:
## بینای خشت

کاری بەرد سەرەتا لە میسر بڵاونەبوو. پێشەنگی بەردکاریش فیرعەونی بنەماڵەی سێیەم، جۆسەر (نترئیخت) بوو. هەرەمەکان لە پادشانشینی کۆندا بە بەرد دەکران، بەڵام لە پادشانشینی ناوەڕاستدا بوون بە خشت، لەکاتێکدا لە پادشانشینی نوێ چیتر هەرەم دروست نەدەکرا. رەمسیسی دووەمیش سەر بە پادشانشینی نوێ بوو. بەڵێ بینای بەرد زۆر بوون، بەڵام مەبەست ئەوەیە ئەو قسەیەی کە بە ڕەهایی میسر وەك خاوەن شارستانیەتی بەرد وەسف دەکات، قسەیەکی سادەیە و بەڵگە لە نەزانیی خاوەنەکەیەتی سەبارەت بە مێژووی کۆنی میسر.

لە میسر نەك تەنها بینای گرنگ، بەڵکو تەنانەت هەرەمیش بە خشت دروست دەکران، بۆ نموونە: هەرەمێکی نیوە ڕووخاوی سنوسرتی سێیەم لە بنەماڵەی دوانزەم (دەوڵەتی ناوەڕاست) کە بە خشتی کاڵ دروستکراوە، لە دەوروبەری (دەهشور) کە ساڵی ١٨٩٤ جاك دو مورگان دۆزیبوویەوە.[٦٧] پێتری ساڵی ١٨٨٨ پاشماوەی هەرەمێکی خشتی دۆزییەوە کە تابووتی ئامنمحاتی سێیەم و تابووتی کچەکەی گرتبووە خۆ. لە شوێنێکی تر هەرەمێکی خشتی سنوسرتی دووەمی دۆزییەوە[٦٨]. ئاواش بەم شێوەیە: لە سەرەتای سەدەی بیستەم دوو هەرەمی گەورەی خشت،[٦٩] باسی هەرەمەکانی بنەماڵەی دوانزەیەم دەکات، کە زۆربەی بە

---

[٦٧] زاماروفسكي، اصحاب الجلالة-الاهرامات، ص١٠٧.

[٦٨] زاماروفسكي، ص١١١.

[٦٩] زاماروفسكي، ص١١٤.

خشت کرابوون،[٧٠] یەکەم هەڕەمیش هی جۆسەر، پادشای بنەماڵەی سێیەم بوو، کە گەشەکردنی مەستەبەیە، بەڵام لەجیاتی خشتی کاڵ بە بەرد بوو.[٧١]

ئەگەر باسی سەردەمی ڕەمسیسی دووەمیش بکەین، ئەوا ئەو سەردەمە وەکو هەموو سەردەمێکی تر بینای خشتی هەبووە. لە میسر هەروەك وڵاتی دووڕووبار، خشتەکان مۆری ئەو پادشاییەی خاوەن بیناکەی لێدەدرا.[٧٢] هێشتاش هەندێك بینای خشتی کاڵی سەردەمی بنەماڵەی یەکەم و دووەم (دەوروبەری ٣٠٥٠–٢٦٨ پ.ز) باش ماون.[٧٣]

لەو کاتەش زیاتر و زیاتر بەرد بەکاردەهات، ئەویش لە مۆنۆمێنتی جەنائیزی و لە پەرستگە بۆ ئەو کەسانەی دەرەقەتی دەهاتن. خشتی کاڵ وەکو کەرەستەی ستانداردی بینای نیشتەجێ مایەوە. ئەو خشتە هەرزان بوو و زوو بەدەستەوە دەهات، تەقدیرێکیش هەیە کە یەك کەس دەتوانێت ڕۆژی ٧٥٠ خشت دروست بکات.[٧٤] بەڵام بۆ میسری کۆن ژمارەکە نەختێك لەوە کەمترە، چونکە خشتەکان گەورەتر و قورستر بوون.[٧٥]

لە گۆڕی (رخ می رع) وێنەی کرێکاری میسری و سووری و نووبی هەن کە لەژێر چاودێرییەوە خشت دروست دەکەن[٧٦]، رخ می رع وەزیر بوو لە سەردەمی تحوتمسی سێیەم و ئامنحوتپی دووەم و گۆڕەکەی گەورەترین گۆڕی تایبەتە (واتە

---

[٧٠] زامارۆفسکي، ص١٤٠.

[٧١] زامارۆفسکي، ص١٩٥.

[72] Peter Lacovara, Bricks and Brick Architecture, in; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt; vol.1, p.200.

[73] Ibid, p.198.

[74] Ibid.

[75] A. J. Spencer , Brick Architecture in Ancient Egypt, p.4.

[76] P. Lacovara, Bricks.., p.199.

هی پادشا نەبێت). میسری ئەو سەردەمە ئەوپەڕی بەهێز و دەوڵەمەند بوو، کەواتە بۆچی کاری خشت بکرێت؟

لە بنەماڵەی ١٩ خشت بە ناوی رەمسیسی یەکەم نەدۆزراوەتەوە، کە کەم حوکمی کردبوو، جێگرەکەی: سێتیی یەکەم، ناوی هەبووە لە خشتەکانی ئەبیدۆس و عەمارە رۆژئاوا (باکووری سوودان). تاکە پادشای ئەو بنەماڵەیەش کە ناوی لەسەر خشت هەیە، رەمسیسی دووەمە، کە خشتەکانی لە تیبە و (مطمر) هەن. زۆربەی زۆری ئەو خشتەی تیبە لە رامسیومەوە هاتبوو، هەرچەندە دواتر کە بۆ بینای تر بەکارهاتن برانە شوێنی تر.[٧٧] بە واتایەکی تر ژمارەی خشتی سووتێنراو ئەوەندە زۆر بوو دەبران بۆ شوێنی تر بۆ ئەوەی جارێکی تر بەکاربهێنرێنەوە، ئەمەش وەك بینیمان هی پەرستگە جەنائیزییەکەی رەمسیسی دووەمە، ئەگەر حسابی ئەوە بکەین فیرعەونی قورئان بێت، داوای دروستکردنی بینایەکی کردووە لە خشتی سووتێنراو.

نووسەری کتێبەکە نموونەی زۆری مۆری خشتی داناوە کە هەوڵی داوە هیچ بەجێ نەهێڵێت مەگەر ئەو خشتانەی بڵاونەکراونەتەوە.[٧٨]

نموونەش لەسەر بیناکان کۆشکی مرنپتاح لە (منف) بەرد بۆ لاتەنیشتەکانی دەرگا و سەردەرگا بەکارهاتووە، بەڵام زۆربەی بیناکە بە خشتی کاڵە.[٧٩]

کۆشکی رەمسیسی دووەمی باوکی لە پەرستگە جەنائیزییەکەی (رامسیوم) بەشێویەکی سەرەکی لە خشت بوو، لەکاتێکدا بەرد بۆ لاتەنیشتی دەرگا و سەردەرگا و پایە... تاد، سەقفیش لە قەوسی خشت، بەڵام ئەمیان نەماوە.[٨٠]

---

[77] A. J. Spencer, Brick Architecture in Ancient Egypt, p.145.
[78] Ibid, p.144.

وێنەکانیش لە لەوحەکانی (٢١-٣٦)دان.

[79] Ibid, p.84.
[80] Ibid, p.85.

خشت بۆ سەقفکردنیش بەکاردەهات. نووسەری بابەتەکە دەڵێت: عەمبارەکانی رامسیوم نموونەیەکی باشن بۆ مانەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر.[٨١] خشت هەروەها بۆ فەرشی زەوی و بۆ بناغە بەکارهاتووە.[٨٢]

لە بیناکانی رەمسیسەکان (کۆتایی بنەماڵەی نۆزدە و بنەماڵی بیستەم) خشتی سوورەوەکراو بۆ هەندێك حاڵەتی تایبەت بەکاردەهات.[٨٣]

کۆنترین نموونە لەسەر بەکارهێنانی خشتی سووورەوەکراو، لە پاشانشینی ناوەڕاست بوو، لە قەڵاکان لە نووبە و بۆ فەرشی سەقف بەکارهاتبوو، چونکە زیاتر لە خشتی کاڵ بەرگەی شێ و ئاوی دەگرت. لە پادشانشینی نوێ بەکارهات بۆ سەرەوەی گۆڕەکان لە تیبە. ئەو خشتە قوڕەش کە مۆری خاوەنەکەی پێوە بوو، لە گۆشەکاندا دادەنرا.[٨٤] بەڵام ئەم بەکارهێنانە لەو کاتەدا واتای ئەوە نییە میسرییەکان نەیاندەزانی خشتی سوورەوەکراو چییە، چونکە لە سەردەمەکانی پێش بنەماڵەکانەوە لە هەندێك شوێن بەکارهاتبوو، بەڵام بۆ مەبەستی تایبەت، ئەویش دروستکردنی تەنووری برژاندنی دانەوێڵە.[٨٥]

خشتی کاڵ زۆر بۆ دروستکردنی شوورا بەکاردەهات، بۆ نموونە شوورای چواردەورەی پەرستگەی ئامون–رع لە پەرستگەی کەڕنەك لە وئست wAst (تیبە– الاقصر) کە ١٢ مەتر ئەستوور بوو و لاکانی دەوروبەری ٥٠٠ متر بوون و لە بەرزترین شوێنی ٢٥ مەتر بەرز بوو، وادیارە لەلایەن پادشایەکی بنەماڵەی سییەم (سەدەی چوارەمی پێش زایین) دروستکرابوو، بەڵام پێش ئەوەش شوورای زۆری تر هەبوون لادەبران و هی نوێیان لەجیاتی دروستدەکران، وەك شووراکەی

---

81 P. Lacovara, Bricks.., p.200.
82 A. J. Spencer, Brick Architecture .., p.119ff.
83 Ibid, p.4.
84 Ibid, p.140.
85 Ibid, p.7.

تحۆتمسی سێیەم کە پێشر شوورای خشتی کاڵ بوو و وێرانبوو و ئەو لایبرد و شوورایەکی بەردی دروست کرد و شوورایەکی خشتی کاڵی بە چواردەوری دەریاچەی پیرۆزدا دروست کرد.[٨٦]

جێگەی خۆیەتی بڵێین کە نووسەری کتێبی (تەلارسازیی خشت لە میسری کۆن) لە سەرەتای کتێبەکەی باسی دیدی یەکلایەنە بۆ مێژووی میسر دەکات: زۆربەی هەرە زۆری بیناکانی میسری کۆن بە ڕیگە خێراتر و کەممەسرەفتر کرا، ئەویش خشتی کاڵ کە لەژێر خۆر وشکدەکرایەوە. بڕێکی چاکیش لەو بینایانە هێشتا ماونەتەوە، بەڵام ئەمانە کەمێکن لەوەی کاتی خۆی هەبوون. ئێستا شارانێکی بەتەواوەتی لەناوچوون و تەنها پەرستگەکان ماون، ئەوەش وایکرد دیدێکی یەکلایەنە بۆ ژیان لە میسری کۆن دروست ببێت.[٨٧]. واشی بۆ دەچین کە بیناکانی خشتی سوورەوەکراو لەبەر ئەوە فەوتاون چونکە ئەو خشتە بە ئاسانی و بە زیانێکی کەمەوە دەردەهێنرێت، بۆ ئەوەی جارێکی تر لە بینای تردا بەکاربهێنرێت، ئەوەش بە پێچەوانەی بینای بەردەوە کە بردنیان لە توانای خەڵکی ئاساییدا نییە، بەتایبەت ئەگەر هی پەرستگەکان بن، هەروەها خشتی کاڵ کە بۆ بەکارهێنانەوە بەکەڵك نایەن.

ڕەمسیسی دووەم کاری بیناکانی لە پایتەختەکەی بە دیلە ئاسیاییەکان دەکرد، بەڵام خەڵکی ئازادی ئاسیاییش کاریان دەکرد. هەروەها کۆچەرەکانی وەك (عابیرو). ئەوانە بۆ بیناکانی پی-ڕەمسیس خشتی کاڵیان دەکرد و بەردەکانیان ڕادەکێشا.[٨٨]

---

[٨٦] د. محمد عبدالقادر محمد، اثار الاقصر، الجزء الاول، ص ٢٧-٢٩.

[87] A. J. Spencer, Brick Architecture.., p. 1.

[٨٨] نوبلکور، رمسیس الثاني، ص٢٣٦. بڕوانە هەروەها: نیقولا جريمال، تاريخ مصر القديمة، ص٣٣٦.

دەمێنێتەوە موناقەشەیەك لەوانەی سەرەوە گرنگتر و کورتتر، ئەویش مەعقوولیەتی داواکەی فیرعەون:

فیرعەون کە ئەو داوایەی کردبوو بۆ ئەوەی تەماشای خوداکەی مووسا بکات، ئایا مەعقوول دەبوو بینایەکی بەردی دروست بکردایە بۆ ئەو مەبەستە، یان بەس بوو بە خشت بیکات؟ هەڵبەت ئەگەر داواکەی فیرعەون بینایەکی بەرد بووایە، دەبوایە پرسیاری ئەوەمان بکردایە: ئەی خشت ئاسانتر و خێراتر نەبوو؟ ئەو داوایە دوو جار لە قورئاندا باسکراوە، بۆیە پێدەچێت تەنها قسە بووبێت، جۆرە گاڵتەجاڕییەکیشی تێدایە، ئەویش ئەگەر باوەڕ بە باسەکەی تەورات بکەین کە ئیسرائیلییەکان بۆ دروستکردنی خشت بە سوخرە گیرابوون، واتە گاڵتەکردنە بە مووسا کە بۆ بینینی خوداکەی و خودای ئیسرائیلییەکان، بینایەك دروست دەکات بە خشت ئەویش بە کاری سوخرەی خودی ئیسرائیلییەکان. بێگومان بۆ مەبەستێکی وەك ئەوەی فیرعەون خشتی سوورەوەکراو لە هەموو ڕوویەکەوە گونجاوترە لە خشتی کاڵ یان بەرد.

شوێنی خۆشیەتی باس بکرێت کە ئەوانەی ڕەخنە لە قورئان دەگرن، لەخۆیانەوە باسی بیناکەی هامان وەك بورجێك دەکەن و ڕەخنە لەوە دەگرن گوایە ئەمە تێکەڵکردنێکە موحەممەد کردوویەتی لەگەڵ بورجی بابل کە بە خشتی سوورەوەکراو دروست کرابوو، وەك لە سیفری تەکوین باسکراوە (بۆ نموونە لە سایتێك بە ناوی مولحیدە عەرەبەکان)، ئەمەش ڕەخنەیەکە بە ئارەزوو، چونکە چیرۆکەکەی بورجی بابل نەك تەنها دوورە لە عەقڵ، بەڵکو لەگەڵ ئیسلامیش ناگونجێت، تا پیغەمبەر بە باشی بزانێت بەکاری بهێنێت. جگەلەوەی کە ئەو تێکەڵییە زۆر نامەعەقوولە، چونکە باس لە دوو سەردەم و دوو ڕووداوی زۆر لە یەك جیاوازن، یەکێکیان دوای لافاوەکەی نووح و ئەوەی تریان کاتی فیرعەون، یەکێکیان باسی خەڵکی دوای لافاو کە لە دەشتاییەکانی بابل نیشتەجێبوون و بورجێکیان لە خشتی کاڵ دروست کرد و گوایە خودا هاتەخوارەوە و وتی ئەم

خەڵکە چییان بوێت بۆیان دەکرێت، لەبەر ئەوە با زمانەکەیان بشێوێنن، چیرۆکەکەی قورئانیش باسی میسر لە سیاقێکی زۆر واقعیدا دەکات: پادشایەك باوەڕی نییە بە قسەکانی پیغەمبەرێك سەبارەت بە خودای زەوی و هەموو ئاسمانەکان، بۆیە بە گاڵتەجاڕییەوە داوا لە کەسێکی دەستڕۆیشتووی نزیکی خۆی دەکات بینایەکی بۆ دروست بکات بۆ ئەوەی تەماشای خودای ئەو پێغەمبەرە بکات، کە وەك وتمان هەردوو جارەکە تەنها قسە بوو. ئەوانەی کە ئەو جۆرە ڕەخنانە دەگرن، هەر ئەوەندە شتێك لە دوور یان لە نزیك لە تەورات ببینن لە باسێکی قورئان بچێت، دەیکەنە سەرچاوە بۆی، کارەکەشیان وەکو کاری ئەوانەی شارەزایی مێژوویان نییەو هەر کە ناوی شوێنێك لە دەقێکی کۆندا دەبینن، کەمێك لە ناوی شوێنێك بچێت کە دەیناسن، یەکسەر دەیکەنە ئەو شوێنە، بێئەوەی بپرسن لە بەڵگەکانی دەقەکە و ئەو سەردەمە و بەڵگەی زمانەوانی... تاد.

## بەشی شەشەم:
## فیرعەونی خاوەن (وەتەد)ـەکان

دوو جار وەسفێکی تایبەت بە فیرعەون لە قورئاندا هاتووە، ئەویش (فرعون ذو الاوتاد)، واتە فیرعەونی خاوەنی مێخەکان:

١- سورەتی (ص): كذبت قبلَهم قوم نوحٍ وعادٌ وفرعَون ذو الأوتاد {ص/١٢}.

٢- سورەتی (الفجر/١٠): ألم تر كيف فعل ربك بعادٍ {٦} إرم ذات العماد {٧} التي لم يخلق مثلها في البلاد {٨} وثمود الذين جابوا الصخر بالواد {٩} وفرعون ذي الأوتاد {١٠} الذين طغوا في البلاد {١١} فأكثروا فيها الفساد {١٢} فصب عليهم ربك سوط عذابٍ {١٣} إن ربك لبالمرصاد {١٤}.

تەفسیرە کۆنەکان سەبارەت بە واتای مێخەکان چەند شتێکیان وتووە کە سێ جۆرن:

١-مەنتقییە لەڕووی بەراورد لەگەڵ تەجروبە و ئایەتی تری قورئان، بەڵام لە هەمان کاتدا بێ بەڵگەی مێژوویی یان بەڵگە لە قورئان و فەرموودە، ئەویش کە مێخەکان بریتین لە سەربازەکان یان سەربازی زۆر[٨٩]. بۆیە دەشڵێم مەنتقییە، چونکە لەگەڵ تایبەتییەکانی تری فیرعەون وەك پادشایەك، دەگونجێت، بەتایبەت کە لە قورئاندا باس لە سەربازەکانی کراوە، بەڵام ئەو باسە لە قورئاندا بەس نییە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر تەفسیرەکە.

٢-مەنتقییە لەڕووی واتاسازییەوە و دیسان بەڵگەی لەسەر نییە لە قورئان و فەرموودەدا، ئەویش کە تەفسیرێکی ترە: مێخەکان بریتین لە بیناکان، واتە فیرعەون خاوەنی بینای زۆر بووە، وەك لە تەفسیری تەبەری و قورتوبیدا هاتووە: واتە خاوەن بینای زۆرە، بە بیناش دەوترێت مێخەکان. دەشڵێم مەنتقییە لەڕووی واتاسازییەوە، چونکە وەرگرتنی واتایەکی نزیك لە واتای ناسراوی مێخ.

---

[٨٩] تفسير ابن كثير، ج ٨، ص ٣٩٧، تفسير سورة الفجر.

تەفسیرێکی نزیکتریش ئەوەیە بینای بەرزی هەبووە، هێندە مانەوە وەکو مێخیان لێ هاتبوو، ئەم تەفسیرەش (المبرد) وتوویەتی (هامشەکەی نیزامولدینی قومیی نیسابووری)[٩٠].

٣-واتایەك مەنتقی نییە و دیسان بەڵگەی لەسەر نییە لە قورئان و فەرموودەدا، ئەویش کە فیرعەون مێخی بەکاردەهێنا بۆ بەستنی دەست و قاچی خەڵك بۆ ئازاردان و کوشتنیان (تەفسیری ئیبنو کەسیر و تەبەری[٩١])، لەوەش ناماقووڵتر ئەوەیە کاتێك ئاسیای ژنی فیرعەون باوەڕی هێنا، چوارپەلی بە چوار مێخ بەست و دەستاڕێکی خستە سەرپشتی تا مرد. ناماقووڵیی ئەوەش بریتییە لە بچووککردنەوەی هۆکاری ناوبردنەکە لە قورئاندا بۆ یەك حاڵەتی تاك. تەفسیرێکی تری نامەنتقیش ئەوەیە فیرعەون یاریگەی هەبوو، مێخ و تەناف تێدا هەبوو (تەفسیری ئیبنو کەسیر و تەبەری) کە نە پەیوەندیی بە تایبەتییەکانی فیرعەون لە قورئاندا هەیەو نە هیچ بەڵگەیەکی لەسەرە. تەبەریش ئەو دوو تەفسیرەی بە پەسەندترین تەفسیر زانیوە، واتە مێخی هەبوو بۆ ئەشکەنجە، یان بۆ یاریکردن و دەڵێت ئەو شتە لە واتای مێخ دەگەین، واتە تەفسیرەکەی گەڕاندووەتەوە بۆ واتای ناسراوی وشەکە لە زمانی عەرەبی.

لەڕووی زانیاریی مێژوویی نوێشەوە دەتوانرێت مەبەست لە مێخەکانی فیرعەون بە چەند جۆرێك روونبکرێتەوە کە هەموویان پەیوەندییان بە واتای بیناوە هەیە:

---

[٩٠] هامش نظام الدين النيسابوري على تفسير الطبري، ج٢٣، ص٨٦.

[٩١] تفسير الطبري، ج ٢٣، ص٨٣.



پەرستگەی جەنائیزیی رەمسیسی دووەم (رامسیوم)

١- بینا بە شێوەیەکی گشتی، ئەویش چونکە رەمسیسی دووەم ئەو فیرعەونە بوو کە زۆرترین بینای کردبوو.[٩٢] ئەمەش ڕاستە بۆیە لای شوێنەوارناسان و مێژووناسان ڕەمسیس بە بنیاتنەری گەورە دەناسرێت: (لەنێوان ئەو دەروازانەی لە بیبلۆس (جبیل لە لوبنان/ف.ق) و یافا لە رۆژهەڵات، دروستکرابوون، تا پەرستگەیەك لە ناپاتا (لە باکووری سوودان/ف.ق) ماوەی ١٩٠٠ کیلۆمەتر زۆرترین بینا و مۆنیۆمێنی رەمسیسی دووەمی بوون لەچاو هەر فیرعەونێکی تردا)[٩٣]. کیتچن کە ئەمە دەڵێت بیناکانی رەمسیس دەژمێرێت. زانراویشە کە رەمسیسی دووەم ناوی پادشایانی پێش خۆی لەسەر هەندێك نووسینی بیناکان، بە ڕەمسیس یەکەمی باپیرییەوە، ناوی خۆی لەسەر نووسیوە. رەمسیس ناوی چوار پادشاکەی

---

[٩٢] بڕوانە بۆ نموونە:

Saifullah, David & Ghoniem, The Identification Of Pharaoh During The Time Of Moses: http://www.islamic-awareness.org/Quran/Contrad/External/mosespharaoh.html

ئەمە بابەتێکی دوورودرێژە لەبارەی رەمسیسی دووەمەوە وەك فیرعەونەکەی قورئان.

[93] K.A. Kitchen, Ramesses II, in ; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.3, p.117.

ڕاستەوخۆی پێش خۆی، سڕیوەتەوە لە دەروازەی دووەم و هۆڵە گەورەکەی ستوونەکانی کەرنەك.[٩٤]



**پەیکەری رەمسیسی دووەم-پەرستگەی ئەبو سمبل**

ئەم کارەی دەستگرتن بەسەر نووسینەکانی پادشایانی پێشوو، بەتایبەت لە بنەماڵەی نۆزدەیەم، دیارەدەیەکی ناسراوبوو لە پادشانشینی نوێدا.[٩٥] تەنانەت ئەم کارەی دزییە چەند جارێك لەگەڵ یەك نووسین دەکرا، وەك چۆن بەپێی بۆچوونی (ڕێدفۆرد)و کەسانی تر، خەرتووشەکان لە دیمەنەکانی جەنگ لە دەرگای دەرەوەی رۆژئاوا لە هۆڵی ستوونەکان، چەند جارێك لەسەریان نووسرابوون لەلایەن رەمسیسی دووەم و دوای ئەو مرنپتاحی کوڕی و ئامنمیسی

[94] Peter J. Brand, Usurped Cartouches of Merenptah at Karnak and Luxor, p. 1.
[95] Ibid.

کوڕی ئەم و سێتیی دووەمی کوڕەکەی تری مرنپتاح.[٩٦] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بینا و مۆنیۆمێنتانەی رەمسیس دەستی بەسەردا گرتبوون، شتێکی کەمبوون لەچاو ئەوانەی خۆی بینای کردبوون.



٢- مێخەکان بریتین لەو ستوونانەی ناو ئەو بینایانەی رەمسیس دروستی کردوون: وەك تەواوکارییەکەی لە هۆڵی ستوونەکان و پەرستگەی جەنائیزیی رامسیوم و شوێنەکانی تر، ئەوانەی لە شێوەی رووەکەی (بەردی)و ئەوانەی لە شێوەی گوڵی (لوتس). زۆربەی بیناکانی رەمسیسیش فەوتاون و دیارە ئەگەر بمانایە ستوونی زیاتریان دەردەخست. ئەمەش لە ستوونە ئۆزیرییەکان، بەم شێویەش ڕێی تێدەچێت مەبەست لە ستوونەکانی بینا بێت.

لە نووسینی هیرۆگلیفی و بەپاڵ هێمای ستوون کە تاجەکەی لە شێوەی بەردی یان لوتسە، هێمایەیەکی هاوشێوەی خاوەن تاجی ڕووەکی (بەردی)و جیاوازییەکەی ئەوەیە بنێکی لەژێرە، واتای ستوونێك لە شێوەی بەردی.[٩٧] وشەکە

---

[96] Ibid, p.5.

بڕوانە بابەتەکەی سەرەوە بۆ ئەمەو موناقەشەی نووسەر کە دەستگرتن بەسەر نووسینەکاندا لەوێ بەشێوەیەکی تر بوو: ئمنمس ناوی مرنپتاحی بە چڕی سڕیبووەوە، بەڵام بۆ ئەوەی وەلی عەهدی مرنپتاح سێتیی دووەم، بسڕێتەوە و دواتریش سێتیی دووەم ئەو شوێنە بەتاڵانەی بەکارهێنا بۆ نووسینی خۆی.

[97] Vincent Brown, The Concept of the Djed Symbol, http://www.pyramidofman.com/Djed/

ئەوەی سەرەوە بابەتێکی بەسوودە سەبارەت بە ستوونی (جد). هێماکە و واتاکە لەم فەرهەنگەی زمانی میسریی سەردەمی ناوەڕاستدایە:

Raymond Faulkner, Concise Dictionary of Middle Egyptian, p.55.

(وئج) wAD نزیکە لە وشەی وەتەدی عەرەبی. بڕوانە خوارتریش بۆ نزیکیی جۆرێکی تری ستوون (جد) Dd لە هەمان وشەی عەرەبی.

٣- مێخەکان (وەتەدەکان) بریتین لە میلەکانی (مەسەللەکانی) رەمسیسی دووەم، ئەمەش بۆچوونی دوکتۆر راشد ئەلبەدڕاوییە. ئەو دەڵێت کە مەسەللە لە وەتەد (مێخ) دەچێت، بەڵام نووکەکەی ڕووەو خوارەوە دانراوە، بۆیە قورئانیش باسی وەتەدەکانی فیرعەونی کردووە، چونکە رەمسیس زۆرترین ژمارەی هەبووە: ئەلبەدڕاوی بەپێی سەرچاوەیەك مەسەللەکان دەژمێرێت کە ٣٠ دانە بوون پێش رەمسیس، لەکاتێکدا رەمسیس بە تەنیا ٣٥ ی دروستکردبوو. ئەو دەڵێت کە وەتەد پارچە تەختەیەکە سەرێکی تیژەو لە دیوار یان زەوی دەچەقێنرێت، بۆیە هەرچەندە رەمسیس بینای هەبووە ستوونی زۆر بووە، بەڵام مەبەستی قورئان لە مەسەللەکانە.[98] کە ئەمە بۆچوونێکە بەهێزە، بەڵام هێشتا بەپاڵ ئەو میلانە، بیناکان و بەتایبەتی توخمەکانی تری بینا، ستوونەکان، ستوونەکان (جد)، دەچنە پاڵ وەسفی مێخ لە قورئاندا.

لێرە بۆچوونی خۆمان دەخەینە ڕوو:

دەتوانین بیناکان بە مێخ بزانین، دەتوانین زیاتریش ستوونەکان بە مێخەکان بزانین، لەوانیش زیاتر مەسەللەکان، بەڵام توخمێکی تری بینا کە پەیوەندیی بە

---

ئەم کتێبەش ئاماژە بۆ کتێبی (بەڵگەنامەکانی بنەماڵەی ١٨)ی (زیتە) دەکات:

K. Sethe, Urkunden der 18. Dynastie, B.3, 933, *l*.7.

ئەمە لە دەقێکی (من-خپر-رع-سنب) پێغەمبەری یەکەمی ئامون لە سەردەمی تحوتمسی سێیەم و ئامنحوتپی دووەم. سەیری ئەو بەرگەی کتێبەکەی (زیتە) بکە (٧ واتە دێڕی حەوتەم). هەروەها بڕوانە فەرهەنگەکەی والیس بەدج بۆ ئەو هێمایە:

E. A. Wallis Budge, An Egyptian Hieroglyphic Dictionary, Vol. 1, p. cxxviii.

[98] د. راشد البدراوي، موسى و هارون (عليهما السلام)، من هو فرعون موسى؟، قصص الانبياء، ج٤، ١٩٩٨، ل ٧٧٧ بەدواوە.

فەرمانڕەوایی پادشاکانی میسرەوە هەبووە، بە یەکێك لەو مێخانە بزانین، ئەو توخمەش بریتییە لە ستوونی (جد) یان (دد) کە وەکو دەنگ نزیکە لە (وەتەد) یان (وەتید)ی عەرەبی، کە لە زمانی عەرەبی هەروەها واتای سەقامگیری دەدات،[99] هەر واتای ستوونی جد کە نیشانەی سەقامگیرییە، هەروەها لە عەرەبیدا وشەی وەتید (موتود)ـەو بە وەتید دەڵێن (ودٌّ) وەك بڵێیت ویستیان بڵێن (وَدِد) ئیتر دالێکیان کردە (ت).[100]

## ستوونی (جد)

ستوونی جد ئەو ستوونە بووە کە پادشاکە لە جەژنەکانی (سد) Hb sd بەرزی دەکردەوە. ئەو ئاهەنگە یاخود ئەو فیستیڤاڵە لە نووسینە نوێکاندا وشەی (یۆبیل)ی بۆ بەکاردێت، چونکە وەکو ئاهەنگەکانی یۆبیلە. فیستیڤاڵەکە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ٣٠ی فەرمانڕەوایی پادشا دەگێڕدراو پاشان هەر سێ یان چوار ساڵێك دووبارە دەکرایەوە. مەبەستی فیستیڤاڵەکەش سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی پادشا بووە. ڕەمسیسی دووەم زۆرترین ئاهەنگی لەو جۆرەی گێڕابوو (چواردە دانە)و ئەوانەی دوایی دوو ساڵ جارێك بوون، چونکە باری تەندروستیی ڕەمسیس تێکچووبوو و هیوادار بوون فیستیڤاڵەکە پادشا لاوبکاتەوە و لە ئاهەنگی یۆبیلی



---

[99] ابن منظور، لسان العرب المجلد السادس، دار المعارف، ص ٤٧٥٧.

[100] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

دەیەم تا چواردەیەم بەردەوام بوو.[101]

لەدوای ساڵی فەرمانڕەوایی سییەم، فیرعەونەکان فیستڤاڵی (سد)یان دەگێڕا بۆ نوێکردنەوەی پاشایەتییەکەیان و هەر سێ یان چوار ساڵ دووبارەیان دەکردەوە، بۆیە لەوانەیە بۆ یەکەم جار بوو لە ماوەی ٧٥ ساڵ رەمسیسی دووەم لە ساڵی سییەمی ئەو ئاهەنگەی گێڕا (چونکە فەرمانڕەوایی هیچکام لە پادشاکانی ئەو ماوەیە نەگەیشتە سی ساڵ)، دوای ئەوەش زۆرترین یۆبیلی گێڕا بۆ باقیی ماوەی فەرمانڕەواییەکەی کە ژمارەیان گەیشتە چواردە. هۆڵێکی گەورەی یۆبیل بە پەلە لە پی- رەمسیس دروستکرا، ئەویش بە بەکارهێنانی بینا کۆنەکان، هەروەها هۆڵی جوانی رۆژئاوای پەرستگەی پتاح لە مەمفیس (من نفر).[102]

---

[101] نوبلکور، ص١٨.

[102] Kitchen, Pharaoh Ramesses II and his Times, p.769

## بەشی حەوتەم:
## ئایا فیرعەون بە خنکان مردبوو؟

لێرە بۆچوونێك دەخەمە ڕوو کە بە بڕوای خۆم پێشتر باس نەکراوە، ئەویش ئەوەیە کە فیرعەون لەگەڵ سەربازەکانی چووبووە ناو دەریاکە و خنکابوو، ئەو خنکانە مردن نەبوو، بەڵکو شتێك لە بابەتی لە هۆشخۆچوون یاخود غەیبووبە بوو، بەو حاڵەوە و ماوەیەك مایەوە و دواتر مرد.

بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە چەند شتێکن، یەکەمیان پرسیارە لەو ئایەتەی کراوە بە ئیعجازێکی قورئان، واتە: (فاليوم ننجيك ببدنك–يونس:٩٢)[١٠٣]، ئەگەریش گەیشتینە ئەنجامێکی یەقینی کە ڕەمسیسی دووەم فیرعەونەکەی قورئانە، مانەوەی مۆمیاکەی ئیعجازێکی قورئانییە، بەتایبەتی ئەگەر بزانین کە گۆڕەکەی ڕەمسیس و مۆمیاکەی تووشی دەستی دزەکان بوو، کە وەکو مۆمیاکانی تری فیرعەونەکان زۆر خراپیان بەسەر هێنان و کەلوپەلەکانیان دزین و تەنانەت لەفافی چواردەوری لاشەکەیان لێکردەوە بۆ بردنی شتەکانی ناوی. پادشاکانی دوایی مۆمیاکانی بنەماڵەی هەژدە و نۆزدەیان لە گۆڕستانی سێتیی یەکەم باوکی ڕەمسیس و گۆڕستانی ئامنحوتپی دووەم، شاردەوە، بەڵام دوای ماوەیەك ئەوەی سێتیی یەکەم تاڵانکرا و جارێکی تر مۆمیاکەی ڕەمسیس تووشی نەهامەتی بوو، تا دواجار لە شوێنێکی قایم شاردرایەوە، بەڵام شوێنێکی زۆر جیاواز لە گۆڕستانە ئەسڵییە کەشخە پڕ وێنەکانی خۆی.[١٠٤]

---

[١٠٣] لە تەفسیرەکان (بەدەن) بە چەند شتێك لێکدراوەتەوە: لەش، لەشێکی ساغ و لەتلەت نەبووە، زرێ. بڕوانە تەفسیری ئایەتەکە لای ئیبنو کەسیر.

[١٠٤] بۆ دزیکردن لە گۆڕستانە پادشاییەکان و بەتایبەت نەهامەتییەکانی گۆڕستانی ڕەمسیس و مۆمیاکەی، بڕوانە: نوبلكور، رمسيس الثاني، ل٤٢ بەدواوە.

پرسیارەکە ئەوەیە، ئەگەر مەسەلەکە ڕزگارکردنی لەشی فیرعەونە، بۆچی نەوترا (فاليوم ننجي بدنك)؟ واتە پرسیارە لە پیتی (ب)ی ئایەتەکە کە لە بائی سەبەبییە دەچێت، واتە لەشی فیرعەون هۆی ڕزگاربوونێتی (ئەمڕۆ ڕزگارت دەکەین بەهۆی لەشتەوە) یان دەبێت مەبەست لێی (و)ی عەتف بێت، واتە (ئەمڕۆ خۆت و لەشت ڕزگار دەکەین). بەهەرحاڵ هەبوونی پیتەکە تەفسیری نییەو وشەی (ننجيك) واتای رزگاربوونی هەیە، ڕەنگە هەبوونی ئەو بائە بووبێتە هۆی تەفسیرێکی تر بۆ (ننجيك)، ئەویش لە وشەی (نجوة) واتە بەرزایی زەوی، واتە لاشەی فیرعەون فڕێدرایە سەر بەرزاییەك.



پشکنینی مۆمیای ڕەمسیسی دووەم لەلایەن (١١٠) پزیشك و پسپۆڕە جۆراوجۆرەکان لە پاریس، ساڵی (١٩٧٦) و بۆ ماوەی حەوت مانگ،[١٠٥] ئەو بەڵگەیەی بەدەستەوە نەدا کە بەهۆی خنکانەوە یان بەهۆی ڕووداوێکەوە مردبێت[١٠٦]. باقی بەڵگەکانی تریش لەناوچوونی رەمسیس بە رووداو بەهێز ناکەن: رەمسیس چەند نەخۆشییەکی هەبووە، وەك داخورانی ئێسکەکانی شەویلگەی سەرەوە و خوارەوە، شوێنەواری هەوکردنی فەقەرەکانی مل، رەقیی دەمارەکانی ئەنیشکی و ڕان و قاچی، تێکچوونێکی تەواوی ئێسکەکانی دوو کلۆتەکە،

---

[١٠٥] كريستيان ديروش نوبلكور، رمسيس الثاني فرعون المعجزات، ص٥٤-٥٥.

[١٠٦] د. رمضان عبدة علي، رؤى جديدة، ص٦٤.

هەوکردنی ڕەقبوون لە جومگەکانی فەقەرەکان... تاد[107]. پشکنینەکان بەم جۆرە دەریانخست کە ڕەمسیس لە ساڵەکانی دوایی ژیانی ژمارەیەك نەخۆشیی تووش بووبوو و توانای نەبوو شوێنی ئیسرائیلییەکان بکەوێت.

خاتوو کریستیان دێرۆش نۆبلکور لە کتێبەکەی دەربارەی رەمسیسی دووەم، ناڕاستەوخۆ ئاماژە دەکات بۆ ئەو باوەڕەی کە رەمسیسی دووەم فیرعەونەکەی مووسا بوو و کە ئەو بوو لە دەریا خنکابوو. ڕەنگە باسنەکردنی ڕاستەوخۆ وەك ڕێزێك بووبێت بۆ کیچن کە یەکێك بوو لەو کەسانەی کتێبەکەی پێ پێشکەش کردن. ئەو دەڵێت کە ڕەمسیسی دووەم ئازاری زۆری هەبوو لە ددانەکانی و دواتر زیانی زۆر بە دوو شەویلگەکەی هاتبوو، دەمارەکانی مێشکیشی نزیکە تەواو داخران، بۆیە دەبێت زۆر بە زەحمەت جووڵابێتەوە و زۆر بۆ پێشەوە دەچەمییەوە کاتێك خۆی بە دارەکەی دەگرتەوە، بێگومانیش لە ساڵانی بیستەمی دوایەمینی تەمەنی تووشی هەوکردنی ڕۆماتیزمیی جومگەکان Spondylarthrite ankylosante بووبوو[108]. یەکێك لە زیانەکانیش کە پێی گەیشتبوو، ئەوە بوو کرکڕاگەی لووتی بە تەواوی وێران بووبوو، بەڵام ئەوە دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەوەی کە چەندین جار ئەو قولاپە بچووکانەی مۆخەکەی پێ دەردەکرێت، کاتی مۆمیاکردنی خنرابوونە لووتیەوە، بۆیە ئەو کاهنانەی کاری مۆمیاکردنیان دەکرد، تەواو پڕیان کرد بەبڕێکی زۆری بیبەری ڕەش[109].

نوبلکور دەڵێت کە رەمسیسی دووەم بەهۆی پیرییەوە ڕێکخستنی یۆبیلی شەشەم (ساڵی ٤٥ـەمی حوکمی) سپارد بە (خای)ی وەزیری[110]. بەتەماش بوو

---

[107] سەرچاوەی سەرەوە، ل٦١-٦٢.

[108] کریستیان دیروش نوبلکور، رمسیس الثاني فرعون المعجزات، ص٥٥-٥٦.

[109] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٧.

[110] سەرچاوەی سەرەوە ، ل ٣٦٧.

سوود له یۆبیلی حەوتەم (ساڵی ٤٨) وەربگرێت (بۆ نوێکردنەوەی هێزەکەی)، بەڵام بێسوود بوو، لەبەر ماندوویش پێدەچێت نەیتوانی بێت ئامادەی یۆبیلی هەشتەم بێت[١١١]. له یۆبیلی نۆیەمیش (ساڵی ٥٤) رەمسیسی دووەم گیانی دەدا[١١٢]. لەدوای یۆبیلی یانزەیەمیش که فیرعەونەکه تەقریبەن لەهۆش خۆی چووبوو و بەهیوای ئەوەی موعجیزەیەك ڕووبدات، یۆبیلەکان زووتر دەکران (لەجیاتی سێ ساڵ جارێك یۆبیلەکان دوو ساڵ جارێك دەکران) و ژمارەیان گەیشته چوارده یۆبیل و له ساڵی دوای ئەوه رەمسیسی دووەم مرد.[١١٣]

ئەم حاڵەتەی فیرعەونەکه ئەگەر لەیەك بدرێت لەگەڵ ئەو بۆچوونەی که فیرعەونەکەی مووسا خۆی بوو، وا پێویست دەکات دوو ئیحتیمال هەبن: یان ئەوەیه رەمسیسی دووەم بەو هەموو ئازار و بێتوانایییەوە (ئەگەر چاو له بێهۆشییەکەی بپۆشین) شوێنی ئیسرائیلییەکان کەوتبێت و دواتر خنکابێت، ئەو کاتەش پێویسته به عارەبانەیەکی سەربازی له شێوەی نەقاله برابێت و پێویسته ئەنجامی ئەو پشکنینه پیشتگوێ بخەین که بۆ مۆمیاکەی کرابوو و که دەریخستبوو فیرعەونەکه به خنکان نەمردبوو، بەتایبەت ئەگەر بزانین که پشکنینەکان لەڕووی درەوەی مۆمیاکەی کرابوو.[١١٤] بەڵام ئەمه کەمتر ڕێی تێدەچێت لەچاو ئەگەرەکەی تر، ئەویش که رەمسیسی دووەم کاتێك توانای ئەوەی هەبوو بجووڵێت، شوێنی ئیسرائیلییەکان کەوتبوو و لەگەڵ لەشکرەکەی خنکابوو، بەڵام بێئەوەی خنکانەکه واتای مردن بێت، واتا لەهۆش خۆی چووبوو و لەو کاتەوه لەنێوان ژیان و مردندا بووه.

---

[١١١] سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٧١.

[١١٢] سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٧٣.

[١١٣] سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٧٤.

[١١٤] سەرچاوەی سەرەوە، ل٥٩.

پشکنینی مۆمیای ڕەمسیسی دووەم دەریخستووە کە چەند کەرەستەیەکی پێوەیە: تەنۆلکەی لمی بیابان–دەریایی، کەواتە لە دەلتاو دوور لە ڕوباری نیل مۆمیا کرا. لەو مۆمیایە هەڵاڵە نەدۆزراوەتەوە کە سەرچاوەکەی ئاو بێت، بەڵکو هەڵاڵەی دانەوێڵە، بۆیە لە کێڵگە کشتوکاڵییەکانەوە نزیك بوو. هەروەها وردیلەی بەردی کوارتزیش دۆزرانەوە کە پێویستە سەرچاوەکەیان بریتی بێت لە میسری سەروو (باشوور)، بۆیە بەپێی دیرۆش–نۆبلکور سەرەتا لە باکووری میسر لە نزیك (پی– ڕەمسیس)ی پایتەخت مۆمیا کرابوو، شوێنەواری بەردی کوارتزیش شوێنەکەی ترە، ئەویش قەراغی چەپی شاری تیبە کە دواتر و کە مۆمیاکە تووشی زیان بووبوو بەهۆی دزەکانەوە، ویستیان چارەسەری بکەن.[١١٥] بەڵام بێگومان ئەو پرسیارەش دێتە ئاراوە: بۆچی هەڵاڵەکانیش هی ئەو کاتە نەبێت؟

ئایەتێك جێگەی سەرنجە سەبارەت بە خنکانی فیرعەون ئەمەیە: فأخذناه وجنوده فنبذناهم في اليم وهو مُليمٌ (الذاريات:٤٠).

تەفسیرەکان بۆ وشەی (مليم) واتای (ملوم) واتە لۆمەکراو دادەنێت، هەرچەندە ئەوەندەی بزانین کە (مليم) ناگونجێت ئەو واتایە بدات، چونکە پێویستە بۆ یەکێك بەکاربێت کە کارەکە ئەنجام بدات، ئەویش لۆمەکردن، ئەویش وەکو کرداری (اقام) کە دەبێتە (مقيم). ئەوەی گومانەکەمان سەبارەت بە واتەی لۆمەکردن بەهێز دەکات، ئەوەیە وشەکە دوو جار لە قورئاندا بەکارهاتووە، جارەکەی تر بۆ یوونسی پێغەمبەر: فالتقمه الحوت وهو مُليمٌ (الصافت:١٤٢).

کە دیسان واتەکە کراوە بە لۆمەکراو. ئەگەر سەربازەکانی فیرعەون لۆمەیان کردبوو بۆ چارەنووسەکەیان، لە حاڵەتی یوونسدا نازانین کێ لۆمەی کردووە، کە ڕێی تێ ناچێت هاوڕێکانی لە پاپۆڕەکە. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە لە هەر دوو بەکارهێنانی وشەکە لە قورئاندا باس لە دەریا یان ئاو و خنکان دەکرێت،

---

[١١٥] دیرۆش–نۆبلکور، ل ٥٦–٥٧.

ئەوەی زیاتریش دەبێتە جێگەی پرسیار، یوونس نەخنکا و دوایی ڕزگاری بوو (بەڵام بە لاوازی)، بەڵام بەردەوام مێشك بۆ خنكان و مردنی فێرعەون بچێت کە دوایی لاشەی ڕزگاری بوو.

بۆچوونەکەمان ئەوەیە بەکارهێنانی وشەکە تەنها لەو دوو شوێنە و بۆ یەك جۆر ڕووداو لە یەك ژینگە، لەخۆڕا نییە، ئەوەش جگە لە کێشە زمانەوانییەکە، بۆیە وای بۆ دەچین فیرعەون وەکو یوونس لە ئاوەکەدا خنکا، بەڵام خنکان بە واتای مردن نا، بەڵکو لەهۆش خۆچوون، بەو شێوەیەش مایەوە تا کاتی مردنی. ڕەنگە ئەوەش زیاتر گونجاو بێت وەك نیشانەیەك بۆ خەڵکی میسر کە دەبینن ئەوەی خۆی خستبووە ڕیزی خوداکان، جار لە دوای جار بێتوانایی خۆی دەسەلمێنێت، تا گەیشتە ئەوەی لە حاڵەتی بێهۆشیدا بمێنێتەوە.

ئەو ڕەخنەیەش ڕاست نییە کە ئەگەر لەهۆش خۆی نەچووبێت بۆچی دوای ئەوە کوڕێکی نەبووە پادشا، چونکە بەبێ ئەو بۆچوونەشمان ڕەمسیس لە حاڵەتی بێهۆشیدا بوو وەك چۆن جار لەدوای جار لە جەژنەکانی (سد) دەردەکەوتەوە: لە جەژنی هەشتەم (ساڵی ٥١) وا دیاربوو نەیتوانی ئامادە بێت و لە دوورەوە ئاگای لێ بووە. لە جەژنی نۆیەم (ساڵی ٥٤) لە سەرەمەرگدا بوو و برایە شوێنی نووستنی کاهنی گەورە، پتاح، لە من نفر، واتە خع—م=وئست، کە ئەمیان ساڵی دواتر مرد. لە دەیەم (ساڵی ٥٧) دیار بوو تەختی میسر بەتاڵ بوو، پێشتر مرنپتاحی کوڕی دەسەڵاتی زیاتر دەستدەکەوت لەکاتێکدا کوڕەکانی تر یەك لەدوای یەك دەمردن: مری ئەتوم (ساڵی ٤٧)، ڕەمسیسی سەرکردە (ساڵی ٥٠)، ئامون—حر—خپش—ف(یاخود ست—حر—خپش—ف) (ساڵی ٥٢)، خع=م—وئست (ساڵی ٥٥). یانزەیەم سد (نێوان ٦١—٦٢). (نۆبلکور) لێرە باسی حاڵەتی ڕەمسیس دەکات کە فەرمانبەرە گەورەکانی کارەکانی شتن و جوانکردن و جلکردنەبەریان بۆ دەکرد و هەموو کارێکیان بۆ ئەو کەسەی ((تەقریبەن لەهۆش خۆی چووبوو)) دەکرد، ئینجا بڕیاریان دا هەر دوو ساڵ، لەجیاتی سێ ساڵ،

جارێك فیستیڤاڵەكە بگێڕدرێت بەهیوای ئەوەی موعجیزەكە ڕووبدات و تا چواردەیەمین (سد)یان بۆ كرد، بەڵام بێسوود بوو و لە ساڵی (٦٧)ـەم گیانی لەدەست دا.[١١٦]

نەخۆشییەكانی ڕەمسیس كە پشكنینی پزیشكی دەریخستن، بوونە ڕێگر لەبەردەم زانینی ئەو وەك ئەو فیرعەونەی خنكا، لەوەی سەرەوەش دیارە كە ئەمە زۆر ڕاستە، بەڵام لەلایەكی ترەوە ناكرێت مرنپتاح بەو فیرعەونە بزانین ئەگەر ناوی (یسریئر)ی میلەكەی  بە ئیسرائیل بزانین، هەروەها بەڵگەكانی ڕەمسیس زۆرترن لە فیرعەونەكانی تر، بۆیە لەو حاڵەتەدا پێویستە یان بوترێت ڕەمسیس بەو وەزعەی شوێنی بەنو ئیسرائیل كەوتبوو، یان قبووڵی ئەوە بكەین كە ڕەمسیس لە دەریا نەخنكابوو، یانیش بۆ فیرعەونێكی تر بگەڕێین.

ئەوەی جێگەی سەرنجمان بوو و پاش وردبوونەوە لەو مەسەلەیە، بۆچوونێكی هاوشێوەمان بەرچاو كەوت، بەڵام ئەمیان هی لێكۆڵەرەوەیەكی تەوراتە كە فیرعەونەكە بە ئامنحوتپی دووەمی سەر بە بنەماڵی هەژدەیەم دەزانێت و كە لە بەشێكی پێشووتر ئاماژەمان بۆ كرد.

(پیترۆڤیچ) دەڵێت كە مووسا وتوویەتی بەهۆی فیرعەونەوە خودا بەرز ڕادەگیرێت، ئەویش بە تێكشاندنی لەشكرەكەی (دەرچوون ٤/١٤) بەڵام قەت باسی مردنی فیرعەونی نەكردووە[١١٧]. دەرچوون (٢٨/١٤) باسی گەڕانەوەی

---

[١١٦] بۆ ئەوانەی سەرەوە بڕوانە: نوبلكور، رمسيس الثاني، ص٣٧٠-٣٧٤.

[١١٧] لە وەرگێڕانی عەرەبیی (دار الكتاب المقدس) خودا بە مووسا دەڵێت: دڵی فیرعەن ڕەق دەكەم و وای لێدەكەم شوێنیان بكەوێت و فیرعەون و هەموو سەربازەكانی لەناو دەبەم، بەڵام ئەمە لە وەرگێڕانی تردا نییە، بەڵكو لەجیاتی لەناوبردنی باسی شكۆمەندی كراوە. بە هەمان شێوەش لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەكانیشدا نییە، وەك وەرگێڕانی شا جەیمس و وەرگێڕانی ستانداردی ئەمەریكی.. تاد. تەماشای ئەم لینكەی خوارەوە بكە بۆ وەرگێڕانە ئینگلیزییەكان (لەگەڵ دەقی عیبری):
http://www.hebrewoldtestament.com/B02C014.htm

و داپۆشینی عارەبانەکان و ئەسپەکان و هەموو لەشکری فیرعەون دەکات و هەموو لەشکرەکە لەناوچوو. هەروەها ئاماژەش بۆ مەزموورەکانی (١٠٦) و (١٣٦) دەکات و دەڵێت خوێندنەوەی پەلە بۆ دەقەکە وا دەکات زۆربەی خەڵك وا بزانن فیرعەون لەناوچووبو،[118]. وەڵامی ئەو ڕەخنەیەش دەداتەوە کە چۆن شکۆمەندکردنی خودا بەبێ کوشتنی فیرعەون دەبێت، بەوەی بەسەرهاتەکەی سەنحاریب، پادشای ئاشورمان دەهێنێتەوە بیر کە خودا شکۆمەندییەکەی دەستکەوت بە لەناوبردنی سەنحاریب، بەڵام خودی سەنحاریب هەڵهات.[119]

لە قورئان و لە هەموو جارەکانی باسی خنکانی لەشکرەکەی فیرعەون، تەنها یەك جار بە ڕوونی باسی ئەوە کراوە کە خودی فیرعەون خنکاوە:

*وإذ فرقنا بكم البحر فأنجيناكم وأغرقنا آل فرعون وأنتم تنظرون {٢/٥٠}.

* كدأب آل فرعون والذين من قبلهم كذبوا بآيات ربهم فأهلكناهم بذنوبهم وأغرقنا آل فرعون وكل كانوا ظالمين {٨/٥٤}.

* وجاوزنا ببني إسرائيل البحر فأتبعهم فرعون وجنوده بغيًا وعدوًا حتى إذا أدركه الغرق قال آمنت أنه لا إله إلا الذي آمنت به بنو إسرائيل وأنا من المسلمين {١٠/٩٠}. ئەم ئایەتە زۆر ئاشکرا نییە کە بەڕاستی خنکابێت.

* فأراد أن يستفزهم من الأرض فأغرقناه ومن معه جميعًا {١٧/١٠٣}. تەنها ئەمەیان ئاشکرایە کە تووشی حاڵەتی خنکان بوو.

* فأتبعهم فرعون بجنوده فغشيهم من اليم ما غشيهم {٢٠/٧٨}.

* ثم أغرقنا الآخرين {٢٦/٦٦}.

* فأخذناه وجنوده فنبذناهم في اليم فانظر كيف كان عاقبة الظالمين {٢٨/٤٠}.

---

[118] Douglas Petrovich, Amenhotep II And The Historicity of the Exodus-Pharaoh, pp.89-90.

[119] Ibid, p.90 n.44.

* فكلا أخذنا بذنبه فمنهم من أرسلنا عليه حاصبًا ومنهم من أخذته الصيحة ومنهم من خسفنا به الأرض ومنهم من أغرقنا وما كان الله ليظلمهم ولكن كانوا أنفسهم يظلمون {٢٩/٤٠}، خنكاندن لێرە مەرج نییە بۆ فیرعەون، چونکە پێشتر باسی قەومەکانی تر کراوە، بۆ نموونە (حاصبا) قارون و هامان و فیرعەون ناگرێتەوە، بەڵکو مەبەست قەومی لووتە کە پێشتر باسکراون، هەروەها پێش هەموویان باسی قەومی نووح کراوە.

*فوقاه الله سيئات ما مكروا وحاق بآل فرعون سوء العذاب {٤٠/ ٤٥}.

*فاستخف قومه فأطاعوه إنهم كانوا قومًا فاسقين {٥٤/٤٣} فلما آسفونا انتقمنا منهم فأغرقناهم أجمعين {٥٥/٤٣}.

*واترك البحر رهوًا إنهم جندٌ مغرقون {٢٤/٤٤}.

* فأخذناه وجنوده فنبذناهم في اليم وهو مليمٌ {٥١/٤٠}.

بەم شێوەیە تەنها یەك ئایەت صەریحە کە فیرعەون خنکا، بەڵام ئایا خنکانەکە مەرجە مردنی لەدواوە بێت؟ ئەوەی مردنەکە دووردەخاتەوە ئایەتی (فاليوم ننجيك ببدنك)ەیە کە لەسەرەوە باسمان کرد. هەبوونی پیتی (ب) ئەوەی تێکداوە کە تەنها لەشی ڕزگاری بووە، واتە مردووە. هەروەها پێویستە بۆ واتایەکی تر، جگە لە واتای لۆمەکردن، بۆ وشەی (مليم) بگەڕێین، کە لەگەڵ بەسەرهاتەکەی یوونسی پێغەمبەر بگونجێت.

لێرە باسەکە بە کراوەیی بەجێدەهێڵین، بەهیوای دەرکەوتنی بەڵگەی تر، لەوەی بڵاوبووەتەوە و ئاگامان لێی نییە، یان ئەوەی لە دواڕۆژ دەکەوێتە بەردەستی شوێنەوارناسان و مێژوونووسان.

## بەشی هەشتەم:
## نیشانەکانی مووسا و بەراوردیان لەگەڵ فیرعەونەکان بەتایبەت رەمسیسی دووەم

قورئان و تەورات باسی ژمارەیەك نیشانەی مووسا دەکەن کە پیشانی فیرعەون دراون. لێرەو لەبەر پەیوەندیی نیشانەکان بە هەندێك تایبەتمەندیی میسرەوە، باسیان دەکەین.

نیشانەکانی مووسا دوو جۆرن: جۆرێك پەیوەندیی بە فیرعەون یان فیرعەون و بنەماڵەکەیەوە هەیە (نیشانەی مارەکە و نیشانەی دەستەکە)و جۆرەکەی تر پەیوەندیی بە سەرجەم خەڵکی میسرەوەیە (لافاو و خوێن و بۆق و کوللە و قوممەل)، لەناو ئەو جۆرە گشتییەش و وەك دواتر باسی دەکەین، نیشانە هەن بەتایبەت بۆ رەمسیسی دووەم گونجاون: لافاو و خوێن و قوممەل، دوانی تریش بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ئەو گونجاون.

هەندێك جیاوازی هەیە لەنێوان موعجیزەکانی ناو قورئان و ئەوانەی ناو تەورات. لە خوارەوە ئەو موعجیزانەن باس دەکەین کە لە قورئان و تەوراتدا باسکراون، لەگەڵ جیاوازییەکانیان. لەبەر ئەوەش کە باسەکەمان بەراوردی قورئان و تەورات نییە، باسی هەموو جیاوازییەکان ناکەین:

١- دارەکەی مووسا کە دەبێتە مار.
٢- مووسا دەست دەخاتە ناو باخەڵیەوە و دەریدەکات و دەبێتە سپی و دەیخاتەوە ناو باخەڵیەوە.
٣- موعجیزەی خوێن: ڕووبار و بیرەکانیان دەبنە خوێن.
٤- بۆق: بۆق پڕی ڕووبار و ماڵ و کەلوپەل..ی فیرعەون و میسرییەکانی کرد.

٥- مێشووله: به لێدانی دارەکەی دەستی هاروون له خۆڵ، میسر پڕبوو له مێشووله (دەرچوون: ١٢/٧ بەدواوە)، لەقورئانیش دیسان تەنها ناوی نیشانەکە وتراوە.

٦- مێش. تەنها له تەورات وتراوە (١٦/٨بەدواوە).

٧- تیاچوونی مەڕومالاّت (١/٩بەدواوە).

٨- برین له لەشی ئاژەڵ و مرۆڤ (٨/٩بەد).

٩- تەرزە (١٣/٩بەد).

١٠- کولله (١/١٠بەد). له هەردووکیان هەیە، له قورئانیش باسکراوە، ئەویش تەنها به ناو.

١٠- تاریکی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ (٢١/١٠بەدواوە)

١٢- مردنی هەموو نۆبەرەیەکی مرۆڤەکان و ئاژەڵەکان به نۆبەرەکەی فیرعەونەوە (١/١١بەدواوە، ٢٩/١٢ بەدواوە).

١٣- قوممەل (وەکو خۆی دەینووسین) که له قورئاندا هاتووەو له تەورات باس نەکراوە.

له قورئاندا باسی نۆ ئایەت کراوە، به ژماردنیش: مارەکە، دەستەکە، لافاو، کولله، قوممەل (وەکو خۆی دەینووسین)، بۆق، خوێن. دوو نیشانەی تر دەمێننەوە. ڕەنگە یەکێکیان قاتوقڕییە که له ئایەتەکاندا پێشتر باسکراوە:

ولقد أخذنا آل فرعون بالسنين ونقص من الثمرات لعلهم يذكرون فإذا جاءتهم الحسنة قالوا لنا هذه وإن تصبهم سيئة يطيروا بموسى ومن معه ألا إنما طائرهم عند الله ولكن أكثرهم لا يعلمون (الاعراف: ١٣٠-١٣١).

رەنگە ئایەتی نۆیەم (رجز) بێت که پاش نیشانەکانی تر وتراوە:

( ولما وقع عليهم الرجز قالوا يا موسى ادع لنا ربك بما عهد عندك لئن كشفت عنا الرجز لنؤمنن لك ولنرسلن معك بنى إسرائيل ، فلما كشفنا عنهم الرجز إلى أجل هم بالغوه إذا هم ينكثون) (الاعراف: ١٣٤-١٣٥).

دوای مردنی نۆبەرەکان، فیرعەون ڕێگەی بە ئیسرائیلییەکان دا بچنە دەرەوە. داواکەی مووساش ئەوە بوو هەموو ئیسرائیلییەکان بە ژن و منداڵەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژەڕێ بچنە بیابان بۆ قوربانیکردن (٣/٥) بەڵام فیرعەون ڕازی نەدەبوو و دوایی، پێش نیشانەی کوللە، ڕازی بوو تەنها پیاوەکان بچنە دەرەوە(١٠/١٠-١١). دوای نیشانەی مردنی نۆبەرەکان و قبووڵکردنی دەرچوونی هەموو خەڵکەکە، فیرعەون بینی کە ئیسرائیلییەکان هەڵهاتن، بۆیە شوێنیان کەوت (٥/١٤ بەدواوە).

ئەوانەی سەرەوە بە کورتی نیشانەکانە لە قورئان و لە تەورات و ئەوەی جێگەی مەبەستە لێرە شیکردنەوەی نیشانەکانە بە بەراورد لەگەڵ ئەو کاتەی ئەوسای میسری فیرعەونی. پرسیارە پێویستەکەش ئەمەیە:

بۆچی بەتایبەت ئەو نیشانانە هاتبوون؟ واتە بۆچی نیشانەی تر نەبوون؟

ئەمەش شیکردنەوەی نیشانەکانە:

## یەکەم: نیشانەی مارەکە

لە میسری کۆندا مار وەکو هێمایەکی پادشایەتی بووە و دەسەڵات و پاراستنی فیرعەونەکەی نیشان دەدا. هەروەها هێمای کۆبرای ژنەخوداوەند (وئجت)ـە کە پادشا دەپارێزێت.[١٢٠] لە پایتەختەکەی ڕەمسیس، واتە پی-رعمسسو (پی-رمسیس) چوار ناوچەی شارەکە هەن کە هەر یەکێکیان سەر بە خوداوەندێکە، ئەوەی باکوور هی وئجتە.[١٢١]

[120] Pat Remler, Egyptian Mythology, p.194.
[121] Edgar B.Pusch & Anja Herold, Qantir/Pi-Ramesses , in; Encyclopedia of the Archaeology of Ancient Egypt, p.789-790.



له باشووری سەققارە نزیك هەڕەمی جدكئرع–ئیسیسی Djedkare-Isesi[122] گۆڕستانێكی مار دۆزراوەتەوە كە هەرچەندە نموونەیەكی تاكی ئەو ناوچەیەیە، بەڵام دەیسەلمێنێت كە گۆڕستانی ئاژەڵ تەنها لە ناوچەی گۆڕستانەكانی (منف) نەبووە، كە بە چڕی پشكنرابوو.[123] لە دەقەكانی ئەهرامیش و لە میانەی ئەو شتانەی مردووەكە دەیڵێت بۆ دەرباز بوون لە تەگەرە جۆراوجۆرەكانی بەردەم ڕێگەی بۆ باخەكانی ئەوە دنیا، مردووەكە ئەو شتانە دەڵێت بۆ پاراستنی لە مەترسییەكانی وەك مار و دووپشك.[124]

ئێمە دەتوانین لە پاڵ ئەو ئاماژەیەی مارەكەی مووسا بۆ ئەو مەترسییەی مار، وەكو ئاژەڵ، بۆ زیندووان و مردووان دروستی دەكات، ئاماژەیەكی تری ئەو مارەی مووسا بناسینەوە، ئەویش مارێكی ناودار، كە یەكێكە لە خوداوەندەكان، ئەویش عئپپ aApp (كە یۆنانییەكان ناویان نابوو ئەپۆفیس Apophis).

---

[122] جد=كئـ-رع Dd-kA-ra ناوی چوونە سەر عەرشە، ئیسسی issi ناوی لەدایكبوونێتی.

[123] Michael Jones; Saqqara, Serapeum and Animal Necropolis, in; Encyclopedia of the Archaeology of Ancient Egypt, p.870.

[124] Stephen E.Thompson, Textual Sources, Old Kingdom, in; Encyclopedia of the Archaeology of Ancient Egypt, p.977.

هەروەها:

Nicole B. Hansen, Snakes, in; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.3, p.297.

یەکەم جار لە سەردەمی ئینتقالیی یەکەم (سەدەی ٢٢– سەدەی ٢١ پ.ز) ناسرا، ئەو مارە بە دوژمنی نیزام، واتە (مئعت) mAat، زانرابوو.[١٢٥] دەقە جەنائیزییەکانی پادشانشینی نوێ، زۆربەی نموونەکانی تایبەت بە لایەنە ئەفسانەییەکەی پێشکەش دەکەن.[١٢٦] زۆر دواتریش، لە سەردەمی رەمسیسی سێیەم، پادشای ناوداری بنەماڵەی بیستەم، واتە بنەماڵەکەی دوای ئەوەی رەمسیسی دووەم و کە موعجەبی ئەو فیرعەونە بوو، ئەپۆفیس بوو بە بابەتی سرووتێك کە لە چەندین کتێبی جادوودا نووسرابووەوە[١٢٧]. ڕاستەکەشی ئەوەیە (ست)، دوژمنەکەی ئۆزیریس و خوداوەندی بنەماڵەی نۆزدەیەم و بەتایبەتی رەمسیسی دووەم، هەرچەندە هێمای نائارامییەکان بەهۆی بەدوای یەکداچوونی وەرزەکان (بەو واتایەش دژ بە مئعت بوو/ف.ق) بریتی نەبووە لە شەیتان، بەڵکو شەیتان ئەپۆفیس بوو، (ست)یش بە سوار بەلەمەکەی خۆرە و لە شەیتان، کە ئەپۆفیسە، دەیپارێزێت.[١٢٨] وێنەکە ست پیشان دەدات کە بە ڕمەکەی دەستی، شەڕ دژی ئەپۆفیس دەکات کە ڕێگەی بەلەمەکە دەگرێت و بەرگری لە خۆر دەکات.

لە کەژاوە ئاینییەکان و میهرجانەکانی سەر بە مانگ، شێوەی ئەپۆفیس بە رووەکی بەردی و مۆم دروست دەکرا و بە چەندین شێوە ئازار دەدرا، بۆ پیشاندانی سەرکەوتنی رەع و مئعت بەسەر فەوزا، کە ئەپۆفیس هێمایەتی.[١٢٩]

ماری کۆبرا (وئجت) کە خوداوەندێکی میسرییە، هێمای بەشی باکووری میسر بوو (میسری خواروو). وەك زانراوە کە لە سەردەمە کۆنەکان میسر دوو بەش بوو، سەروو و خواروو، داڵ (نخبت) لە شاری (نخن)  کە یۆنانییەکان ناوی

---

[125] Ibid.
[126] Richard H.  Wilkinson, The Complete Gods and.., p.221.
[127] Nicole B. Hansen, Snakes, op. cit, p.297.

[١٢٨] كريستيان ديروش نوبلكور، رمسيس الثاني، فرعون المعجزات، ص٥٨.
[129] Nicole B. Hansen, Snakes, op. cit, p.297.

(هیراکۆنپۆلیس–شاری هەڵۆکان)یان لێ نابوو، هێمای میسری سەروو بوو، لەکاتێك و وەك وتمان، وئجت هێمای میسری خواروو بوو. دوای یەکخستنی هەر دوو بەشەکە، دوو تاجی دوو بەشەکەی میسری، کە هەر بەشێك تاجی خۆی هەبوو، تێکەڵ کراو کرایە یەك تاج و دوو هێمای سەر ناوچەوانەکەش یەکخران و داڵەکە و مارەکە پێکەوە دانران.



لە تاجی (نمس nemes)یش هەردوو داڵ و کۆبراکە لە ناوچەواندا هەن. وئجت وەکو دایکێکی ئەفسانەیی و مامانی پادشا ڕەفتاری دەکرد.[١٣٠] لەو چیرۆکەش کە باسی دروستکردنی خوداوەندی هەوا (شو)و ژنەخوادوەندی شێ (تفنوت) لەلایەن (ئەتوم)ـە – ئەتوم خوداوەندی خۆرە لەکاتی ئاوابوون– چاوی ئەتوم بوو بە

[130] Ibid, p.298.

کۆبرا... تاد و کردیە سەر ناوچەوانی، لەمەشەوە کۆبرا وەکو پارێزەری پادشا تەماشاکرا.[131]

رەمسیسی دووەم، سێیەم پادشای بنەماڵەی نۆزدەیەم بوو، ئەو بنەماڵەیەش پایەتەختەکەی گواستەوە میسری خواروو، ئەگینا لە سەردەمی بنەماڵەی هەژدەیەم پایەتەختەکە شاری پیرۆزی (تیبە)ی میسری سەروو بوو. پادشایانی بنەماڵەکە خۆیان بە خەڵکی میسری خواروو دەزانی، تەنانەت خۆشیان لە رەگەزی (ست)ـەوە هاتبوون وەك چۆن رەمسیسی دووەم بەوە خۆی هەڵدەکێشا کە باپیرانی لە هەمان ڕەگەزی ئەو خودایەوە هاتبوون کە لە میسری خواروو دەپەرسترا.[132] ناوی باوکی رەمسیسیش سیتی بوو، واتە (سەر بە "ست").[133]

ئەمانە دوو ئاماژەی ترن لە پاڵ ئاماژەی ماری پارێزەری فیرعەون:

١-مار کە هێمای میسری خوارووە کە زێدی بنەماڵەی نۆزدەیەمە.

٢-شانازیی رەمسیسی دووەم، باوکیشی هەروا، بە ست، کە لەپێشەوەی بەلەمی رەعە و لە ئەپۆفیس، مارە گەورەکەی هێمای خراپە، دەیپارێزێت.

٣-دارەکەش پەیوەندیی پێوە هەیە، چونکە صولجانی (واس) لە ئەسڵ ئەو دارە بووە کە ماری پێ ڕاودەنراو لە کۆنەوە ناسرابوو، بۆ ژیانی رۆژانە بەکاردەهات و دواتر بووە هێمای دەسەڵاتی خوداوەندی. خوداوەندەکان ژیان و بەهێزی، واس، دەدەنە پادشا، کردارەکە لە (واسی) داڕێژراوە واتە دەڕمێت، بۆیە چەمکی واس پەیوەندیی هەیە بە هێزی پارێزەری دەوڵەتەوە.[134]

---

[131] Ibid.

[132] نوبلكور، رمسيس الثاني، ص ٥٨.

[133] نوبلكور، رمسيس الثاني، ص ٥٧.

[134] كلود ترونكير، الهة مصر القديمة، ص ١١١.

بەم شێوەیە هەڵبژاردنی مارەکە وەك نیشانەی سەرەکیی مووسا، لەخۆڕا نەبووە. ئێمە دەتوانین جگە لە ڕووی تەحەدای فیرعەون، دوو ڕووی تری نیشانەی مارەکە بناسینەوە، ئەویش سەبارەت بە سەرجەم خەڵکەکە:

یەکەمیان: ترس لە مار کە جێگەی ترس بوو، وەك چۆن جێگەی ترسە لە هەموو کۆمەڵگەکاندا. جگە لە خوداوەند ئەپۆفیس کە جێگەی مەترسییە، مارێك لە شانشینی ئاژەڵان هەبوو ئەویش کۆبرای شاخدارە، کە کاتێك لوول دەبوو بۆ ئەوەی خۆی هەڵبدات، دەنگێکی لێوە دەردەچوو وەکو پیتی (ف)و لەوەوە وێنەی ئەو مارە شاخدارە بۆ پیتی (ف) بەکاردەهات، بۆ خۆشی (ڤ) fy ی پیێ دەوترا.[١٣٥]

سوودێکی تری مار لە میسر جگە لە پاراستنی فیرعەون، لە ماری مهن mhn هەیە کە رەع دەپارێزێت.[١٣٦] مهن بەشێوەیەکی بازنەیی لەدەوری رەع لەکاتی گەشتی کاتی شەوی لە جیهانی ژێرەوە، هەروەکو ئەپۆفیسیش کۆنترین باسی مهن لە دەقەکانی سەر تابووتەکانی پادشانشینی ناوەڕاستەوە هەیە.[١٣٧] ماری (رننتوت) کە بەشێوەی کۆبرایەك لاملی کراوەتەوە، جۆرێك بوو لەگەڵ بەپیتیی کێڵگەکان پەیوەست کرابوو، بۆیە خوداوەندی عەمبارەکان بوو. ناوی ئەو مارە سەرەتا لە پادشانشینی کۆندا دەرکەوتبوو، بەڵام لە پادشانشینی نوێ (کە بنەماڵەی نۆزدەیەم سەر بەو سەردەمە بوو) لە هونەر وێنەکرا و لە هەموو میسر پەرسترا و لە (فەییووم) گرنگییەکی تایبەتیی هەبوو.[١٣٨] بەدڵنیاییشەوە مارە بێ ژەهرەکان بۆ ماڵان سوودی هەبوو، چونکە مشك و هاوجۆرەکانی دەخۆن.[١٣٩]

ڕوویەکی تری هەڵبژاردنی مار وەك نیشانە، ئەوەیە میسرییە کۆنەکان بە باشی مارەکانیان دەناسی. لە نووسینی بەردییەك کە لە مۆزەخانەی بڕووکلین

135 Nicole B. Hansen, Snakes, op. cit., pp.296-297.
136 Richard H. Wilkinson, The Complete Gods and.., p.220.
137 Ibid, p.223.
138 Nicole B. Hansen, Snakes, op. cit., p.297.
139 Ibid.

هەڵگیراوە، بریتییە لە دەلیلێکی پزیشکی بۆ چارەسەرکردنی پێوەدانی مار، کە هەرچەندە سەرەتاکەی تێکچووە، بەڵام دیارە کە ٣٧ جۆری مار ناسرابوون. بەلای کەمیشەوە ٣٦ جۆر لەوانە لە میسری ئەمڕۆدا ناسراون.[140]

لێرەوە پەیوەندیی نیشانەی مارەکە بە فیرعەونەوە دوو شتە:

١- ئەو مارەی سەر پۆشاکی سەری فیرعەونەکان وەکو ماری پارێزەر زانراوە. مارەکەی مووسا وەك تەحەدایەکە بۆ فیرعەون کە بتوانێت خۆی لەو مارە بپارێزێت.

٢- فیرعەون کە لە هەمان کاتدا کوڕی (رع)ـەو سەر بە (ست)ـەو مارێکی بۆ هاتووە (مارەکەی مووسا) کە شێوە عئیپ (ئەپۆفیس)ـە، بەڵام ناتوانێت خۆیی لێ بپارێزێت، وەك چۆن ست رەع دەپارێزێت.

لەمەوە پەیوەستیی نێوان نیشانەی مارەکە و فیرعەونەکانی میسر، بەتایبەتی رەمسیسی دووەم، کە لە ستەوە هاتووە، مەنتقی دەبێت.

## دووەم: نیشانەی دەستەکە

مووسا دەست دەخاتە ناو باخەڵیەوە و دەریدەکات و دەبێتە سپی و دەیخاتەوە ناو باخەڵیەوە و رەنگی جارانی بۆ دەگەڕێتەوە. لە قورئاندا دەستەکە بێ زیان دەبێتە سپی: ((من غیر سوء)) و وەك تەفسیر کراوە واتە دەستێکی پاك نەك تووشی گولی (بەرەص) بووبێت. لە تەورات (وەرگێڕانی عەرەبی) وتراوە (برصاء کالثلج-الخروج:٤-٦) واتە وەك بەفر، بەڵام وشەکەی تر واتای ئەوەیە گولە. دواتریش مووسا تەنانەت نیشانەی مارەکەی پیشان دا و دوای ئەوە، ئەمەی لەبەردەمی جادووگەرەکان کرد و دارەکەی مووسا (نووسراوە دارەکەی هاروون

---

[140] Ibid, p.296.

چونكه ئەو فرێی دا) دارەكانی ئەوانی قووت دا (باسی پەتەكانی جادووگەرەكان نەكراوە كە لە قورئاندا لەگەڵ دارەكان باسی كراوە) (خج: ٧/١٠-١٢).

لە (العدد: ١٢) باسێكی ئەو سپێتییە كراوە كە وەكو گولی وایە: دوای ئەوەی مووسا ژنێكی (كوش)یی هێنابوو. هاروون و مەریەمی خوشكی خراپ باسی مووسایان كرد. خوداش هەرسێكیانی كۆكردەوە و دوای سەرزەنشتكردنیان، مەریەم (اذا بها برصاء كالثلج).[١٤١] لە اللاويين ١٣: باسی چەندین جۆری (برص) و

---

[١٤١] جێگەی خۆیەتی بەكورتی ئاماژە بكرێت بۆ (خوشكی هارون) وەك وەسفێكی مەریەمی دایكی مەسیح، كە هەروەها وەكو كچی عیمران ناوبراوەو كراوەتە ڕەخنە كە گوایە موحەممەد لێی تێكچووە و ئەو دوانەی تێكەڵكردووە، ئەگینا مەریەمی دایكی عیسا سەدان ساڵ لە دوای هارون و عیمرانی باوكیەوە هاتبوو:

ئەو جۆرە ڕەخنانە نەك تەنها ڕەخنەی زانستی نین، بەڵكو بیانووی منداڵانەن، چونكە لە قورئان ئاشكرایە لەنێوان هارون و مووسا ماوەیەكی دووردرێژ هەیە، وەك باسی داوود و سولەیمان و ئاماژەكان بۆ كوشتنی پێغەمبەران لەلایەن جوولەكەوە، كە ئاشكرایە هەموویان پێش مەسیحن. لەلایەكی ترەوە وشەی (خوشك) مەرج نییە مەبەست لێی خوشك لە دایك و باوكەوە بێت، بەڵكو بۆی هەیە واتای خزمایەتیی پشتاوپشت بگەیەنێت. لە كتێبێكی نوێ (ساڵی ٢٠١٠) سەبارەت بە ماوەكانی پادشا عیبرییەكان، نووسەرەكە باسەكانی بابەتێكی ساڵی (١٨٩٠)، واتە پێش زیاتر لە سەدەیەك، كە هی مامۆستایەكی تەوراتە، دەهێنێتەوە، كە خاوەنەكەی باس لە كێشەیەك دەكات لە عیمران (عمرام) ی باوكی مووسا و هاروون‌دا هەیە و بۆ چارەسەری كێشە، دوو لێكۆڵەرەوە پێشنیاریان كردووە دوو عمرام هەبووبن، لەدوای موناقەشەكە دەڵێت كە لە تەورات باس لە لەدایكبوون واتایەكی فراوانتری هەیە كە گەڕانەوەی كەسێك بۆ كەسێكی ترە بێئەوەی كە تەنها مەبەست لەوە بووبێت ئەو كەسە یەكسەر كوڕی بێت، ئاماژە بۆ "مامی هاروون" دەكات و دەڵێت كە وشەی مام بە مامی دووریش بەكاردەهێنرێت:

Bruno Kolberg, Redating the Hebrew Kings , 2010, p.268ff.

بەم شێوەیەش دروستە بە مەریەمی دایكی مەسیح بوترێت خوشكی هاروون (نەك كچی هاروون) چونكە مەریەم لە سیبتی یەهوودای برای هاروونە نەك لە سیبتی هاروون بووبێت. شتێكە كراوەتە ڕەخنە لە قورئان لەكاتێكدا ڕەخنەكە دروست دەبوو ئەگەر بیوتایە كچی هاروونە (یا بنت هارون).

چۆنێتیی چارەسەرکردنی لەسەر دەستی هاروونی کاهن یان کوڕەکانی کە ئەوانیش کاهن بوون، کراوە.

هەروەها لە شوێنی تریش.

وشەکە بە عیبری Ṣārá‘ath צָרַעַת، و بەردەوام لە وەرگێڕانی یۆنانی بە λέπρα (lepra)[١٤٢]، کە بە عەرەبی پێی دەوترێت (جذام) هەروەها (برص).

وشەی لێپرا لای ئەبوقرات و کەسانی تر، نەخۆشیی قشری پێستە و ڕەنگە مەبەست لەو وەرگێڕانە بۆ لێپرا، واتایەکی گشتی بێت یان نەخۆشیی زیاتر لەو لێپرایە لە پزیشکیی یۆنانی هەیە[١٤٣]. زۆریش موناقەشەی ئەو وشەیە کراوە[١٤٤] و گومان کراوە واتاکەی نەخۆشیی (جوزام) بێت[١٤٥] و ئەوەی لە (لاویین) باسکراوە ئاماژەیە بۆ چەند نەخۆشییەکی پێست نەك بۆ جوزامی کلاسیکی و نوێ[١٤٦]. بەپێی دکتۆرێکی پسپۆڕ لەو نەخۆشییە، کەمێك کەس باوەڕیان وایە کە وشە عیبرییەکە بە جوزام وەربگێڕدرێت و ئێستا یەکدەنگی هەیە کە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی ئەو نەخۆشییە کاتی کۆیلایەتیی ئیسرائیل بووە.[١٤٧] لێرە هێندە کارمان بەوە هەیە کە پەیوەندیی بە قورئانەوە هەیە، ئەوەش کە یەکێك لەو جۆرە

---

142 C. Creighton, Leprosy, in; Encyclopaedia Biblica, Vol. III, 2763.

143 Ibid.

١٤٤ بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ٢٧٦٣-٢٧٦٨.

١٤٥ بڕوانە نامیلکەیەك لەم بارەوە ساڵی ١٩٦١ بڵاوبووبووە:

R.G. Cochrane, Bibalical Leprosy: A Suggested Interpretation.

کە لەم سایتە بڵاوبۆتەوە:

http://www.biblicalstudies.org.uk/article_leprosy_cochrane.html

146 R.G. Cochrane, Bibalical Leprosy: A Suggested Interpretation, p.14.

147 Ibid, p.15.

نەخۆشییانە بریتییە لە پەڵەی سپی بە لەشەوە: leucoderma یان[١٤٨] vitiligo . ئەو باسەش کە لەگەڵ باسەکەی مووسا لە قورئاندا دەگونجێت هەر ئەو نەخۆشییەیە، چونکە هەرچییەك بێت ئەو نەخۆشییە وەکو نەخۆشی ناوبراوە، لەکاتێکدا قورئان بەپێچەوانەی تەوراتەوە، کە سیفەتی نەخۆشیی لێ لادەبات (من غير سوء)، واتە بووەتە سپی بێئەوەی مەسەلە نەخۆشی بێت، کە ئەمە لەگەڵ کرۆکی موعجیزە دەگونجێت، نەك مووسا دەستێکی نەخۆش پیشانی فیرعەون بدات. ئەمە بە بەدیهە دەزانرێت، بەڵام ئەوەی گرنگترە لایەکی تری موعجیزەکەیە کە ئەم پرسیارەیە: بۆچی ئەو جۆرە موعجیزەیە پیشانی فیرعەون درا؟ چ پەیوەندییەك هەیە لەنێوان ئەوە و موعجیزەی مارەکە؟ دوو موعجیزەکە لە دوو جۆری جیاوازن لە یەك و پێویستە ئەوەی کۆیان بکاتەوە شتێك، یان شتانێك بن پەیوەندییان بە فیرعەونەوە هەبێت.

لە موعجیزەی مارەکەدا زانیمان پەیوەندیی مارەکە، بەڵکو دارەکەش بە فیرعەونەوە چییە، ئەی ئایا پەیوەندیی موعجیزەی دەستەکە بە فیرعەونەوە چییە؟

بەپێی نۆبلکۆر کە یەکێك بوو لەوانەی مۆمیای ڕەمسیسی دووەمیان پشکنی، پادشا نەخۆشیی لیوکۆدێرم Leucoderma واتا سپێتیی پێستی هەبوو![١٤٩] لەوەش زیاتر لەسەری نەڕۆشتووە، بۆیە لێرە بەراوردەکە دەکەین: ڕەمسیسی دووەم ئەو نەخۆشییەی هەبوو، مووسا پیشانی دا چۆن ڕەنگی دەستی دەکاتە سپییەکی تەواو و دوایی وەکو خۆی لێ دەکاتەوە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ

---

[148] C. Creighton, Leprosy, in; Encyclopaedia Biblica, Vol. III, 2765.

[١٤٩] نوبلکور، رمسيس الثاني، ص٥٥. دەقەکە لێرە زۆر ڕوو نییە: ئایا ئەنجامی پشکنینەکە وای دەرخست یان ڕووداوە مێژووییەکان باسیان کردووە، چونکە نۆبلکۆر پێش ئەوە، باسی ڕووداوی مێژوویی دەکات سەبارەت بە تەمەنی ڕەمسیسی دووەم.

خوداوەندێتیی فیرعەون: ئەگەر بەڕاستی خوداوەندی ئەو سپێتییەی لەشت چاك بكەرەوە.

بێگومان گونجاوتر دەبوو ئەگەر سپێتیی دەستی مووسا هی نەخۆشی بێت، بەڵام ئەوەش هەروەها گونجاوە كە لە نەخۆشییەوە دوور بێت، لەو حاڵەتەش بەراوردێك لەنێوان سپێتیی بێخەوشی دەستی مووسا و پێستی نەخۆشی فیرعەون هەیە، وەك چۆن بەراوردێك لەنێوان مارە ڕاستەقینەكەی مووسا لەگەڵ مارەكەی سەر ناوچەوانی تاجی فیرعەون، كە تەنها بەپێی ئەفسانەكان پارێزەری فیرعەونەكانە، هەیە. بەراوردیش لە جۆری تر لە نیشانەكانی تردا هەیە: ئەوەی وەك شت و دیاردەی باش تەماشا دەكرا، بوو بە هۆكاری ناڕەحەتكردن و سزادان.

## سێیەم: كوللـە

باسی كوللە لە هەردوو تەورات و قورئاندا هاتووە. دیسانەوەش پێویستە بپرسین پەیوەندی چییە لەنێوان كوللە و تایبەتمەندییەكانی میسری كۆن؟

كوللە بە میسریی كۆن (سنحم)ـە snHm یان زنحم znHm[١٥٠].

لەمیانەی باسی مووسا و عیبرییەكان و دەرچوون لە میسر، نۆبلكور باسی بەڵای كوللە دەكات، بەڵام رەتیدەكاتەوە كوللە وەك بەڵا بووبێت و دەڵێت: هێرشی كوللە لای میسرییەكان بەسوود بوو، چونكە دژ بە خراپە و شوومێتییە و لە نەخشە سیحرییە پارێزەرەكانی زۆر لە گۆڕستانەكانی پادشانشینی كۆندا دەبینرێت، هەروەها سەربازە ئازاكانی چوار تیپە سەربازییەكەی فیرعەون بە كوللە شوبهێندراون.[١٥١]

---

[150] Raymond O. Faulkner, A Concise Dictionary of Middle Egyptian, p.233.

[١٥١] نوبلكور، رمسيس الثاني، ص٢٣٨.

ئەمە بۆ خۆی چیرۆکەکەی مووسا بەهێز دەکات، چونکە ئەو کوللەیەی کە خراپە لەناو دەبات، خودا بە ژمارەیەکی هێندە زۆر ناردبووی کە خۆی بوو بە خراپە و زیان، هەروەها کوللە کە شوومێتی لەناو دەبات، بووە مایەی شوومی. ئایەتەکەی قورئانیش باسی قەومی فیرعەون دەکات کە مووسا و ئەوانەی لەگەڵی بوون، بە شووم زانی:

فإذا جاءتهم الحسنة قالوا لنا هذه وإن تصبهم سيئة يطيروا بموسى ومن معه ألا إنما طائرهم عند الله ولكن أكثرهم لا يعلمون (الاعراف: ١٣١). بەشیوەیەکی گشتیش پەیوەندیی بە رەمسیسی دووەمەوە هەیە کە ئیدیعاکانی گەورە بوو، بەڵام نەیتوانی بەری پیێ بگرێت.

## چوارەم: بــۆق

دوای حەوت ڕۆژ (دەرچوون ٧/٢٥) نیشانەکەی تر بوو، ئەویش بۆق پڕی ڕووبار و ماڵ و کەلوپەل...ی فیرعەون و میسرییەکانی کرد (٢٦/٧ بەدواوەو ١/٨بەدواوە) لە قورئان تەنها باسی بۆق کراوە و موفەسسیرەکان بە هەمان شێوەی تەورات باسی دەکەن (ئیبنو کەسیر/ الاعراف/ ٤٦٥). لە قورئان ئایەتەکان بە پیتی (و)ی عەتف بەیەکەوە بەستراونەتەوە کە لە زمانی عەرەبی مەرج نییە بۆ تەرتیب بێت، بەڵام لە گێڕانەوەکان تەرتیبەکە بەکارهاتووە کە لەگەڵ تەرتیبەکەی تەورات ناکۆکە.

بۆق یەکێکە لە خوداوەندەکان و وەکو خوداوەند ناوی (حقت)ـەو خوداوەندی بەرهەمهێنانەوە و زیندووبوونەوەیە[١٥٢]. وێنەی سەرەمێکوتەش بۆ ژمارەی سەد

[152] E. A. Wallis Budge, An Egyptian Hieroglyphic Dictionary, Vol. 1, p.514.

هەزار بەکار دێت[١٥٣]، بەڵام هەروەها بۆقەکە یان بۆقەکە و هێمای تر بۆ ئەو ژمارەیە بەکاردێت.[١٥٤] لەمەوە پەیوەندیی نیشانەی بۆق بە میسرییەکانەوە دیارە، کە ئەو ئاژەڵەی هێمای زیادبوون و بەپیتییە، دەبێتە کێشە بۆیان و زیادبوونێکی دەبینن کە مایەی ناڕەحەتی و ئەشکەنجەیە نەك پیت و بەرەکەت، لە هەمان کاتیش وەڵامێکە بۆ ئیدیعا گەورەکانی رەمسیس. ئاماژەیەکی تریش کە پەیوەندیی بە پیت و ژمارەی زۆرەوە هەیە، بریتییە لە ژمارەی زۆری کوڕ و کچە زۆرەکانی رەمسیس کە لە سەد کوڕ و کچ زیاتر بوون.[١٥٥]

## پێنجەم و شەشەم: خوێن و لافاو

دیار نییە ئەو دوو نیشانەیە پەیوەندییان هەبێت بە ڕووباری نیلەوە یان نا، چونکە هەرچەندە لە تەوراتدا باسی ئاوەکە دەکات کە بووەتە خوێن، بەڵام لە قورئان نیشانەکە بێ وردەکاری هاتووە، مەگەر لە تەفسیرەکان. هەر لە تەفسیرەکانیش نیشانەی خوێن وەك لووتپژان هاتووە. سەبارەت بە لافاویش، لە قورئاندا دیسان بێ وردەکاری هاتووە، بەڵام لە تەفسیرەکان بە چەند شتێك

---

[153] Nicole B. Hansen, Amphibians and Reptiles, in; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol.1, p.75; E. A. Wallis Budge, op. cit., p.cxviii.

[154] E. A. Wallis Budge, op. cit., p.480.

[١٥٥] ئەو ژمارە زۆرەی کوڕ و کچەکانی رەمسیس ئەو وێنەیە ڕوون دەکاتەوە کە قورئان بۆ فیرعەونی دەکێشێت: زۆر جار باسی فیرعەون بە تەنیا ناکات، بەڵکو باسی بنەماڵەکەی (ئالەکەی) دەکات: (وإذ نجيناكم من آل فرعون). باسی خنکاندنی ئالەکەشی زۆر لە خنکاندنی خۆی ئاشکراترە (وأغرقنا آل فرعون وأنتم تنظرون)، (وأغرقنا آل فرعون وكل كانوا ظالمين)، (وحاق بآل فرعون سوء العذاب). شتێکی چاوەڕێکراوە فیرعەون شانازیی بە ژمارەی زۆری بنەماڵەکەیەوە کردبێت، ئەویش بەهۆی تایبەتییەکانی خۆهەڵکێشانی و لەبەر ئەوەی ئەوە لەو فەرمانڕەوایانە چاوەڕێکراوە کە حوکمی بنەماڵە پیادە دەکەن.

هاتووه: لافاو به واتا زانراوەکه، بەڵام ئەوان ئەو لافاوەیان گەڕاندەوه بۆ باران. لافاو به واتای تاعوون و لافاو به واتای مردن. هەروەها به واتای بەڵایەك بێئەوەی ناوی بهێنرێت.[١٥٦]

ئێمه لێره وای بۆ دەچین که هەردوو نیشانەکه پەیوەندییان به نیلەوه هەبووبێت و ئەوه پەیوەست دەکەین بۆ خۆهەڵکیشانەکەی رەمسیسی دووەم له میلەکەی (کوببان) که پێشتر باسمان کرد و که ئەمه له میانەی ستایشی میرەکاندا هاتووه: ئەگەر تۆ خۆت به باوکی خوداوەندەکان" (حعپی)ی باوکت بڵێیت با ئاو له چیاوه بێت ئەو بەپێی ئەو قسەیەت کار دەکات[١٥٧]. حعپی خوداوەندی نیلەو بەم شێوەیه رەمسیسی دووەم دەسەڵاتی بەسەر نیلەوه هەبوو، بۆیه گونجاو بوو ئەگەر ئاوی نیل بووبێت به خوێن، هەروەها لافاوەکه ئاوی نیلی گرتبێت. ئەوەی دواییش لەوه نرخی زیاتر وەردەگرێت که کشتوکاڵی میسر به لافاوی نیلەوه بەنده که له وەرزی لافاودا دەبێت و زەوی دادەپۆشێت و له هەمان کات قوڕی بەپیت لەگەڵ خۆی دەهێنێت، بەڵام ئەو لافاوەش سنووری بەسوودی خۆی هەیەو ئەگەر لەو سنووره زیاتر بێت، دەبێته زیان بۆ خەڵك. ئەو بارانەی له سەرچاوەکانی نیل دەبارێت، ئاستی رووبارەکه بەرزدەکاتەوه و سەرەتاکەی له ١٨/١٧ی حوزەیران (له قاهیرەی ئێستا که له میسری سەرووه)و ئاستەکەی بەرەبەره بەرزدەبێتەوه و ڕەنگەکەی بەهۆی لیته بەپیتەکەیەوه دەگۆڕێت و ئەمه تا ٢٦ی ئەیلوول بەردەوام دەبێت، پاشان دادەبەزێت و له سەرەتای کانوونی دووەم دەگەڕێتەوه ئاسته کۆنەکەی و ڕەنگەکەشی وەکو خۆی لێ دێتەوه. کاتی خۆشی جیاوازیی نێوان بەرزیی نزمترین ئاست و بەرزترین ئاستی نیل شتێك له

[١٥٦] بۆ نموونه بڕوانه تەفسیری ئیبنو کەسیر، سورەتی الاعراف.

[157] J. H. Breasted, Ancient Records of Egypt, Vol. III, S289, p.121.

پێنج مەتر زیاتر بوو، نموونەترین بەرزیش سێ مەتر بوو کە نە زیان دەگەیەنێت و نە دەبێتە وشکەساڵی[١٥٨].

## حەوتەم: قوممەل

نیشانەیەکی تری مووسا بریتییە لە (قوممەل). ئێمە لێرە وشەکە وەکو خۆی بەکاردەهێنین، چونکە چەند تەفسیرێکی بۆ کراوە بەشێوەیەك ناتوانین وشەیەکی کوردی بەرامبەر بەو وشەیە هەڵبژێرین.

گێڕانەوەیەك لە ئیبنو عەبباسەوە هەیە کە قوممەل ئەسپێی گەنمە. گێڕانەوەیەکی تر ئەوەیە کوللەی بچووکی بێ باڵە و ئەمە قسەی (موجاهید) و (عیکریمە) و (قەتادە)یە. گێڕانەوەیەکی حەسەنی بەصری و سەعید کوڕی جوبەیر، ئەوەیە قوممەل ئاژەڵێکی ڕەشی بچووکە. بەپێی عەبدولڕەحمان کوڕی زەید کوڕی ئەسلەم (کێچ)ـە، لای تەبەریش ئاژەڵێکی وەك کێچ وایە. هەر تەبەریش دەڵێت کە شارەزایەکی زمانی عەربی لە خەڵکی بەصرە دەیوت قوممەل لای عەرەب (حەمنان)ـە کە تاکەکەی (حەمنانە)یە ئەویش گەنە(قردان)ی بچووکی سەر زبلێ.[١٥٩]



ئەمەی دوایی سەرنجڕاکێشە، چونکە پەیوەستییەك دروست دەکات لەنێوان ئەو نیشانەیە و تایبەتییەکی میسر، بەڵکو هی ڕەمسیسی دووەمیش. وەك

---

[١٥٨] ف. زاماروفسكي، اصحاب الجلالة-الاهرامات، ص١٢٠.

[١٥٩] تفسیر ابن كثیر، الاعراف/ ص٤٦٤. لە تەورات نیشانەکە כִּנִּים (کنیم) کە بە ئینگلیزی بە Lice (کۆی Louse) وەرگێڕدراوە و بە عەرەبی بە (قمل) وەرگێڕدراوە.

وتیشمان پێویستە بۆ ئەو تەفسیرانە بگەڕێین کە نیشانەکە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی فیرعەون و میسر دەگونجێن.

ئەگەر قوممەل بەو ئاژەڵەی پاڵ بە زبڵەوە دەنێت، تەفسیر بکەین، ئەو کاتە خوداوەندی میسری خپری xpri مان بیردەخاتەوە.

خپری (Khepri) xpri شێوەی خوداوەندی خۆرە کە بازنەی خۆر پیشان دەدات کاتێك لە ئاسۆی رۆژهەڵات بەرزدەبێتەوە. خوداوەندی خۆر سێ شێوەی هەبوو: خپری لە بەیانیان، رەع لە نیوەرۆ، ئاتوم لە ئێوارە.[١٦٠]

ناوەکە پێشتر خپرر Khepver (xprr) بوو[١٦١] کە ناوی قالۆنچەی زبڵ بوو،[١٦٢] ئەمەش چونکە پاڵی بە تۆپێك قوڕ یان زبڵ و پیسییەوە دەنا بە ئیحائی بۆ خوداوەند دەکرد بەناو ئاسماندا پاڵ بە بازنەی خۆرەوە دەنێت. مێینەکە هێلکەکانی لە تۆپێکی هاوشێوە دادەنێت و بەچکەکان دەردەچن وەکو

---

[١٦٠] ڕەنگە خپری پەیوەندیی بە وشەی کوردیی (خۆر)ەوە هەبێت، لەبەر واتاکەی و لەفزەکەی. دوو دەنگی (پ)و (و) بە ئاسانی ئاڵوگۆڕ دەبن. بەڵام رەنگە ئەمە نەك ڕاستەوخۆ، بەڵکو لە ڕێگەی وشەی خۆر لە زمانی (خورری): (خاورنی) کە لە زمانی کوردی بەشێوەی (خاوەر) ماوەتەوە. خوررییەکان دەوڵەتی میتانییەکانیان دروستکردبوو کە ماوەیەك لەگەڵ بنەماڵەی هەژدەیەمی میسری لە سووریا لە حاڵەتی شەڕدا بوون. خوررییەکان یەکێکن لەو گەلە کۆنانەی لە کوردستان دەژیان. نزیکەی نیوەی باکووری کوردستانی گەورەی ئەمڕۆ، هەروەها ناوچەی کەرکووك و دەوروبەری خورری نشین بوو.

[١٦١] نووسینی ئەو ناوە بە چەند شێوەیەك بوو، یەکێکیان کە لەنووسینی گۆڕی پیپی یەکەم و نفر کئـ رع سەردەمی (پیپی)ی دووەم، شێوەی تریشی هەیە لە هەمان نووسین، هەروەها شێوەی تر لە نووسینی گۆڕی ئوناس.. بۆ شێوەکانی بڕوانە:

E. A. Wallis Budge, An Egyptian Hieroglyphic Dictionary, Vol. 1, p.543.

[١٦٢] وشەیەکی کوردی بۆ خونفوسای عەرەبی هەیە: گوخلێنکە، کە دیارە لە خلکردنەوەی پیسییەوە هاتووە.

ئەوەیە خۆیان دروست بووبن، بۆیە پێدەچێت ئەمە بناغەی خوداوەندەکە بێت و کە خێپری ئیحائـ بە فرمانەکەی زمانی میسری خپر (Kheper) xpr : "گەشەکردن" یان "هاتنەبوون" بکات،[163] کە هەروەها ئەم واتایانەی هەیە: بوون، ڕوودان، وەرگرتنی شێوەی کەسێك یا شتێك،[164] وەك خودایەکیش کە بەردەوام لەدایك دەبووەوە، خێپری ڕاستەوخۆ بە چەمکی زیندووبوونەوە پەیوەست کرابوو[165]. خوداوەندێکە خۆی خۆی دروست دەکات و ئەزەلییە نەك وەك ئاژەڵانی تر. خێپری خوداوەندێکی یونو (هلیۆپۆلیس) بوو.[166] یەکێکیش لە نازناوەکانی ڕەمسیسی دووەم (پادشای یونو) بوو.

قالۆنچە (خونفوسائی عەرەبی، نەك سیسرك) وەکو مۆر بەکاردەهات کە ناوی خاوەنەکەی و لەقەبەکانی لەگەڵ ئەو خودایانەی یان ئەو پادشایانەی بۆ پاراستنی بەکاردەهاتن، یان تەنها نەقشێکی جوانکاریی لەسەر دەکرا. ئەم بەکارهێنانەش لە سەردەمی ئینتقالیی یەکەمەوە دەستی پێکرد و لە پادشانشینی ناوەڕاستەوە بەدەواوە بە ژمارەیەکی زۆر دروست دەکرا.[167]

قالۆنچە شەعبیترین نوشتەی میسرییەکان بوو، هەرچەندە لەوە ناچێت پەرستشێکی ڕەسمیی فراوانی هەبووبێت، بەڵام بەکارهێنانی وەك هێمایەکی بەتوانای دروستبوون و زیندووبوونەوە، وای کرد لە کەلتووری میسری، خودایەك بێت لە هەموو شوێنێك هەبێت.[168]

دیارە لەبەر ئەوەی ئەو ئاژەڵە ئاماژە بوو بۆ دروست بوون، دەبینین لە هیرۆگلیفی بۆ نووسینی چوار شێوەکەی خوداوەند (تا–تنن) هێمای ئاژەڵەکە

---

[163] Richard H. Wilkinson, The Complete Gods and.., p.230.
[164] E. A. Wallis Budge, op. cit., p.542.
[165] Richard H. Wilkinson, ibid.
[166] د. محمد عبدالقادر محمد، اثار الاقصر، الجزء الاول، ص١٣٥.
[167] Richard H. Wilkinson, op. cit., p.232.
[168] Richard H. Wilkinson, op. cit., p.233.

بەکارهاتووە، بۆ یەکەمیان یەك دانە (لەگەڵ هێمای تر)، دووەمیان دوو دانە (هەروەها لەگەڵ هێمای تر)... تاد.[١٦٩].

تا–تنن (کە ناوەکەی چەند شێوەیەکی تری هەیە) واتە زەویی بەرز، چونکە خودای بەرزاییە سەرەتاییەکە، بوو ئەو بەرزاییەی کە لە ئاوەوە دەرکەوت. خوداوەندێکی مەمفیس (من نفر) بوو و پێدەچێت لە کاتی پادشانشینی کۆنەوە هەبووبێت. تاتنن لە سەردەمی رەمسیسەکانەوە لەگەڵ پتاح پەیوەست کرا، پتاح–تاتنن. خوداوەندێکی جیهانەکەی تر بوو و پارێزەی پادشا مردووەکە بوو.[١٧٠] باسیشمان کرد کە پێدەچێت دوای ئەو بوومەلەرزەیەی زیانی بە ئەشکەوتی (محا) گەیاند، رەمسیسی دووەم چووبێتە ژێر سەرپەرشتیی پتاح–تاتنن.

لە کتێبی (ئم دوات)، واتە "ئەوەی لەو جیهانە"، کە دەقێکی جەنائیزیی تایبەتە بە گۆڕی فیرعەونەکان و باسی گەشتی خۆر لە ئاوابوونەوە بەرەو هەڵهاتن دەکات و کە فیرعەونە مردووەکەش بە هەمان گەشت دەڕوات، خێر یەکێکە لە نۆ رۆحەکە (نۆ مارن ئاگر لە دەمیان دەردەکەن)[١٧١] کە رەع، بەو پێیەش هەروا فیرعەونە مردووەکە، دەپارێزن. لەناو رۆحەکانی تریش: تاتنن، ئۆزیریس، شو (خودای هەوا)... تاد، ئەو دەقە هی پادشانشینی نوێیە. ئەمەش ئەگەر باسی نیشانەکەی مووسا بکەین، ئاماژەیەکی ترە.

---

[١٦٩] بۆ ئەو هێمایانە بڕوانە فەرهەنگە هیرۆگلیفییەکەی والیس بەج:

E. A. Wallis Budge, op. cit., p.542.

[170] Richard H. Wilkinson, op. cit., p.130.

[171] E. A. Wallis Budge, The Book of Am-Tuat, p.136

خپرر بەم شێوە نووسینە یەکێکە لە ٧٥ شێوەکەی ڕەعە، هەروەها بە نووسینی خپری شێوەیەکی ترە[١٧٢]، دەشزانین سێتیی یەکەم باوکی ڕەمسیسی دووەم بوو، ناوی (رع)یش بەشێکە لە دوو ناو لە پێنج جۆر ناوەکەی ڕەمسیس (کە وەك پادشایانی تر پێنج جۆر ناوی هەبوو کە ناوی سەرەکین) ئەویش ناوی لەدایکبوون، واتە ناوی شەخسی: (رع مس سو)و ناوی چوونە سەر تەخت: وسرمئعت رع–ستپ ن رع (دادپەروەی یان ڕاستیی ڕەع بەهێزە– هەڵبژاردەی ڕەع).

شایەنی تێبینییە کە ئەو هەروەها ئاماژەیە بۆ لیتەی ڕووباری نیل، واتە پەیوەندیی بەپیتی بوو.[١٧٣] ئەو ئاماژەیە پەیوەندیی بە لافاوەکەوە هەیە . بینیشمان کە دوان لە نیشانەکانی مووسا پەیوەندییان بە نیلەوە هەیە: لافاو و خوێن.

مەبەستی ئەو نیشانەیەی مووسا ئەوەیە ئەو خوداوەندەی کە نیشانەی ژیانەوەی خۆر بوو، دەبێتە مایەی ئازار و زیانێکی زۆر و بەو جۆرە نییە کە لێیان دەڕوانی. هەروەها چونکە ئەو ئاژەڵە لەسەر دەستی مووسا دروست بوو، ئەوە بەدرۆخرایەوە کە خپری خۆی خۆی دروست دەکات.

پێشتر باسی میلەکەی (کوببان)مان کرد و کە یەکێك لە ستایشەکانی ڕەمسیس لەلایەن میرەکانەوە لەو میلە، ئەوەیە کە ڕەمسیس: ((خپرییە لە شێوە ڕاستەقینەکەی)). وەسفکردنی پادشایەك بە خپری، هێندەی بزانین، نەگەیشتووەتە ئەو ڕاددەیە، بڕوانە نووسینێکی تحوتمسی چوارەمی بنەماڵەی

---

[172] E. A. Wallis Budge, An Egyptian Hieroglyphic Dictionary, Vol. 1, p.543.
[173] Richard H. Wilkinson, The Complete Gods and.., p.130.

**هەژدەیەم کە خۆی وەکو ((میراتگری نایابی خپری)) وەسف دەکات، نەك خودی خپری.[١٧٤] رەمسیسی دووەم لە نووسینێکی تریدا خۆی وەکو ئاغا لە شێوەی خیپری وەسف دەکات.[١٧٥]**

**نیشانەی قوممەل بەم جۆرە دژ بە خودی رەمسیسی دووەم بوو.**

---

[174] J. H. Breasted, Ancient Records of Egypt, vol. II, S812, p.322.
ئاماژەی تر بۆ خپری هی فیرعەونی تر: ژنی تحوتمسی سێیەم (بڕگەی ٣١٤، ل١٣٠)، ئامنحوتپی سێیەم (بڕگەی ٩٠٧ ل٣٧٠)... تاد.

[175] J. H. Breasted, Ancient Records of Egypt, vol. III, S411, p.181.

# ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بڕیاردان لەسەر مەسەلەیەکی مێژوویی کە لە قورئاندا هاتووە، کارێکە پێویستی بە وردبوونەوەی زۆرە، وردبوونەوەکەش پێویستە زۆرتر بێت سەبارەت بە کتێبە ئاسمانییەکانی تر کە گومان لە دەستکاریکردنیان نییە. بەڵگەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەش ئەو بۆچوونە بەهێز دەکەن کە فیرعەونەکەی مووسا یەك فیرعەون بووە و بریتی بووە لە رەمسیسی دووەم، بەڵام بێئەوەی بتوانرێت ئەوە بە بڕیارێکی یەقینی بزانرێت. هەروەها لێکۆڵینەوەکە دەریخستووە کە دەکرێت هەندێك لایەنی چیرۆکەکە بە شێوەیەکی تر تەماشا بکرێن و پێویستە باوەڕە باوەکان بە تەسلیمبوونەوە وەرنەگیرێن، چونکە هەندێکیان قسەی موفەسسیرەکانە کە سەردەمی ئەوان زانیاریی مێژوویی سەبارەت بە میسری کۆنی بەخۆیەوە نەبینیبوو و هەندێکی تریان بۆچوونن کە هێندە دووبارە بوونەتەوە وەکو ڕاستییان لێ هاتووە. لێکۆڵینەوەکەش ئەوەی دەرخست کە ڕێکی هەیە لەنێوان نیشانەکانی مووسا و تایبەتمەندییەکانی میسری کۆن و فیرعەون، بەشێکیان ڕێکن لەگەڵ خودی رەمسیسی دووەم. ئەنجامێکی گشتیی لێکۆڵینەوەکەش ئەوەیە ڕەخنەگرتن لە قورئان تا چ ڕادەیەك لە ئاستێکی سادەیە و گیرۆدەی بڕیاری بەپەلەیە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە سەرەتاییە و بەپێی کاتی گونجاو بۆ ئەم کۆنگرەیە، ئامادەکراوە، بەهیوای فراوانکردنی بە هێنانەوەی بەڵگەی زیاتر و خستنەڕووی موناقەشەی زۆرتر و باسکردنی ئەو کەس و ڕووداو و شوێنانەی بوار نەبووە لێرە باس بکرێن.

# سەرچاوەکان

– كريستيان ديروش–نوبلكور، رمسيس الثاني، فرعون المعجزات، ترجمة فاطمة عبدالله محمود، المجلس الاعلى للثقافة، المشروع القومي للترجمة، الطبعة الاولى، ٢٠٠٥. ناوە ئەسڵییەکە:

Ramses II: La Véritable Histoire, 1996

–دونالد ريدفورد، مصر وكنعان واسرائيل في العصور القديمة، ترجمة بيومي قنديل، المجلس الاعلى للثقافة، المشروع القومي للترجمة، القاهرة، ٢٠٠٤ (ئەسڵەکە ١٩٩٢).

–كلود ترونكير، الهة مصر القديمة، ترجمة حسن نصر الدين، المشروع القومي للترجمة، القاهرة، ٢٠٠٤ (ئەسڵەکە ١٩٩٩).

–د. رمضان عبدة علي، رؤى جديدة في تاريخ مصر القديمة منذ اقدم العصور حتى نهاية عصر الاسرات الوطنية، الجزء الرابع، وزارة الثقافة المجلس ا لاعلي للاثار، ٢٠٠٨.

–جيمس بيكي، الاثار المصرية في وادي النيل، الجزء الخامس، ترجمة نورالدين الزراري، ١٩٩٤.

–ف.زاماروفسكي، اصحاب الجلالة–الاهرامات، ترجمة د.هاشم حمادي، دمشق، ١٩٩٩.

–د. محمد عبدالقادر محمد، اثار الاقصر، الجزء الاول معابد امون، الهيئة المصريةالعامة للكتاب، ١٩٨٢.

–د. راشد البدراوي، موسى و هارون (عليهما السلام)، من هو فرعون موسى؟، قصص الانبياء ، ج٤، ١٩٩٨.

–نيقولا جريمال، تاريخ مصر القديمة، ت. ماهر جويجاتي، دار الفكر، ط٢، القاهرة، ١٩٩٣ (ئەسڵەکە: ١٩٨٨).

–ابن منظور، لسان العرب المجلد السادس، دار المعارف.

-الحافظ ابن كثير، ابو الفداء اسماعيل بن عمر بن كثير (ت ٧٧٤ هـ)، تفسير القران العظيم، تحقيق سامي بن محمد السلامة، دار طيبة، الطبعة الثانية ١٤٢٠-١٩٩٩ (تفسير ابن كثير).

-تفسير الطبري، الجزء ٢٣، مع هامش تفسير غرائب القران ورغائب الفرقان لنظام الدين القمي النيسابوري الطبعة الاولى، ١٣٢٩ هجرية، المطبعة الكبرى الاميرية، القاهرة.

- Breasted, James H., Ancient Records of Egypt, Historical Documents, From The Earliest Times To The Persian Conquest, Volume III, The Nineteenth Dynasty, Chicago, 1906.

- Breasted, James H., Ancient Records of Egypt, Historical Documents, From The Earliest Times To The Persian Conquest, Volume II, The eighteenth Dynasty, Chicago, 1906.

- Bard, Kathryn A. (editor), Encyclopedia of the archaeology of ancient Egypt, 2005 (1st ed. 1999).

Brand, Peter J., Usurped Cartouches of Merenptah at Karnak and Luxor, in; Causing His Name to Live: Studies in Egyptian Epigraphy and History in Memory of William J. Murnane, Culture and History of the Ancient Near East, Vol. 37, Leiden, 2009.

-Bruno Kolberg, Redating the Hebrew Kings , 2010.

- Cheyne, T. K., Sutherland Black, J. (editors), Encyclopaedia Biblica, A Critical Dictionary of The Literary

Political And Religious History The Archeology Geography And Natural History of The Bible, Vol. III, Toronto, 1902.

-Collier , Mark, Manley, Bill, How to Read Egyptian Hieroglyphs - A Step-By-Step Guide to Teach Yourself, British Museum Press, 1998.

- Constable, Thomas L., Notes on Exodus, 2010 .

- Faulkner, Raymond O., A Concise Dictionary of Middle Egyptian, Griffith Institute Ashmolean Museum, Oxford, 1961, reprinted, 1991.

- Gardiner, Alan, Egyptian Grammar, Being an Introduction to the Study of Hieroglyphs, Third edition, revised 1957, reprinted 2007, Griffith Institute, Oxford.

-Kitchen , Kenneth A., Pharaoh Ramesses II and His Times, in; Civilizations of the Ancient Near East (Ed. by Jack M. Sasson), New York, 1995, vol. 2.

- Kitchen , Kenneth A., Ancient Orient and Old Testament. London: Inter-Varsity Press, 1966.

- Knight, Shawn C., Egyptian Writing Systems and Grammar, 2009.(http://www.andrew.cmu.edu/course/98-030/writing.pdf )

- Miller, James M., John Haralson Hayes , A History of Ancient Israel and Judah, Westminster John Knox Press, 1986.

- Petrovich, Douglas, Amenhotep II And The Historicity of the Exodus-Pharaoh, The Master's Seminary Journal, 17/1 (Spring 2006) pp.81-110.

- Pritchard, James B., Ancient Near Eastern Texts relating to the Old Testament (ANET), 1950, 3rd ed. 1969.

-Ranke, Hermann, Die Ägyptischen Personennamen, B.1, 1935.

- Redford, Donald B., (editor in chief). Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, Vols. (1-3) Oxford University Press, 2001.

- Remler, Pat, Egyptian Mythology A to Z, 3rd Edition, 2010, Chelsea House, New York.

- Sethe, Kurt, Urkunden der 18. Dynastie, B.3, Leipzig, 1907.

- Sethe, Kurt, Urkunden der 18. Dynastie, B.4, Leipzig, 1909.

- Spencer, A. J., Brick Architecture in Ancient Egypt Aris & Phillips, Warminster, 1979.

- Wallis Budge, E. A., An Egyptian Hieroglyphic Dictionary, Vols. 1-2, London , 1920.

- Wallis Budge, E. A., The Book of Am-Tuat, London, , Vol.1, 1905.

- Wilkinson, Richard H., The Complete Gods and Goddesses of Ancient Egypt, Thames & Hudson, 2003.

# اشارات القران الى رمسيس الثاني باعتباره فرعون موسى

# دراسة اولية

**فاضل قَرَداغي**

منذ كشف اسرار الكتابة الهيروغليفية واماطة اللثام عن اسرار التاريخ الفرعوني، الذي اثار اشكالات كبيرة في رواية التوراة للاحداث المتعلقة بتاريخ مصر، كُتب الكثير عن تواجد بني اسرائيل في مصر وكان الموضوع الذي اثير اكثر من غيره هو حادثة الخروج وما يتعلق بها. وكان تعيين الفرعون الذي تذكره التوراة هو الموضوع المفضل لدى كثير من دارسي العهد القديم وقسم من المتخصصين بالتاريخ الفرعوني. وبحسب المعطيات التاريخية ومقارنتها بما ورد في العهد القديم ظهر اكثر من مرشح محتمل ليكون فرعون التوراة، وبالطبع مع عدم اغفال حقيقة ان العهد القديم ذكر اثنين من الملوك كمعاصرين لموسى؛ سمّى الباحثون اولهما بفرعون الاضطهاد والاخر بفرعون الخروج. وقد تباينت الاراء حول الفرعونين وكان المرشح الاوفر حظا لفرعون الاضطهاد هو رمسيس الثاني، مما يعني بالتالي ان ابنه وخليفته مرنبتاح كان فرعون الخروج.

هذه الدراسة، مثل دراسات اخرى في هذا المجال، ترجح رمسيس الثاني كفرعون الاضطهاد والخروج معا وتسوق عددا من الدلائل التي تنقسم الى قسمين: المجوعة الاولى وردت في كل من العهد القديم والقران والمجموعة الثانية ذكرها القران حصرا. وتتطرق الدراسة الى معجزات موسى وتفسيرها بما يتوافق مع مصر القديمة ومع فراعنة مصر وبالاخص رمسيس الثاني. فقسم من تلك المعجزات تتعلق بتاليه رمسيس الثاني لنفسه (الطوفان والدم والقمل) اضافة الى تلميحاتها الواضحة الى الدين والحياة اليومية في مصر عموما، اضافة الى ماذكره القران صراحة حول تاليه فرعون لنفسه، ومن تلك المعجزات مايتوافق مع خصائص رمسيس الثاني الجسمية (معجزة اليد) حيث الاشارة

الى مرض بياض البشرة عند رمسيس او سيرته مثل المبالغة التي لا نظير لها في التاريخ المصري في مدح نفسه وتاليهه لنفسه. اما المعجزة الاكبر، وهي معجزة العصا التي تتحول الى حية فهي تتوافق مع رمز الحية في تاج الفراعنة (وئجت) التي كانت ترمز الى مصر السفلى حيث موطن اسرة رمسيس وعاصمته وكان القسم الشمالي من العاصمة خاص بها واعتبرت حامية الفراعنة فكانت حية موسى التي لن يستطيع الفرعون ان يحمي نفسه منها اشارة بليغة لعجزه. واضافة الى تلك الحية كان هناك الثعبان ابوفيس (عئبب) عدو اله الشمس والذي يعترض مركبه فيقوم (ست) بالدفاع عنه، اما ست فكان اله الاسرة التي ينتمي اليها رمسيس وكان يفخر به، فكانت هذه اشارة لرمسيس بانه لن يقدر ان يلعب دور ست في مواجهة ثعبان موسى.

ومن الامور التي ذكرت في القران وتوافق رمسيس الثاني وصف (فرعون ذي الاوتاد) حيث فسرت الاوتاد حديثا وقديما بالابنية العديدة و حديثا بالاعمدة وبالمسلات واضيف اليها في هذا البحث عمود الـ(جد) الذي كان يقام في اعياد (سد) من السنة الثلاثين فما بعد وكان يرمز لاستقرار الحكم وقد اقام رمسيس الثاني بسبب من مدة حكمه الطويل اكبر عدد من الاعياد اي كانت له المناسبات الاكثر عددا لاقامة العمود. ومن الامور الخاصة به ما ذكرته الاية (وجعلناهم ائمة يدعون الى النار) واشار الباحث الى الذكرى التي تركها الفرعون الى بعد ما يقرب من الف سنة ووجود عبادة له في مصر القديمة، اضافة الى بقاء ذكرى احد ابنائه، فضلا عن تسعة فراعنة في السلالة التالية تسموا باسم رمسيس، اولهم (رمسيس الثالث) الذي لم يتكف بالاعجاب برمسيس الثاني والتسمي باسمه بل وسمى ابناءه باسم ابناء رمسيس الثاني.

ويذكر البحث ان اوصاف عاصمة رمسيس (بي–رمسيس) او (بر–رمسيس) توافق ما جاء في القران من ايات حول ذكر الانهار التي تجري تحت فرعون وحول تركهم للجنات والعيون وايضا عن تدمير الله لما كان يصنع فرعون وقومه ((وماكانوا يعرشون)). ويتطرق البحث الى مسالة هامان وامر فرعون ببناء صرح من طين مفخور وان البناء بالطابوق النئ كان معروفا ومستعملا اما الطابوق المفخور فكان معروفا منذ

القدم، اما طلب فرعون فتكرر في القران بصيغة القول ولعل ذلك كان سخرية وجدلا ولم يتم اصلا بناء الصرح.

ومن المواضيع التي يثيرها البحث قضية غرق فرعون التي لاتتوافق مع ما جرى من فحص لمومياء رمسيس الثاني الذي دل على عدم غرقه حيث يطرح الباحث امكان ان غرق فرعون لم يتبعه موته وذلك من عدة منطلقات يمكن اضافتها الى قضية فحص المومياء واستبعاد غرقه وايضا بسبب استبعاد كونه قادر على مطاردة بني اسرائيل بسبب امراض واعراض الشيخوخة الحادة عنده، فمن ذلك اية (فاليوم ننجيك ببدنك) والسر في استخدام حرف الباء، وان ذكر غرق فرعون بشخصه صراحة لم يرد الا في اية واحدة هذا ان كان يعني ذلك موته، ومقارنة كلمة (مليم) التي وردت في القران في قصة فرعون بورودها في قصة يونس الذي قذف بنفسه في البحر لكنه لم يغرق حتى التقمه الحوت وان تفسيرها بـ (ملام) يبدو متكلفا من الناحيتين اللغوية والمنطقية. ولذلك فالباحث يرجح كون فرعون قد امضي المدة الاخيرة من حياته فاقدا للوعي، وهو الامر الذي يذكره التاريخ ويرجعه الباحثون الى الشيخوخة، وبقى في حالته تلك حتى وفاته وربما كان هذا ابلغ في الاعتبار.

وكان لزاما في مقدمة البحث التطرق الى منهج التعامل مع القصص القراني بما يجنب الباحثين من الزلل الناتج عن التسرع في ابداء الاراء رغبة في اثبات اعجاز القران، ولذا فان ما طرح في البحث والتزاما بذلك المنهج ورغم وضوح ومنطقية الادلة واستنادها الى معطيات تاريخية انما طرح كاراء قابلة للمناقشة لا دلائل اعجاز مفروغ من صحتها.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی



دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکری و رۆشنبیری و ژیاری بۆ ئوممەی ئیسلامی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر، لەوانەش:

- بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

- هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

- ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە ڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستیی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری




سەنتەرێکی کوردستانیی ناحکومیی ناسیاسییە، گرنگی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان، بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان. سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزری. لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان، دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بووژاندنەوەی بیر و هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمییانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

- سەنتەر کار دەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵیی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکانەوە بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

- بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمییانەوە.

- خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

- هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.